بسم الله الرحمن الرحيم

# هۆکاری ڕێپێدانی
# کاره تاوانکارییه‌کان

# هۆكاری ڕێپێدانی کاره تاوانکارییه‌کان

نووسینی

**دکتۆر مصطفی زه‌ڵمی**

وه‌رگێڕانی

سه‌ردار ڕه‌زا

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# أسباب اباحة الأعمال الجرمية

# هۆکاری ڕێپێدانی کارە تاوانکارییەکان

نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێڕانی : سەردار ڕەزا
پێداچوونەوەی : توفیق کەریم
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠,٠٠٠ دینار



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٤٤ ) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

﴿ ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ وَٱلۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾

سورة البقرة/١٩٤

**(من قُتل دون ماله فهو شهيد، ومن قُتل دون أهله فهو شهيد، ومن قُتل دون دينه فهو شهيد، ومن قُتل دون دمه فهو شهيد)**

أخرجه أبو داود والنسائي والترمذي وصححه، وأحمد ، وسنده صحيح

**((الضرورات تجيز المحظورات))**

القاعدة العامة

# ناوەرۆك

# پێشەکی

سوپاس‌و ستایش بۆ ئەوخوای پەروەردگارەی کە فەرموویەتی (وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ)[1].

درودو ڕەحمەتی خوا داكاتە سەر ئەو پێغەمبەرە بانگخوازە بۆ ڕێی ئیسلام كە فەرموویەتی: (ئەگەر یەكێك لە ئێوە كارێكی خراپ‌و نابەجێی بینی با بەدەست بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی بەدەست بیگۆڕێ با بەزمان بیگۆڕێ ئەگەر ئەوەشی نەتوانی ئەوا با بەدڵ پێی ناخۆش بێ ئەوەش لاوازترین باوەڕە).

هەروەها درودو ڕەحمەتی خوا داكاتە سەر ئاڵ‌و ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی كە چاكترینی نەوەبوون كە هاتونەتە سەرزەوی فەرمان دەكەن بەچاكەو ڕێگریی خراپە دەكەن.

## هۆكارە پێویستیەكان و پلانی لێكۆڵینەوەكە

### أ - هۆكارەكانی پێویستبون

ئەو هۆكارانەی پاڵیان پێوەنام بۆ هەڵبژاردنی بابەتی (هۆكارەكانی ڕێپێدانی تاوانكاریەكان) لەشەریعەت‌و یاسادا زۆرن، بە كورتی هەندێكیان باس دەكەین كە ئەمانەن:

[1] سورة البقرة/٢٥١

یەکەم: گرنگی بابەتەکە: ئەم بابەتە لە هەردوو لایەنی (زارەکیو کرداری)یەوە گرنگی زۆری هەیە. لەلایەنی (زارەکی)یەوە، هەموو ئەوکەسانە سوودی لێ دەبینن کە مامەڵە لەگەڵ دەقەکانی یاسادانانو لێك دانەوەی ماناکاندا دەکەن، هەروەها ئەو کەسانەش کە بەوانە دەڵێنەوەو دەیخوێنن.

لەلایەنی کرداریشەوە هاوکاری دادوەر دەکات لە هەڵبژاردنی بڕیارەکانی داو لە پشکنینو گەڕانی دا بۆ جێبەجێکردنی دادپەروەری. هەروەها بەسوودە بۆ دەستەڵاتی جێ بەجێ کردن تا تاوانکار چاك بکات لە ڕێگای جێبەجێ کردنێکی گونجاوەوە کە دووربێت لە گیانی تۆڵە سەندنەوەو هەڵچوونەوە.

دووهەم: نەبوونی سەرچاوە لە کتێبخانەکاندا ئەوەندەی من ئاگادارم– لەو کتێبە دانراوانەی کە لێکۆڵینەوەی لەسەر هەموو ئەو بەشانە لەخۆگرتبێت کە توانای ئەوەی هەبێت لەژێر تێگەیشتنی ئەو ناونیشانەدا ڕیزبەند بکرێن.

سێهەم: هەوڵدان بۆ لابردنی ئەو تێکەڵ بوونەی هەیە لەنێوانی هەندێ لەو زاراوەو دەستەواژانەدا کە پەیوەندیان بە بابەتەکەوە هەیە.

چوارهەم: خستنە ڕووی ئەو پێوەرە ڕوونو ئاشکرایانەی کە جیاوازی دەکات لەنێوانی هۆکارەکانی ڕێپێدانو ڕێگرییەکانی لێپرسراوێتی سزادانو ڕێگرییەکانی سزا.

پێنجەم: سڕینەوەی گومان لەنێوانی تێگەیشتنی بەرگری شەرعی گشتی دەرەکیو لەنێوان تێگەشتنی ترساندنو تۆقاندن لەسەدەی نوێ دا.

شەشەم: لێکۆڵینەوە لە بەرگری شەرعی گشتی ناوخۆییو دەرەکی، سەرەڕای بەرگری شەرعی تایبەتی ناوخۆیی کە یاساکانی سزادان تەنها ئەوەیان دەگرێتەوە.

حەوتەم: چارەسەری حوکمەکانی هەندێ لە تازەداهاتووە دۆزراوەکانی ئەم سەردەمە لە هەردوو جیهانی پزیشکی تازەو تەکنەلۆجیای سەردەمدا.

هەشتەم: سەلماندنی ئەوەی کە بەرگری کردن لە مافەکانو وەستان لە دژی تاوانکاری، ئەرکی سەرشانی هەموو ئادەمیزادێکە کە تواناو دەستەڵاتی هەبێت بەسەریا.

نۆهەم: دەرخستنی ئەوەی کە ئیسلام لە بنەڕەتدا بریتییە لە ئاشتی، لەبەر ئەوەی لێوەی وەرگیراوە، بەکارهێنانی توندوتیژی هەلاویرەو بەکار دەهێنرێت بۆ لابردنی شەڕ بەر لە ڕوودانی داو نەهێشتنی لەدوای ڕوودانی.

دەهەم: چارەسەرکردنی کاروباری تر بەڕێگا تازەکان.

**ب- پلانی لێکۆڵینەوەی بابەتەکە:**

سروشتی بابەتەکەو پەیبردن بەڕەهەندەکانی وادەخوازن کە لێکۆڵینەوەکە دابەش بکرێت بۆ دوانزە بەش:

بەشی یەکەم: هۆکارەکانی ڕێپێدان‌و ڕێگرییەکان.

بەشی دووەم: کردە تاوانکاریەکان لە شەریعەتی ئیسلامدا.

بەشی سێیەم: بەرگری شەرعی تایبەتی.

بەشی چوارەم: بەرگری شەرعی گشتی ناوخۆیی (الحسبة).

بەشی پێنجەم: بەرگری شەرعی گشتی دەرەکی لە تەرازووی شەرع‌و قانون دا.

بەشی شەشەم: بەکارهێنانی ماف.

بەشی حەوتەم: بەجێ هێنانی ئەرك.

بەشی هەشتەم: بواری ڕەوایی کارە پزیشکی یەکان.

بەشی نۆیەم: منالّ لەباربردن لەنێوان قەدەغەکردن‌و ڕێپێدان دا.

بەشی دەیەم: پیتاندنی دەستکرد و سنووردانان بۆ مندالّ بوون.

بەشی یانزەیەم: لەبەرگرتنەوەو مامەڵەکردن لەگەڵ (جین)ی مرۆیی.

بەشی دوانزەیەم: چەند نمونەیەك لە هۆکارەکانی ڕێپێدان.

# بەشی یەکەم

## هۆکارەکانی ڕێپێدان و ڕێگرییەکان

لێکۆلینەوەی ئەو بابەتە دابەش دەبێت بۆ سێ باس:

باسی یەکەم: تایبەت دەکرێت بە ڕێپێدان و دەستەواژە پەیوەندیدارەکانی.

باسی دووەم: بۆ ڕێگرییەکانی لێپرسراوێتی تاوانکاری.

باسی سێیەم: بۆ ڕێگرییەکانی سزادان.

# جێباسی یەكەم:
# پێناسەی (ڕێپێدان) و
# دەستەواژە پەیوەندیدارەكانی

هۆكار (السبب) لەزمانەوانیدا: بەچەند مانایەك هاتووە لەوانە: بیانو(الذريعة)، (ڕێگا)، یان ئەوەی بەهۆیەوە دەگەیت بە غەیری خۆی[1].

لەدەستەواژەی شەرعیدا: باسێكی ئاشكرای ڕێكخراوە، كە بەهۆیەوە دانەری شەرع حوكمێك دەدات، بەبوونی دێتە دیو بە نەبوونی نایەتە دی.[2] وەكو خزمایەتی كراوەتە هۆ بۆ میراتگری، بەرگری شەرعی كراوەتە هۆ بۆ ڕێپێدانی كردەیەكی تاوانكاری كە بەهۆیەوە دەستدرێژییەك بۆ سەر ژیان یان ناموس یاخود ماڵو سامان لادەبات.

ڕێپێدان (الإباحة): لەزمانی عەرەبیدا سەرچاوەی (أباح)ەیە، بەچەند مانایەك هاتووە لەوانە: ئاشكراكردنی نهێنی، دەوترێت أباح السر واتە: نهێنییەكەی ئاشكرا كرد، یان: ڕێگەدان (الإجازة)، وەك (أباح الشيء) واتە: ڕێی پێدا.

ڕێپێدەر (الإباحي): ئەو كەسەی ڕێ بەخۆی و كەسانی تر دەدا، بۆ كردنی كارێكی قەدەغەكراو و وازهێنان لە كارێكێكی فەرمانپێكراو. (احلال) حەڵاڵ كردن لەوەوە هاتووە، دەوترێت (أبحتك الشيء) واتە: شتەكەم بۆت حەڵاڵ كرد، المباح=حەڵاڵكراو پێچەوانەی المحظور=قەدەغەكراوە.[3]

---

[1] الصحاح في اللغة والعلوم، مختار الصحاح للرازي مادة السبب.

[2] جمع الجوامع لابن السبكي ٩٢/١.

[3] لسان العرب فصل الباء حرف الحاء ٣/٢٣٩

له‌ده‌سته‌واژه‌ی زاراوه‌ی زانایانی شه‌ریعه‌تدا: مۆڵه‌ت دان به‌كردنی كارێك به‌پێی ویستی بكه‌ر له‌سنووری مۆڵه‌ته‌كه‌دا.[1]

له‌ده‌سته‌واژه‌ی زانایانی (أصول الفقه)دا: بریتیه له‌و مه‌به‌ستو ئاراسته‌ی وته‌ی خوای په‌روه‌ردگار كه په‌یوه‌ندی هه‌یه به كرداری به‌نده‌كانیه‌وه به ئاره‌زوومه‌ندانه[2] وه‌كو ڕێپێدانی شته سوود به‌خشه‌كان له‌م فه‌رمووده‌ی خوای په‌روه‌ردگاردا (كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ)[3] واته: له خواردنه به‌تامه‌كانی ڕزقی خوا بخۆن.

له‌زاراوه‌ی فقهی جینائی (تاوانكاریدا) پێناسه‌ی زۆری هه‌یه، هه‌موویان له‌ده‌وری یه‌ك مانادا ده‌سوڕێنه‌وه، كه بریتی یه له داڕنینی كرداری تاوانكاری له سیفه‌ته تاوانكارییه‌كه‌ی، به هۆیه‌كه‌وه كه یاسا بڕیاری له‌سه‌ر ده‌دات.[4]

له گرنگترینی هۆكاره‌كانی ڕێپێدان (الإباحة) له‌یاسادا: به‌رگری شه‌رعی، به‌جێ هێنانی ئه‌رك، به‌كارهێنانی ماف.

له هۆكاره‌كانی ڕێپێدان له شه‌ریعه‌تی ئیسلامیدا: ئه‌و هۆكارانه‌ی باس كران، هه‌روه‌ها زۆر لێ كردن (الاكراه)و ناچاری یه‌كان له مافه‌كانی خوای په‌روه‌ردگاردا، وه‌كو خواردنه‌وه‌ی سه‌رخۆشكه‌ر له‌بارودۆخی تینوێتی زۆرداو نه‌بوونی ئاو، و وتنی وته‌یه‌كی كوفر له‌ژێر پاڵه‌په‌ستۆیه‌كی زۆره‌ملێی ناچاریكه‌ردا، به‌ڵام له‌مافه‌كانی خه‌ڵكیدا زۆره‌ملێ كردنو ناچاربوون ته‌نها له ڕێگرییه‌كانی لێپرسراوێتی تاوانكاریه.

## ڕێپێدان و زاراوه په‌یوه‌ندیداره‌كانی:

هه‌ندێك زاراوه‌ی یاسایی‌و فیقهی هه‌ن په‌یوه‌ندییان هه‌یه به (الإباحة= ڕێپێدان)ه‌وه، به‌ڵام یه‌كسان نین به ڕێپێدان، گرنگترینیان ئه‌مانه‌ن:

---

[1] التعريفات للجرجاني ل٤.

[2] اصول الفقه في نسيجه الجديد للمؤلف ل٢٢٠.

[3] سووره‌تی به‌قه‌ره /٥٧.

[4] الدكتور محمد مصطفى القللي في المسؤولية الجنائية ل٢٣٨.

**یەكەم: ڕێپێدان بە مانای (التخیر= سەرپشككردن):**

ڕێپێدان(اباحة) لە زانستی بنەماكانی فقهدا یەكسانە بە سەرپشككردن لەنێوان دووشتو زیاتردا، بەڵام ڕێپێدان(الإباحة) لە یاسای جینائی دا بریتی یە لە دارنینی كردار لە سیفەتە تاوانكاریەكەی بەهۆی پاساوێكی یاسایی یەوە، هەروەكو لەبەرگری شەرعیدا هەیە.

ڕێژە لەنێوان ئەو دوو زاراوەیە گشتیو تایبەتی یە، پێكەوە كۆدەبنەوەو لەیەكتریش جیادەبنەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- لەبارودۆخی بەرگریكردن لە سامان پێكەوە كۆدەبنەوە، سەبارەت بە بەرگریكار ناچاری نابێت، لەبەر ئەوەی ڕێپێدانەكە لەو بارودۆخەدا بەپێی ویستی بەرگریكار دیاریی دەكرێت، ئەگەر بیەوێت بەرگری لێ دەكات، ئەگەر بیشیەوێت چاوی لێ دەپۆشێ.

٢- ڕێپێدانەكە بەبێ سەرپشككردن بەدی دێت ئەگەر بە واجب دانرا، چونكە لەگەڵ دروستو مەندوب و واجبیش دێتەدی، هەروەك لەبارودۆخی بەرگری كردن لە دین یاخود لە ناموس یاخود لە ژیان، ئەگەر یەكێك لەمانە دەستدرێژیان كرایە سەر، ئەوا لەسەر هەموو كەسێكی بەتوانا پێویستە بە هۆكارێكی گونجاو دەستدرێژیەكە لابەرێت.

سەرپشككردن بەبێ ڕێپێدان بەدی دێت بەمانای تاوانكاریەكەی، ئەگەر ئەوەی تیایدا سەرپشككراوە لە بنەڕەتدا بە تاوان دانەنرابێت، هەروەك لە سەرپشككردن بەمانای ئوسولیەكەی لە ئایەتی پیرۆزی (كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ)دا هاتووە[1].

شایەنی باسە ڕێژە لەنێوانی دەستەواژەكان دا بەرەهایی لە رووی تێگەیشتنو هاتنەدی یەوە چوارن، كە ئەمانەن:

١- یەكسانی: بەوەی كە زاراوەكان هاومانا بن لە لایەنی تێگەیشتنو هاتنەدییەوە،

---

[1] سوورەتی بەقەرە /٥٧.

وەكـو گرێبەسـتی وەسـتێنراوو گرێبەسـتی جێبـەجێ نـەبوو، تێگەیشـتنی هـەردوكیان ئەوەیـە كـە گرێبەسـتەكە دروسـتە، بـەڵام شـوێنەواری لەسـەر ڕێكناخرێت (مافەكانو پابەندبوونـەكان)، مەگـەر لـەدوای مۆڵـەت وەرگـرتن لـە خاوەن مافی ئەو مۆڵەتە، هەر كاتێ گرێبەستی وەستێنراو بەدیهات، گرێبەستی جێبـەجێ نـەبووش بەدیـدێت. بەپێچەوانەشـەوە هەروایـە، وەكـو گرێبەسـتی فرۆشتن ئەگەر یەكێ لە دوو لایەنی گرێبەستەكە نەشیاو(نـاقص الاهلیـة) بـوو، ئـەوا شـوێنەوارەكەی لەسـەر مۆڵەتـدانی وەلی(سەرپەرشـتیار)ەكەی، یـاخود مۆڵەتدانی خۆی دەوەستێت، ئەگەر لەدوای گرێبەستەكە بووە شـیاوی تـەواو، وەكو ئەوەی نەخۆشێكی سـەرجێگەی مـردن زیـاتر لەسـێ یـەكی میراتیەكـەی ببەخشێت، جا دروستیی لەسێیەكەكە زیاتر دەوەستێتە سـەر مۆڵـەت پێدانی میراتگرە پێگەیشتووە عاقڵەكان لەدوای مردنی میرات لێوەرگیراوەكەیان[1].

٢- جیاوازیی: جیاوازیی لەنێوان دوو زاراوەكـەدا ئەوەیـە كـە یـەكێكیان لـە هـەموو ئەوانەدا ناگرێتەوە كە ئەوی تر دەیگرێتەوە، وەكو گرێبەستی بەتاڵو گرێبەستی دروست، لەلایەنی تێگەیشتنەوە جیاوازن، لەبەر ئەوەی گرێبەستی بەتاڵ ئەوەیە كـە یـەكێك لـە كۆڵەكـەكانی یـاخود مـەرجێك لـە مەرجـەكانی گرێبەسـتەكەی تیانەیەتەدی، گرێبەستی ڕاسـتیش ئەوەیـە كـە هـەموو كۆڵەكـە و مەرجـەكانی گرێبەستەكەی تێدابێت، نابێ گرێبەستێكی دیـاریكراو لەیـەك كـاتی دیـاریكراودا پێكەوە بەتاڵو دروستیش بێت.

٣- گشتیو تایبەتیی ڕەها ڕێژەی نێـوان دوو دەسـتەواژەیە، یـەكێكیان بـەڕەهایی گشتیتر دەبێت، واتە لەگەڵ ئەوی تردا كۆدەبێتەوەو لێی جیا دەبێتەوە، ئەوی تریشیان بـەڕەهایی تایبـەتر دەبێـت، بەشێوەیەك بـەبێ ئـەو نایەتـەدی وەكـو گرێبەستو هەڵسوكەوتی یاسایی، جا هەموو گرێبەستێك هەڵسوكەوتی یاسـایی

[1] خەڵكی ڕانەهاتوون بە مۆڵەت دان لەكاتی ژیانی میرات بەجێ هێڵەكە بۆ دووركەوتنـەوە بـۆ زۆر لێ كردنی ئەدەبی.

یە، بەوەش ئەو دەبێتە تایبەت تر، لەبەر ئەوەی بەبێ ئەو نایەتە جێ، بەڵام لەوانەیە هەڵسوكەوتی یاسایی بەبێ گرێبەست بێتە جێ لە هەڵسوكەوتێكی یاسایی دا كە بەویستی تاكە كەسییە، وەكو وەقفو وەسیەت كردنو بێجگە لەوانەش لە بەخشینەكان، بەوە ئەوە بەرەهایی دەبێتە گشتیتر.

٤- گشتیو تایبەتی لە ڕوویەكەوە، واتە هەریەكەیان لەڕوویەكەوە گشتی یەو لەڕوویەكی ترەوە تایبەتە، كاتێ لەگەڵ ئەوی تردا كۆدەبێتەوە تایبەتە، كاتێكیش كە لێی جیا دەبێتەوە دەبێتە گشتی، وەكو ڕێپێدانو سەرپشككردن لەبارودۆخی یەكەم دا كە پێشتر باسی كرا، هەروەها وەكو سامانو مافی كەسی كە لەو قەرزەدا پێكەوە كۆدەبنەوە كە لەئەستۆی كەسی تردابێت، سامانەكە بەبێ مافی كەسی دێتە جێ، لەمافی شتەكە خۆیدا وەكو خاوەنداریتی، هەروەها وەكو مافی كەسی بەبێ سامان دێتە جێ وەك چێژ وەرگرتنی هەریەكە لە ژنو مێرد لە یەكتری.

**دووهەم: ڕێپێدان و لێنەپرسینەوە (لابردنی لێپرسراویتی تاوانكاریی)**

لێنەپرسینەوە: واتە لابردنی لێپرسراوێتی تاوانكاریی لەسەر ئادەمیزاد ئەگەر تاوانێكی ئەنجامدا لەبارودۆخی بوونی بیانوویەكدا كە بەربەست بێ لە لێپرسراوێتی تاوانكاری، وەكو نابالغیو شێتیو خەوتنو زۆرەملێو لەبیرچوونەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (رُفِعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ)[1]. واتە لێپرسینەوە(لێپرسراوێتی تاوانكاری) لەسەر ئادەمیزاد هەڵگیراوە ئەگەر بەهۆی هەڵەوە یاخود بەهۆی لەبیرچوونەوەوە تاوانێكی ئەنجامدا, یاخود ئەگەر ئەنجامدانی تاوانەكەی لەژێر پاڵەپەستۆیەكی زۆرەملێ كردن دابوو، ئەو وەكو تاوانكارێك لێی ناپرسرێتەوە، لەبەر نەبوونی مەبەستی تاوانكاری، كە مەبەستەكە

[1] سنن ابن ماجه، بەرگی یەك، لاپەڕە٦٥٩- ژمارە٢٠٤٣و سنن البیهقی الكبری، بەرگی شەش، لاپەڕە/٨٤- ژمارە ١١٢٣٦و موراد الظمان، بەرگی یەك لاپەڕە٢٦٠- ژمارە ١٤٩٧.

توخمێكی سه‌ره‌كی یه له سێ توخمه‌كه‌ی تـاوان، ئـه‌وانیش پایـه‌ی مـادی‌و پایـه‌ی شه‌رعی[1] و پایه‌ی مه‌عنه‌وی یه.

پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ عَنْ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنْ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَفِيق وَعَنْ الصَّغِيرِ حَتَّى يبلغ أو يَحْتَلِمَ).[2]

واته: (قه‌ڵه‌م له‌سه‌ر سێ جـۆر كـه‌س هـه‌ڵگیراوه، له‌سـه‌ر خـه‌وتوو هـه‌تا له‌خـه‌و هه‌ڵده‌ستێ، له‌سه‌ر شێت هه‌تا چاك ده‌بێته‌وه، له‌سـه‌ر منـاڵ هـه‌تا پـێ ده‌گـا (بـالغ ده‌بێت).

مه‌به‌ست له قه‌ڵه‌م لێره‌دا لێپرسراوێتی تاوانكاری یه، به‌ڵام له هه‌ریـه‌كێك له‌وانـه‌دا له‌بواری (مه‌ده‌نی)دا داوای قه‌ره‌بووی لێده‌كرێت ئه‌گه‌ر زیانی به‌كه‌سانی تر گه‌یاندبوو، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی مه‌به‌سـتی تاوانكـاریی لـه لێپرسـراوێتی كه‌مته‌رخـه‌می شارسـتانێتی دا داواكراو نیه، كه توخمه‌كانی ئه‌ویش سیانن، كه ئه‌مانه‌ن: (كاری نادروست + زیان + په‌یوه‌ندی هۆكاریی، واته له‌نێوان كاره‌كه‌و زیانه‌كه‌دا، به‌وه‌ی كه دووه‌م له ئـه‌نجامی یه‌كه‌مه‌وه هاتبێته دی).

به‌وپێیه ڕێژه‌ی نێوان ڕێپێدان‌و لێنه‌پرسینه‌وه گشتی‌و تایبه‌تی ڕه‌هایـه له‌لایـه‌نی هاتنه‌دیه‌وه، ئه‌گه‌ر ڕێپێدان هاته‌دی ئه‌وا لێنه‌پرسینه‌وه دێته دی، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئـه‌و كه‌ســه‌ی كـارێكی ڕێپێـدراوی ئـه‌نجام داوه، نـه لـه‌بواری تاوانكاریـداو نـه لـه‌بواری شارستانیدا لێی ناپرسرێته‌وه، به‌ڵام لێنه‌پرسینه‌وه به‌بێ ڕێپێدان دێته دی، وه‌كو لـه خواردنی سامانی كه‌ساندا به‌بێ مۆڵه‌تدانی له‌بارودۆخی ناچاریدا، كه پێویسته له‌سه‌ر

---

[1] كۆڵه‌كه‌كانی تاوان كردن له شه‌ریعه‌ت‌و یاسادا سیانن، ئه‌مانه‌ن:

أ– كۆڵه‌كه‌ی مادی بریتیه له كاری جێبه‌جێ كردنی تاوانه‌كه.

ب–كۆڵه‌كه‌ی شه‌رعی بریتیه له‌بوونی ده‌قێكی شه‌رعی یاخود قانونی كـه ئه‌نجامـدانی كـرده‌وه تاوان كاریه‌كه‌ی قه‌ده‌غه (حرام) كردبێت له پێش ئه‌نجامدانی به‌پێی ڕێسای (نه تاوان كاری هه‌یه نه سزادان ئه‌گه‌ر ده‌قێك نه‌بێ له باره‌یه‌وه).

ت–كۆڵه‌كه‌ی مه‌عنه‌وی بریتیه له مه‌به‌ستی تاوان كاره‌كه.

[2] سنن البيهقي الكبرى ٦/٨٤ موارد الظمأن لاپه‌ڕه ٣٦٠.

بخۆرەکە قەرەبوو بداتە خاوەنی شتە خوراوەکە ئەگەر دلوای لیّ کرد، ڕێژەی نێوانیان گشتی‌و تایبەتی ڕەهایە.

ڕێپێدان بەڕەهایی تایبەت ترە، هەرکاتیّ هاتە دی ئەوا لێنەپرسینەوە دێتە دی، بەلاّم لە پێچەوانەی گشتی دا نابێت، جا هەموو هۆکارێك لە هۆکارەکانی ڕێپێدان بەڕەهایی تایبەت ترە لە هەموو بەربەستەکانی لێپرسراوێتی تاوانکاری، هەروەکو لەمەولا دێت، لەبەر ئەوەی هۆکاری ڕێپێدان هەردوو لێپرسراوێتی تاوانکاری‌و مەدەنی لادەبات، لەبەر ئەوەی کارەکەی لە سیفەتە تاوانکاریەکەی دارنیوەو گۆڕیویەتی بۆ ڕێپێدان، بۆ نمونە: ئەو کەسەی ماڵی کەسێکی تر لەناو دەبات بۆ بەرگری کردن لەخۆی، لەوکاتەی ئەو کەسەی تر دەستدرێژی دەکاتە سەری، لە بواری تاوانکاریەوە لێی ناپرسرێتەوە و سزا نادرێت، لەبواری شارستانیشەوە لێی ناپرسرێتەوەو قەرەبوونی نییە، لەبەر ئەوەی لەناوبردنەکە بە دەستدرێژیی خاوەنەکەی بۆتە ڕێپێدراو، مادام ئەو دەستدرێژیکردنە لاناچێت مەگەر بەلەناوبردنی ئەو ماڵە نەبێت.

**سێیەم: ڕێپێدان و هۆکارەکان**

داخستن‌و کردنەوەی هۆکارەکان لەسەرچاوە دۆزەرەوەکانی بۆ بڕیارە فقهییەکانە لە شەریعەتی ئیسلامی دا، (الذريعة) لە زمانی عەرەبی دا: ئامرازە بەڕەهایی.

لە زاراوەشدا: حوکمی ئامانج بدرێت بە هۆکارەکەی لە ڕەوایی‌و ناڕەوایی، ئامانجی هەموو هۆکارێکیش ئەنجام و مەبەستەکەیەتی.

هەر ڕووداوێك کە ئادەمیزاد ئەنجامی دەدات، بە ئارەزوومەندانەو هۆشیاری‌و مەبەستەوە، چوار هۆکاری هەیە:

هۆکاری بکەر، هۆکاری مادی، هۆکاری ڕواڵەتی، هۆکاری ئامانجی.

بۆ نمونە: ئەو کورسیەی دارتاش لە تەختە دروستی دەکات، دارتاشەکە هۆکارە بکەرەکەیە، تەختەکە هۆکارە مادیەکەیە، ڕواڵەتی کورسیەکە لە پاش تەواوبوونی هۆکاری ڕواڵەتیەکەیەتی، دانیشتنیش لەسەری هۆکارە ئامانجیەکەیەتی.

هۆكاری بكەر بۆ بڕیارە شەرعیەكان دەستەڵاتی یاسادانانی خواییە، وشەكانی دەقە شەرعیەكانیش هۆكارە مادییەكانن، ڕێكخستنیان ئامانجی ڕواڵەتییە، ئامانجیش بەرژەوەندی ئادەمیزادییە لە سوودی هێنراو و زیانی دوورخراوە.

هەروەها هۆكاری بكەر بۆ حوكمە یاساییەكان بریتیە لە دەسەڵاتی یاسادانانی دانراوی سەردەم، هۆكارە مادیەكەشی وشەكانی دەقەكانە، هۆكارە ڕواڵەتیەكەش ڕێكخستن و پێكەوەنانی دەقەكانە، هۆكاری ئامانجییش ڕێكخستنی ژیانی ئەو كۆمەڵگەیەیە كە ملكەچی ئەو بڕیارانەن.

ئەو ئەگەرانەی كە بیریان لێ دەكرێتەوە بۆ هۆكارەكانو ئامانجەكان لە بواری ڕێپێدانو ڕێپێنەدان چوارن) كە ئەمانەن:

١- هەریەك كە هۆكارو ئامانجەكەی ڕەوابێت، وەكو پێدانی خەڵات بۆ خوێندكارە یەكەمەكان بۆ ئەوەی هانیان بدەنْ بۆ پێشبڕكێ لەسەركەوتنی زانستی دا.

٢- هەردوكیان ناڕەوا بن، وەكو ڕێككەوتنی تاوانكاری لەنێوانی دوو كەسو زیاتردا لەسەر ئەنجامدانی تاوان.

٣- هۆكارەكە ڕەوابێو ئامانجەكە ناڕەوابێ، وەكو ئەوەی پیاوێك سامانێك ببەخشێتە ئافرەتێك بەمەبەستی دروستكردنی پەیوەندییەكی ناڕەوا لەگەڵی دا، جا بەخشینەكە هەرچەندە لەخۆی دا ڕەوایە، بەڵام دەبێتە ناڕەولو پوچەڵ لەبەر ئەوەی ئەنجامەكەی ناڕەوایە.

٤- هۆكارەكە لەخۆیدا ڕەوا نیە، بەڵام لە ئامانجەكەیدا ڕەوایە، وەكو سزادانی جەستەیيو دارایی، كە لەخۆی دا ناڕەوایە لەبەر ئەوەی زیان بە تاوانكار و خێزانەكەیو كۆمەڵگەكەی دەگەیەنێت، بەڵام لە ئامانجەكەیدا ڕەوایە، كە بریتیە لە پاراستنی گیان و سامانو ناموسو ئارامیو ئاسایشو سەقامگیریی خەڵكی، لەبەر ئەوە شەریعەتە ئاسمانییەكان و یاسا دانراوەكان بڕیاریان لەسەرداوە.

**چوارەم: ڕێپێدان و دروستی**

ڕێپێدانی بنەڕەتیو دروستیی شەرعی بنەڕەتی، لە هەموو شتێكی سوودبەخش دا دێنەدی، ئەوەش بەپێی ڕێسای گشتی (بنەڕەت لە شتە سوودبەخشەكان دا ڕێپێدانە)، وەكو ڕاوی ماسیو مەل و گیاندارە كێوییەكانو داركردن لە دارستانەكانداو سوود وەرگرتن لەبەردەكان لە شاخەكان داو سوود وەرگرتن لە ئاوی ڕوبارو دەریاكان، ئەمانە هەموو ڕەوان، ئەگەر بەڵگەیەك نەبێ لەسەر پێچەوانەكەی، ڕێپێدانی بنەڕەتیش جیاوازە لەخاوەنداری هاوبەش(شیوعیە)، لەبەرئەوەی خاوەنداری هاوبەش لەسەر ملكداری وەستاوە، ڕێپێدانی بنەڕەتیش بەر لە بەخاوەن كردنی داراییە ڕێگەپێدراوەكانە، بە خاوەندارێتییەكی گشتی بۆ دەوڵەت یاخود تایبەت بۆ تاكەكان.

لەبەر ئەوە هەر دروستێكی بنەڕەتی (واتە بەبێ بەهانە)، ڕێگە پێدراوەو لە بكەرەكەی ناپرسرێتەوە، نە لەڕووی سزادانو نە لەڕووی مەدەنیەوە. هەركەسێك بیرێك هەڵبكەنێ لەباخەكەیدا یاخود لە بێستانەكەیدا، سامانو دارایی كەسێكی تری تێ كەوتو فەوتا، ئەوا بیرهەڵكەنەكە لێپرسراو نیە لەو تیاچوونە، نەبەیاسای سزادانو نەبەیاسای مەدەنی، ئەوەش بەپێی ڕێسای شەرعیو قانونی، واتە: دروستی شەرعی بنەڕەتی گەرەنتی نایگرێتەوە،[1] بە پێچەوانەی دروستی شەرعی هەڵاوێردراو بە بەهانە، كە گرنتی دەیگرێتەوە، بۆیە بە یاسای مەدەنی داوای قەرەبوو لە بكەرەكە دەكرێت، بەڵام لەبەر بوونی بەهانەیەك بەیاسای سزادان لێی ناپرسرێتەوە. بۆ نمونە: ئەگەر كەسێكماڵو سامانی كەسێكی خوارد بەبێ مۆڵەتی ئەو كەسە لەژێر فشاری بارودۆخێكی ناچاریو پێویستی دا، ئەوا لەو ناچاریەدا بۆی دروستە بۆ ڕزگاركردنی ژیانی، بەڵام داراییەكە بۆی نابێتە ڕێپێدراو، ئەو بیانووە نابێتە هۆی بواردنی لە لێپرسراوێتی قەرەبووكردنەوە، ئەگەر خاوەن داراییەكە داوای لێ كردەوە، لەسەری

---

[1] مجلة الأحكام العدلية المادة/٩١.

پێویسته پێی بداته‌وه، ئه‌وه‌ش به‌پێی ڕێسای (ناچاری مافی خه‌ڵكی پوچه‌ڵ ناكاته‌وه)[1]، چونكه دروستیه‌كه مۆڵه‌تێك بوو له‌سه‌ر بناغه‌ی به‌هانه‌یه‌كو، خواردنه‌كه نه‌گۆڕا بۆ ڕێپێدراو به‌هۆی پێویستیه‌كه‌وه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له ڕێگریه‌كانی لێپرسراوێتی سزادانه‌و له هۆكاره‌كانی ڕێپێدان نیه.

به‌پێی ئه‌و لێكۆڵینه‌وه‌یه، ڕێسای (ناچاری یه‌كان ڕێگه به قه‌ده‌غه‌كراوه‌كان ده‌دات)[2] پێویسته بگۆڕێت به ڕێسای (ناچاری یه‌كان شیاوی ده‌ده‌ن به قه‌ده‌غه‌كراوه‌كان) له‌به‌ر ئه‌وه‌ی (الجواز= شیاوی) به‌ره‌هایی گشتیتره له ڕێپێدان، جا هه‌موو ڕێپێدراوێك شیاوه‌و هه‌موو شیاوێك ڕێپێدراو نیه وه‌كو باسمان كرد.

---

[1] مجلة الأحكام العدلية المادة/ ٣٣.

[2] مجلة الأحكام العدلية المادة /٢١.

# جێباسی دووەم:
# بەربەستەکانی لێپرسراوێتی سزادان

بەربەست وەسفێکی ئاشکرای رێکخراوی بابەتییە[1] ناهێڵێت حوکم لەسەر هۆکارەکەی دابمەزرێ.[2]

بەربەستەکان یان کارە تاوانکاریەکە لە سیفەتە تاوانکاریەکەی دادەڕنێو دەبێتە یەکێك لە هۆکارەکانی ڕێپێدان، یاخود کارەکە پارێزگاریی لە سیفەتە تاوانکاریەکەی دەکات سەرەڕای بوونی بەربەستەکان، جا دەبێتە بەربەستی لێپرسراوێتی سزادان، ئەوەش بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

بەربەستەکانی لێپرسراوێتی سزادان لە سروشتی خۆیدا سێ بەشە، لەبەر ئەوەی یان کەسیی خۆنەویستی یە، وەکو شێتیو منالّی، یاخود کەسیی خۆویستی یە، وەکو سەرخۆشی، یاخود دەرەکیەکی کاریگەرە لەسەر ویست بەبێ زانین، وەکو زۆرکردنو ناچاری. لەبەر ئەوە بەربەستەکانی لێپرسراوێتی سزادان دابەش دەبێ بەسەر سێ جێ مەبەست دا.

---

[1] واتە بە جیاوازی کاتو شوێنو کەسەکان ناگۆڕێت، وەکو شێتی، ئەوە بەربەستە لە دروستی رەفتاری شێت لە کێشە شارستانێتی داو بەربەستە لە لێپرسراوێتی تاوان کاری لە بابەتەکانی سزادان دا.

[2] بەپێی رێسای (ئەگەر بەربەستو پێویستی کۆبوونەوە بەربەستەکە پێشدەخرێت) جا فرۆشتن هۆکاری پێویستە بۆ مافەکانو پابەند بوونەکان. ئەگەر لایەنێکی گرێ بەستەکە شێت بوو ئەوا ئەو شوێنەوارە لەسەر فرۆشتن دانامەزرێ لەبەر ئەوەی پوچەڵە، تاوان هۆکارە بۆ لێپرسینەوەی سزادانی، ئەگەر بکەرەکە شێت بوو ئەوا شێتییەکە بەربەستە لە لێپرسینەوەی لەرووی سزادانیەکەوە.

# جیٚ مه‌به‌ستی یه‌كه‌م:
# به‌ربه‌سته كه‌سیه خۆنه‌ویسته‌كان

ئه‌ویش دوو جۆره: خۆیی وه‌ك (بچوكی)و دوچاربوون(عرضی) وه‌ك (شێتی)

## جۆری یه‌كه‌م: بچوكی و كاریگه‌ری له لێپرسراویتی سزادان.

به‌ڵگه نه‌ویسته، كه ئاده‌میزاد له‌دوای له‌دایك بوونی به‌سیٚ قۆناغدا تێپه‌ڕ ده‌بێت:

١- قۆناغی پێش هه‌راشی، ساڵی هه‌راشیش له یاساداناني عێراقیدا له بابه‌ته مه‌ده‌نیه‌كاندا ته‌واوكردنی ته‌مه‌نی حه‌وت ساڵی یه[1] له بابه‌ته‌كانی سزادانیش دا ته‌واوكردنی ته‌مه‌نی نۆ ساڵی یه[2]، به‌ڵام له شه‌ریعه‌تی ئیسلامیدا پێوانه‌ی هه‌راشی بریتی یه له عه‌قلٚ له كێشه‌كانی سزادان‌و مه‌ده‌نیدا.

ڕه‌فتاركردنی مه‌ده‌نی بۆ ئه‌وكه‌سه‌ی هه‌راش نه‌بێت به‌تاڵه، جا باوانی ڕێگه‌ی پیٚ بده‌ن یاخود نا، كاره ناشه‌رعی یه‌كانیشی ئه‌گه‌ر مه‌ده‌نی بوون، پێویسته له سامانه‌كه‌ی قه‌ره‌بوو بكرێته‌وه، ئه‌گه‌ر له بواری سزادانیشدا بوون، ئه‌وا له بواری سزادان دا لێی ناپرسرێته‌وه. له‌و قۆناغه‌ی دا ته‌مه‌نی منداڵی به‌ربه‌سته له لێپرسینه‌وه‌و سزادانی منداڵه‌كه له بواری سزادان‌دا، به‌ڵام له بواری مه‌ده‌نیدا لێپرسینه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌كرێت، ئه‌گه‌ر ماڵ‌و دارایی خه‌ڵكی فه‌وتاند ئه‌وا پێویسته

---

[1] المدنی العراقي رقم/٤٠ لسنة ١٩٥١ المادة/٢/٩٧ (سن التمييز سبع سنوات كامله).

[2] ماده‌ی/٤٧ یاسای چاودێری نه‌وجه‌واناني عێراقی ژماره/٧٦ لاپه‌ره/١٩٨٢ (به‌رزكردنه‌وه‌ی دلوای سزادان ناكرێت له‌سه‌ر كه‌سێك كه له‌كاتی ئه‌نجامدانی تاوانه‌كه‌دا ته‌مه‌نی نۆساڵی ته‌واو نه‌كردبێت) یاسای سزادان به‌بیٚ جیاوازی له‌نێوانی كێشه مه‌ده‌نیه‌كان‌و كێشه سزادانه‌كان ئه‌و ته‌مه‌نه‌ی دیاری كردووه، ئه‌مه له‌یاسای سزادانی مه‌غریبی ماده‌ی/١٢٨به ١٢/ساڵ‌و لیبی ماده‌ی/٨ به/١٤ساڵ‌و ئه‌رده‌نی ماده‌ی/٩٤و كوێتی ماده‌ی/١٨ به/٧ساڵ.

لە دارایی یەکەی قەرەبوو بدرێتو، ئەگەر کەسێکی کوشت، برییەکەی(الدية) لەسەر باوکو کەسە بەرپرسەکانیەتی.

٢- قۆناغی هەراشی لە چوونە ناو هەشت ساڵی لە بواری مەدەنیدا و دەساڵی لە بواری سزاداندا دەست پێدەکات تا تەواوکردنی هەژدە ساڵی، جا ڕەفتارە زیاندارەکانی کە تەواو زیاندار بێت، وەکو بەخشینەکان، بەرەهایی بەتاڵە، جا باوانی ڕێی پێ بدەن یاخود نا. ڕەفتارە سوودبەخشەکانیشی کە تەواو بەسوودە، بەرەهایی دروستە، ئەگەر باوان ڕێی پێ بدەن یاخود نا، وەکو وەرگرتنی بەخشینەکان، بەڵام ئەو ڕەفتارانەی لەنێوانی سوودو زیان دا دەسوڕێتەوە، وەکو گۆڕینەوە، لەسەر ڕێپێدانی سەرپەرشتیاری وەستاوە.

هەروا فەوتاندنی ماڵی خەڵکی، پێویستە لە سامانەکەی قەرەبوو بکرێتەوە، لە کردە تاوانکاریەکانی بواری سزادانیش دا لێ ی دەپرسرێتەوەو بە سزا سوکەڵەکان سزادەدرێت بەپێی دووریو نزیکی لە تەمەنی باڵغبوون و پێگەیشتنی، ئەو سزادانانەش زیاتر چاکسازین نەك سزاو تۆڵەسەندن بن. لە قۆناغی شیاوی تەواودا لەسەر بواری سزادان، ئەگەر تاوانێکی ئەنجام دا، بەتەواوی لێی دەپرسرێتەوە، ئەگەر بەربەستێك لەبەربەستەکانی سزادان نەبێت، وەك شێتی، و ساڵی پێگەیشتن لە یاسای عێراقی دا کە کاریگەرە بە مەزهەبی ئەبو حەنیفەو پێشەوا مالیك، تەواوکردنی تەمەنی هەژدە ساڵی یە[1].

## جۆری دوهەم: شێتی و شوێنەواری لە لێپرسراویتی سزادان دا.

شێتی نەخۆشیەکە توشی دەماغ دەبێتو بەبێ ئەوەی لاوازی لە ئەندامەکانی جەستەدا هەبێت, وای لێدەکات ئەو کارانە ئەنجام دەدات کە پێچەوانەی کاری عەقڵن.

[1] المادة/١٠٦ من المدني العراقي القائم.

شێتی یان بنەڕەتیە، وەكو ئەوەی كەسێك بەشێتی لە دایكبوبێت و گەورە بووبێت، بەهۆی كەموكوڕیەكەوە كە تیایدا دروست بووە، ئەو جۆرەش هیوای چاك بوونەوەی لێ ناكرێو لەسەری لاناچێ، یاخود كتوپڕە(لەناكاوە) ئادەمیزاد دوای پێگەشتن توشی دەبێت بە هۆكارێكی خۆیی یاخود دەرەكی، ئەوەش لە رووی كاریگەریەوە، یان شێتی تەواوە، نەخۆش بەهۆیەوە توانای زانینو جیاكردنەوەی نامینێ لە هەموو شتێكداو لە هەموو بارودۆخەكان دا، یاخود شێتیەكی ناتەواوە، كاریگەریی لەلایەنێكی دیاریكراودا دەبێتو لە بێجگە لەو لایەنە خاوەن توانای عەقڵیە. لەڕووی بەردەوامییەوە یان بەتەواویە، واتە شێتێكی بەردەوامە، یاخود لێكپچڕاوە، كە جارجارە چاك دەبێتو جارجاریش وای لێدێتەوە.

لەڕووی هاودەمی لەگەڵ تاوانەكە، یا پێشی تاوانكردنەكە كەوتووە، ئەوەش بەربەست نیە، ئەگەر لەپێش تاوان كردنەكەدا شێتیەكەی نەمابێ، یاخود دوای تاوان كردنەكە شێت بوبێت، ئەوە دەبێتە بەربەست لەبەردەم بەردەوامبوونی ڕێكارە دادوەریەكانو سزادانەكان، واتە شێتی یەكە دەبێتە بەربەست لە سزادان ئەگەر هەتا مردن بەردەوام بوو، ئەگەر لە پێش مردنی دا شێتیەكەی نەما، ئەوا بەربەست نیە لە لێپرسراوێتی سزاداناو ڕێكارەكان لەدژ بەردەوام دەبێت و لە خاڵی وەستاندنەوە دەست پێ دەكاتەوە.

ئەگەر شێتیەكە هاودەم بێت، بەوەی ئەوكەسەی تاوانەكەی ئەنجامداوە لەكاتی تاوانكردنەكەدا شێت بووبێ، ئەوا لەو بارووداخەدا شێتیەكەی بەربەست دەبێت لە لێپرسراوێتی سزادانو هەروا بەربەستیش دەبێ لە تۆڵە لێسەندنەوەی.

بەڵام خوێنلێسەندنی لەسەر باوانیەتی، ئەگەر تاوانەكە كوشتن بوو، ئەگەر تاوانەكەش دارایی بوو ئەوا قەرەبوو لە دارایی یەكەی دەكرێتەوە[1].

---

[1] بەپێچەوانەی ئیبن حەزمەوە، كاتێ كە دەبینرێ شیاو نیە وەكو ئاژەڵ، ئەوا كە كردەوە ناڕەواكانی ناپرسێتەوە نەلەبواری سزادانو نە لەبواری شارستانێتی دا... الملحى لأبن حزم ٣٤٤/١٠.

# جێ مەبەستى دوهەم:
# بەربەستە كەسيتى يە خۆويستەكان

لەلايەنى زانستيەوە ئەو بەشە بەڕێژەيەكى كەم بوونى هەيە، لە گرنگترينى جێبەجێكردنەكانى سەرخۆشى يە بەرێگا ڕەواكان، وەكو ئەوەى لەكاتى ناچارى دا مادەى سەرخۆشكەر بەكاربهێنێت، وەكو تينوێتى‌و برسێتى زۆر توند، بەشێوەيەك ئەگەر ئەو سەرخۆشكەرە نەخواتەوە ياخود پێى نەدرێت، ژيانى تينووەكە ياخود برسييەكە بكەوێتە مەترسى يەوە، ياخود نەزانێ كە ئەوە سەرخۆشكەرە ياخود حەرامە، ياسا بەوە دەڵێ سەرخۆشى نابەدڵى،[1] هەروەها وەك خۆسەرخۆشكردنى ويستراو بەكارهێنانى هەموو شتێك كە نوقسانى دەخەنە عەقڵەوە.

بەڵام خۆسەرخۆشكردنى ويستراو و بەرێگايەكى نارەوا، نابێتە بەربەست ياخود بارودۆخى سوكەڵە، لە بوارى سزادان دا لەو تاوانە دەپرسرێتەوە كە بەسەرخۆشى

---

[1] هەندێ لە ياسا عەرەبيەكان جياوازى ناكەن لەنێوانى هۆيەكانى ڕێپێدان‌و بەربەستەكانى لێپرسراوێتى سزادان، لەوانە ياساى سزادانى سۆدانى كە لە م٤٩ دا دەڵێ: (تاوان نيە لەو كردارەدا كە منداڵێكى تەمەن خوار حەوت ساڵى ئەنجامى دەدات)و م٥٠ (تاوان نيە لەكارێكدا كە كەسێك بيكات كە لەكاتى ئەنجام دانى كارەكەدا تواناى زانين‌و هەست كردنى نەبێت بەسەر چۆنيەتى كردارەكانيداو زاڵ بوون بەسەريدا بەهۆى شێتى يەكى هەميشەيى ياخود كاتى‌و نەخۆشى عەقڵى ياخود بێ هۆشيەك لە هەر مادەيەكەوە بێت كە پێى درابێت بەبێ ويستى خۆى ياخود نەزانى)و م٥١ (تاوان كارى نيە ئەگەر بەرەزامەندى كەسە تاوان لێكراوەكە بێت)و م٥٣ (بێجگە لە كوشتنى بە ئەنقەست‌و ئەو تاوانانەى كە دەوڵەت سزاى لە سێدارەدانى بەسەردا دەسەپێنێ، كارێك بە تاوان نازمێردرێت كە لە ژێر پاڵەپەستۆو زۆرە ملێ دا كرابێت).
ئەوەى ڕاست‌و شياوە لە هەموو ئەوانەى باسكران كە بوترێت لە بوارى سزادان دا لێ ى ناپرسرێتەوە، چونكە هەرهۆيەك لەو هۆيانەى باسكران، لە هۆكارەكانى ڕێپێدان نازمێرێن، هەتا بوترێت تاوان كارى نيە.

ئه‌نجامدراوه، به‌هه‌مان شێوه‌ی كه‌ له‌باروبۆخی هوشیاری دا لێی ده‌پرسرێته‌وه، به‌ڵكو به‌ باروبۆخی توند داده‌نرێ ئه‌گه‌ر ده‌یزانی دوای سه‌رخۆشیه‌كه‌ تاوان ئه‌نجام ده‌دات[1].

## جێ مه‌به‌ستی سێ هه‌م:
## به‌ربه‌سته‌ ده‌ره‌كیه‌ كاریگه‌ره‌كان له‌سه‌ر ویست نه‌ك ئاگالێبون

له‌ گرنگترینی ئه‌و به‌ربه‌ستانه، زۆر لێكردن‌و ناچاری یه، زۆر لێ كردن بریتی یه‌ له‌ گوشارێكی ناڕه‌وا له‌ كه‌سێكه‌وه‌ بۆ سه‌ر كه‌سێكی تر، وای لێ ده‌كات كه‌ هه‌ستێ به‌ كردنی كارێك یان نه‌كردنی، به‌بێ ڕه‌زامه‌ندی خۆی.

ناچاری له‌ فیقهی ئیسلامیدا ئه‌و به‌هانه‌یه‌یه‌ كه‌ به‌هۆیه‌وه‌ ده‌شێ كارێكی قه‌ده‌غه‌كراو ئه‌نجام بدرێت.[2]

له‌یاساشدا به‌چه‌ند پێناسه‌یه‌ك پێناسه‌كراوه، له‌وانه: (كۆمه‌ڵێك باروبۆخه‌ هه‌ڕه‌شه‌ له‌ كه‌سێك ده‌كات به‌ مه‌ترسی‌و ئاماژه‌ی بۆ ده‌كات بۆ ڕێگایه‌ك بۆ ڕزگاربوون لێی به‌ ئه‌نجام دانی كارێكی تاوانكاریی دیاریكراو)،[3] منیش پێشنیار ده‌كه‌م كه‌ پێناسه‌بكرێت به‌وه‌ی (بۆخێكه‌ كه‌ كه‌سێك تیایدا توشی مه‌ترسییه‌ك ده‌بێت، ناچاری ده‌كات به‌هۆكارێكی ناڕه‌وا لای ببات).

ئه‌و دوو به‌هانه‌یه‌ كاریگه‌رییان له‌ سه‌ر كاره‌ ناڕه‌واكان دا به‌م شێوه‌یه‌یه:

أ- له‌ مافه‌ پوخته‌كانی خوای په‌روه‌ردگار له‌ هۆكاره‌كانی ڕێپێدانن.

---

[1] ماده‌ی (٦١) له‌یاسای سزادانی عێراقی په‌یڕه‌وكراو.

[2] دارر الحكام فی شرح مجلة الاحكام الاستاذ علی حیدر لاپه‌ڕه‌/١٥٨.

[3] شرح قانون العقوبات، القسم العام، دكتور محمود نجیب حسنی لاپه‌ڕه‌/٤٥٨.

ب- لەمافە تایبەتی یە دارایی یەكان لەبەربەستەكانی لێپرسراوێتی سزادانن بەبێ لێپرسراوێتی مەدەنی.
ت- لە تاوانكاریەكانی تۆڵەو خوێنسەندندا، كاریگەری یان جیاوازیی تیادایە، بەهێزتر ئەوەیە كە باروبۆخی سوككەر دادەنرێت[1].

**بەراوردی نێوان هۆكارەكانی ڕێپێدان و بەربەستەكانی لێپرسراوێتی سزادان:**

١- بەربەستەكانی لێپرسراوێتی سزادان ڕواڵەتی كەسێن پەیوەندی هەیە بە تاوانكار خۆیەوە، ئیتر ئەوە خۆیی بێت وەكو بچوكی (منالّی) یاخود كتوپڕی بێت وەكو شێتی، یان دەرەكی بێت و تۆشی ویست بێت نەك زانین، وەكو زۆرلێكردن و ناچاری، بەڵام لە هۆكارەكانی ڕێپێداندا بكەرەكە ویستێكی ئازادو زانینێكی تەواوی هەیە، هەروەكو لەباروبۆخی بەرگریی ڕەوا و ئەنجام دانی ئەرك و بەكارهێنانی ماف دا، بە پشتیوانی خوا لە بەشەكانی داهاتوودا زانیاری زیاتر یان لەسەر دێت.
٢- بەربەستەكانی بەرپرسیارێتی كاریگەریی لەسەر تاوانكارییە مادیەكەدا نیەو لە سیفەتە تاوانیەكەی داناڕنێ، بەڵكو تاوانەكە وەك خۆی دەمێنێتەوە ملكەچ بۆ ئەو دەقە شەرعیەی بە تاوانی داناوە.
لەرووی سیفەتی تاوانییەوە جیاوازی نیە لە نێوانی كوشتنێك دا كە بكەرەكەی كەسێكی ناتەواو(عديم التمين) بێ‌و، كوشتنێك بكەرەكەی كەسێكی بالغ ژیر و سەرپشك بێت، لەكاتێكدا هۆكارەكانی ڕێپێدان ڕاستەوخۆ روو دەكاتە كارە مادییەكە و لە سیفەتە تاوان كاریەكەی دادەڕنێ‌و دەیگۆڕێت بۆ كارێكی ڕێپێدراو و دەری دەكات لەوەی ئەو دەقە بیگرێتەوە كە بە تاوانی داناوە.

[1] بۆ ئەوەی زانیاری زیاترت دەست بكەوێت سەردانی (موانع المسؤولية الجزائية في الشريعة الأسلامية والتشريعات العربية) بكە.

٣- له هۆكاره‌كانی ڕێپێدان بكه‌ر مافی شه‌رعیو یاسایی خۆی ئه‌نجام ده‌دات، هه‌روه‌كو له به‌رگری كردنی ڕه‌وا له‌خۆی یان له‌ناموس یاخود له دارایی، به‌ڵام له‌به‌ربه‌سته‌كانی به‌رپرسیارێتی سزادان دا بكه‌ر ده‌ستدرێژی ده‌كاته سه‌ر مافی كه‌سانی تر له‌ژیانی یاخود له دارایی یاخود له‌ناموسی و هاوشێوه‌ی ئه‌وانه‌دا، به‌ڵام له بواری سزادانداا لێی ناپرسرێته‌وه له‌به‌رئه‌وه‌ی خاوه‌نی به‌هانه‌یه‌كه له سزادانو تۆڵه كردنه‌وه ده‌بیورێت.

٤- به‌ربه‌سته‌كانی به‌رپرسیارێتی سزادان له تاوانكار نابورێ له كه‌مته‌رخه‌می له به‌رپرسیارێتی مه‌ده‌نیدا، به تایبه‌ت له شه‌ریعه‌تی ئیسلامی دا، له هه‌ڵه‌دا, كه یه‌كێكه له توخمه‌كانی لێپرسراوێتی، كۆڵه‌كه ماددیه‌كه به‌سه، ئه‌ویش به‌جێ نه‌هێنانی ئه‌ركێكی شه‌رعی یاخود یاسایی یه، مه‌رج نیه كۆڵه‌كه‌ی مه‌عنه‌وی بوونی هه‌بێت ئه‌ویش زانینی كه‌سه‌كه‌یه به‌وه‌ی ئه‌ركێكی شه‌رعی (یاخود یاسایی) به‌جێ نه‌هێناوه، جا توخمه‌كانی لێپرسراوێتی كه‌مته‌رخه‌می له فیقهی ئیسلامی دا بریتییه له: كاری ناڕه‌وای زیان به‌خش، زیان، په‌یوه‌ندی هۆكاریی نێوانیان، ئیتر ئه‌و بكه‌ره شیاویی ته‌واوی هه‌بێ یاخود شیاوی نه‌بێت.

به‌ڵام هۆكاره‌كانی ڕێپێدان له بكه‌ره‌كه خۆش ده‌بێت له‌هه‌ردوو به‌رپرسیارێتی یه‌كه (سزادانیو مه‌ده‌نی) له‌به‌ر گۆڕینی كاره تاوانه‌كه بۆ كارێكی ڕێپێدراو، كه كاره‌كه ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌و حاڵه‌ته‌ی له‌پێش به‌تاوان دانانه‌كه‌دا له‌سه‌ری بووه.

٥- به‌ربه‌ستی لێپرسراوێتی سزادان كه‌سییه، له‌به‌رپرسیارێتی نابورێت بێجگه له‌وه‌ی كه پێی هه‌ستاوه، جا ئه‌گه‌ر شێتێكو ژیرێك پێكه‌وه كه‌سێكی بێ تاوانیان كوشت، له‌سه‌ر ئه‌و تاوانه له كه‌سه ژیره‌كه ده‌پرسرێته‌وه وه‌كو به‌ته‌نیا هه‌رخۆی تاوانه‌كه‌ی كردبێت.

به پێچه‌وانه‌ی هۆكاری ڕێپێدان كه هه‌موو ئه‌و كه‌سانه‌ی هاوبه‌شن له‌كاره‌كه‌داو، ئه‌وانه‌ش كه یارمه‌تیدانو ئاسان كارییان پێش كه‌ش كردووه به بكه‌ره بنه‌ڕه‌تیه‌كه سوودمه‌ند ده‌بن، بۆ وێنه له‌به‌رگری شه‌رعیدا، هه‌ر وه‌كو بكه‌ره

بنەڕەتیەكە لێپرسینەوەی لەگەڵ ناكرێت كە بەرگری كار بووە نە لەبواری سزادان داو نە لەبواری مەدەنیدا، هەروەها لەو كەسانەش ناپرسرێتەوە كە لەبەرگری كردن دا هاوبەشی یان كردووە یاخود هاوكارییان پێشكەش كردووە یاخود ئاسانكارییان بۆ كردووە، لەبەر ئەوەی هۆكاری ڕێپێدانەكە بابەتی بووەو خۆیی نەبووە.

٦- لە ڕوی ڕێكاریی دادگایی یەوە، لەسەر جێگری داواكاری گشتی یاخود دادوەری لێكۆڵینەوە (یاخود لێكۆڵەرەوەی دادی) پێویستە ئەو داوایە دابخات ئەگەر هۆكاری ئەنجام دانی تاوانەكە لە هۆكارەكانی ڕێپێدان بوو، هەروەها تاوانبارەكە ئازاد بكاتو نەی نێرێت بۆلای دادوەری بابەتەكەو دادگای تایبەتی، لەبەر نەبوونی سوودێك لەو ناردنەدا.

لە كاتێكدا ئەو كەسەی كە بەربەستێك لەبەربەستەكانی بەرپرسیارێتی سزادانی تیادابێ، ئەوا دەنێردرێت بۆ دادگای تایبەتی بۆ دڵنیابوون لە بوونی بەربەستەكە، بەتایبەتی ئەگەر تاوان لەسەركراو یاخود میرات گرەكانی بەرپەرچیان دایەوە، وەكو ئەوەی كەسێك تاوانێك ئەنجام دەداتو دەڵێ: كە لەكاتی تاوانەكەدا شێت بووە یاخود زۆری لێ كراوە یاخود ناچار بووە یاخود هاوشێوەی ئەوانە بووە.

جا بەپێی ئەو جیاوازیە ناوەڕۆكیانە كە لەنێوانی ڕێپێدانو بەربەستەكانی بەرپرسیارێتی سزادان دا هەیە، ڕێژە لەنێوانیان دا گشتیو تایبەتی ڕەها دەبێت بەپێی ئەوەی هاتۆتە دی، هەرچەندە بەپێی تێگەیشتنو چۆنیەتیو ڕاستی یەكەی جیاوازی هەبووە، جا لە هەموو ڕوداوێكی تاوان كاریدا ئەگەر هۆكاری ڕێپێدان هاتەدی ئەو هۆكارە لە هەمان كات دا دەبێتە بەربەست لە بەرپرسیارێتی سزادان دا، هەروەكو لەبارودۆخی بەرگری شەرعی دا هەیە، بەڵام لە بەرپرسیارێتی سزادان دا بەربەستەكە دێتە دی وەكو شێتی یاخود منداڵی بەبێ ئەوەی هۆكارەكە بۆ ڕێپێدان بێت.

# جێباسی سێ هه‌م:
# به‌ربه‌سته‌كانی سزادان

به‌ربه‌ستی سزادان به‌هانه‌یه‌كی یاسایی یه كه تاوان كاره‌كه له سزادان ده‌بورێ یاخود سوكی ده‌كات یاخود ده‌یگۆڕێت، گرنگترینیشیان:

**مردنی تاوانكار:** ئه‌گه‌ر سزادانه‌كه جه‌سته‌یی بوو یاخود په‌یوه‌ند بوو به تاوان كاره‌كه خۆیه‌وه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌و شوێنی سزادانه‌كه‌یه, جا ئه‌گه‌ر ئه‌و نه‌ما ئه‌وا جێبه‌جێكردنه‌كه‌ش نامێنێ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر دارایی بوو وه‌كو (خوێنسه‌ندن) له‌شه‌ریعه‌ت داو بژاردن‌و ده‌ست به‌سه‌راگرتن بوو له یاسادا، ئه‌وا به‌مردنی تاوان كاره‌كه ناكه‌وێ, له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شوێنه‌كه‌ی دارایی یه‌و داراییه‌كه‌ش ماوه‌و هه‌یه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ی حوكمی به‌سه‌ردا درابوو به تۆڵه به‌رله‌وه‌ی به‌سه‌ریا جێبه‌جێ بكرێت مرد، ئایا له‌جیاتی سزاكه بژاردن پێویست ده‌بێ؟ ئه‌وه بابه‌تێكه شه‌رع زانه‌كان جیاوازیان له‌نێوانیان دا هه‌یه، هه‌یانه وتویه‌تی پێویست نابێ،[1] هه‌شیانه ده‌ڵێ پێویست ده‌بێ، لێره‌دا ماوه‌ی ئه‌وه نیه بچینه درێژه پێ دانیه‌وه.

**نه‌مانی شوێنی سزایه‌ك گیانی نه‌بێ** (دون النفس)، بۆ نمونه ئه‌و كه‌سه‌ی حوكمی له‌سه‌ر درابێ كه ده‌ستی ڕاستی ببڕدرێت، كه‌چی ئه‌و ده‌سته‌ی به‌هۆی كاره‌ساتێكه‌وه یاخود به‌هۆی نه‌خۆشی یه‌كه‌وه یاخود سزادانی پێشتر له‌ناوچووبێ, ئه‌وا سزادانه‌كه‌ی له‌سه‌ر نامێنێ، ئه‌گه‌ریش به‌سته‌م فه‌وتا بێ، ئه‌وه سزاكه

---

[1] وه‌كو حه‌نه‌فی‌و مالیكی، مواهب الجلیل/٧/٢١٣، وه شافیعی‌و دوو گێڕانه‌وه له ئه‌حمه‌ده‌وه، التشریع الجنائی الاسلامی/١/٧٧٢.

دەگوێزرێتەوە بۆ ستەم كارەكە، هەندێكیش وای دەبینن[1] كە ئەگەر شوێنی سزاكە ئەگەر نەمابوو ئەوا لەبری (خوێنسەندن)ی ئەو ئەندامە شوێنی دەگرێتەوە، وە بە بەسەرداچوون(تقادم) لە هەندێ یاسادا.[2]

**تەوبەكردنی تاوانكار لە هەندێ لەتاوانەكان** بەربەستە لە سزادان، لەو بارەیەوە دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز هەیە كە لە تاوانی (چەتەیی — الحرابة)دا دەفەرموێت: (إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ)[3] ئەگەر چەتەیەك لەپێش ئەوەدا بگیرێتو بەسەریا زاڵ بن تەوبەی كرد سزاكانی دەستدرێژی كردنی لەسەر لادەچێت، لە بارەی مافە گشتی یەكان (مافەكانی كۆمەڵگا) نەك مافە تایبەتیەكان، هەروەها لە تاوانی بوختانكردن دا بە تەوبەكردن سزای قبوڵ نەكردنی شایەتیو (فسق)ی لەسەر لادەچێت, هەروەكو خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٤) إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ)[4]، شایەنی باسە تەوبەكردن هیچ كاریگەرییەكی نیە لە مافی تایبەتیداو لە ئەستۆی قەرزداردا دەمێنێتەوە تاوەكو وەفای پێ دەكاو دەیداتەوە، یاخود ئازاد دەكرێت یان تۆڵەی دەداتەوە.

سوڵح كردن لەوشتانەی سولحی تێدا دروستە هەروەكو لە تۆڵەدا هەیە بەپێی فەرموودەی خوای پەروەردگار كە فەرموویەتی (وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ

---

[1] وەكو حەنەفی یەكان، البدائع/٧/٢٩٨،٢٤٩.

[2] وەكو یاسای سزادانی لیبی دا لە مادەی (١٠٧) دا هاتووە (تاوان كاریەكان بە تێپەڕبوونی بیست ساڵ لەڕۆژی ڕوودانی تاوانەكەوە لەكۆڵ دەكەوێت، و (كەتن)یش لەدوای تێپەڕبوونی سی ساڵ، و سەرپێچی یەكانیش بە تێپەڕبوونی یەك ساڵ، ئەگەر دەقێكی یاسای نەبێ پێچەوانەی ئەوە بێت.

[3] سورەتی المائدە/٣٤.

[4] سورەتی النور/٤—٥.

سُلْطَانًا)[1] (السلطان) بریتیه له سه‌رپشكبون له نێوانی جێبه‌جێ كردنی تۆڵه‌و خۆش بوون لێ ی و پاشگه‌زبوونه‌وه له خوێنسه‌ندن، له‌بری یاخود خۆش بوون له هه‌ردوو سزاكه.

١- لێبوردن له‌لایه‌ن تاوان له‌سه‌ركراوه‌وه یاخود له‌لایه‌ن باوانی یه‌وه یان ئه‌و كه‌سه‌ی كاره‌كانی به‌ده‌ستێتی (ولي أمر)، له‌و سزایانه‌ی بواری لێبوردنی تیادا هه‌یه، ئه‌وه‌ی له مافی خوادا بێت به‌هیچ شێوه‌یه‌ك بواری لێبوردنی تیادا نیه.

٢- به‌سه‌رچوونی سزالاده‌ر(تقادم المسقط) یاسای سزادانی عێراقی له چوارچێوه‌یه‌كی ته‌سكدا بڕیاری له‌سه‌ر داوه له ماده‌ی (٣٧٨)دا: (دروست نیه داوای زینا بجولێنرێت له دژی هه‌ریه‌كه له‌دوو هاوسه‌ره‌كه یاخود گرتنه‌به‌ری هه‌ر ڕێگایه‌ك تیایدا مه‌گه‌ر له‌سه‌ر سكالاكردنی هاوسه‌ره‌كه‌ی تر، كه‌واته له‌م بارو دۆخانه‌دا كه‌دێن سكالا وه‌رناگیرێت:

أ- ئه‌گه‌ر سكالا پێشكه‌ش كرا له‌دوای تێپه‌ڕبوونی سێ مانگ به‌سه‌ر ئه‌وڕۆژه‌دا كه سكالاكار به تاوانه‌كه‌ی زانیوه.

ب- ئه‌گه‌ر سكالاكار ڕازیبوو به‌ده‌ست پێكردنه‌وه‌ی ژیانی هاوسه‌ری له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا كه زانیاری هه‌بوو به تاوانه‌كه.

ت- ئه‌گه‌ر زینا كردنه‌كه به ڕه‌زامه‌ندی سكالاكار بووبێت.

به‌ڵام له شه‌ریعه‌تی ئیسلامی دا بابه‌ته‌كه له‌نێوانی شه‌رعزانه‌كاندا جیاوازی تیادایه، هه‌ندێك[2] وای ده‌بینن كه تاوان‌و سزاكه له‌كۆڵ ناكه‌ون هه‌رچه‌نده كات‌و ڕۆژگاری به‌سه‌ردا تێپه‌ڕ بێت، ئه‌گه‌ر له (التعازير)و ڕووشكاندنه‌كان نه‌بێت، كه تاوان‌و سزای ڕووشكاندن هه‌ردووكیان لاده‌چن ئه‌گه‌ر وه‌لی ئه‌مر وای بینی كه به‌رژه‌وه‌ندی گشتی له‌وه‌دایه.

---

[1] سوره‌تی الأسرء/٣٣.

[2] وه‌كو پێشه‌وا مالیك‌و پێشه‌وا شافیعی‌و پێشه‌وا ئه‌حمه‌د، التشريع الجنائي الإسلامي/١/٧٧٨.

هەندێکیش[1] وای دەبینن کە لەکۆڵکەوتنی سزاکان بەهۆی بەسەرچوونەوە دەبێت، بێجگە لە سزای تاوانەکانی تۆڵەسەندنەوەو خوێنسەندن و سزای تاوانی بوختانکردن (القذف)، لەسەر ئەو بنەمایەی کە لەو سزادانانەدا مافی تایبەتی زاڵە بەسەر مافی گشتی دا، جا حوکمەکەی وەك حوکمی مافی تایبەتی تایبەتی یەو، بە بەسەرچوون لەکۆڵ ناکەوێت.

٣- شێتی کاتی لەدوای ئەنجام دانی تاوان بەربەستە لە بەردەوام بوونی ڕێکارەکانی سزادان بەر لە دەرچوونی بڕیارداو لەجێبەجێکردنی سزادان لەدوای ئەوە، بەڵام ئەگەر لەپێش مردن دا چاکبوویەوە ئەوا بەربەستەکە نامێنێو قەدەغەکە دەگەڕێتەوە لەسەر ڕێسای (ئەگەر بەربەست نەما قەدەغەکە دەگەڕێتەوە).

٤- گومان لە تاوانە سنوریەکاندا (جرائم الحدود) سزا لادەبات، وەکو چوونەلا لە هاوسەرگیری هەڵوەشاوەدا یاخود گۆڕینی سزای سنوری بۆ سزای ڕووشکێنی، هەروەکو لە تاوانی دزیکردن لەنێوانی دوو هاوسەردا، یان لەنێوانی بنەچەکانو لقەکان دا، یان لەنێوانی دوو هاوبەش لە داراییەکی هاوبەشدا، جا لەجیاتی سزای سنوری (بڕینی دەست) تاوانبارەکە سزا دەدرێت بەسزای ڕووشکاندن، ئەگەر کۆڵەکەکانو مەرجەکانی هەبوونو بەربەستەکان نەمان.

٥- وەستاندنی جێبەجێکردن، دادگا بۆی هەیە لەکاتی دەرکردنی حوکم لە تاوانی گەورەدا(جناية) یاخود لە تاوانی بچوك (کەتن= جنحة) بە بەندکردن کە لە ساڵێك زیاتر نەبێت، کە لە هەمان حوکمدانداا فەرمان بکات بە وەستانی جێبەجێکردنی سزاکە ئەگەر حوکم لەسەردراو لەپێشتردا بەتاوانی بەئەنقەست حوکم نەدرابێ و، لە ڕەفتارو ڕابردوو و ژیانیو بارودۆخی دا، وادیار بێ کە جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ ئەنجام دانی تاوانی تازە.

---

[1] وەکو پێشەوا ئەبو حەنیفە، سەرچاوەی پێشوو/١/٧٧٩.

٦- تاوانكار هه‌واڵ بدات به ده‌سه‌ڵاتی گشتی به‌بوونی ڕێكه‌وتنێكی تاوانكاری: له ماده‌ی (٥٩)ی یاسای سزادانی عێراقی په‌یڕه‌وكراو دا هاتووه كه: (له سزا بڕیاردراوه‌كان له ماده‌كانی (٥٦، ٥٧، ٥٨) ده‌به‌خشرێت هه‌ركه‌سێك ده‌ستپێشخه‌ری بكات به هه‌واڵدان به ده‌سه‌ڵاتی گشتی به‌بونی ڕێكه‌وتنێكی تاوانكاری‌و هاوبه‌شه‌كان تیایدا، به‌ر له ڕوودانی هه‌ر تاوانێك له‌و تاوانه‌ی ڕێككه‌وتوون له‌سه‌ر ئه‌نجامدانی‌و به‌ر له‌وه‌ی ئه‌و ده‌سه‌ڵاته ده‌ست به لێكۆڵینه‌وه‌و به‌دواداچوونی ئه‌و تاوانكارانه بكات، به‌ڵام ئه‌گه‌ر هه‌واڵدانه‌كه له‌دوای ئه‌وه‌بوو كه ده‌سه‌ڵات به‌و كاره هه‌ستان، ئه‌وا له سزاكه‌ی نابه‌خشرێت، مه‌گه‌ر هه‌واڵه‌كه گرتنی تاوان باران ئاسان بكات).

٧- پێ ڕاگه‌یاندن له‌و تاوانكارییانه‌ی كه له ده‌ره‌وه زیان به ئاسایشی ده‌وڵه‌ت ده‌گه‌یه‌نێ، ئه‌و كه‌سه ده‌به‌خشرێت كه هاوبه‌شه له‌و تاوانكاریانه‌داو پێی ڕاگه‌یاندوون.

٨- پێڕاگه‌یاندن له تاوانی به‌رتیل دا، ده‌بێته هۆی به‌خشینی به‌رتیلده‌ر یاخود نێوانكار له سزاكه، ئه‌گه‌ر هه‌واڵی دایه ده‌سه‌ڵاتی گشتی به تاوانه‌كه یاخود دانی پێدانا به‌ر له‌وه‌ی كێشه‌كه به‌رز بكرێته‌وه بۆ دادگا.

**به‌راورد له‌نێوانی هۆكاره‌كانی ڕێپێدان و به‌ربه‌سته‌كانی سزادان:**

١- هۆكاری ڕێپێدان كاریگه‌ریه‌كه‌ی ده‌كه‌وێته سه‌ر پایه‌ی شه‌رعی تاوانه‌كه، به‌شێوه‌یه‌ك وا ده‌كات خودی كاره تاوانكاریه‌كه بكه‌وێته ده‌ره‌وه‌ی تاوانكاری‌و نه‌یگرێته‌وه، له كاتێكدا به‌ربه‌سته‌كانی سزادان هیچ كاریگه‌ریه‌كی نی یه له‌سه‌ر پایه‌كانی تاوانه‌كه، به‌ڵكو كاریگه‌ریه‌كه‌ی كورت ده‌بێته‌وه له‌سه‌ر به‌خشینی تاوانكار له سزادان یاخود سووككردنی یاخود گۆڕینی سزاكه.

٢- هۆكاره‌كانی ڕێپێدان به‌سراوه‌ته‌وه به‌كاتی ئه‌نجامدانی تاوانه‌كه و به‌رده‌وام ده‌بێت تاكو جێبه‌جێ كردنی، به‌ڵام به‌ربه‌ستی سزادان له‌دوای ئه‌نجامدانی تاوانه‌كه و له‌دوای به‌دیهاتنی به‌رپرسیارێتی سزادانی په‌یدا ده‌بێت.

٣- كاریگەری هۆكاری ڕێپێدان هەریەك لەو كەسانەش دەگرێتەوە كە بەشدارییان كردەوە لەگەڵ بكەرە بنەڕەتیەكەی، یاخود ئاسانكارییان بۆ كردووە یاخود هەرشتێكی لەوشێوەیە، هەروەكو بەرگری شەرعی بەرگریكارەكە دەبەخشێت لە بەرپرسیارێتی سزادان‌و مەدەنی، ئەگەر پایە و مەرجەكانی بەرگریكردن هەبوون‌و بەربەستەكان نەبوون، بەهەمان شێوە هەموو ئەو كەسانەش دەبەخشێت كە لەو بەرگرییەدا بەشدار بوون، ئیتر سروشتی بەشدارییەكە هەرچۆنێ بێت، بەپێچەوانەی بەربەستی سزادان، كاریگەرییەكەی كەسانی تر ناگرێتەوە، جگە لەو كەسەی بەربەستەكەی تیادایە، بۆیە ئەو كەسانەی كە بەشداربوون لەگەڵ بكەرە بنەڕەتیەكەدا لە ئەنجامدانی تاوانەكەدا سزا دەدرێن وەك ئەوەی خۆیان بە تەنیا تاوانەكەیان ئەنجام دابێت.

٤- دروستە بڕیار بدرێت بەرێوشوێنی پارێزكاری لە باروبۆخی بەربەستەكانی سزاداندا, ئەو بڕیاردانە لە هۆكارەكانی ڕێپێدان دا دروست نیە.

٥- هۆكاری ڕێپێدان، ئەو كەسانە لە بەرپرسیارێتی سزادان‌و بەرپرسیارێتی مەدەنی دەبەخشێت كە ئەو هۆكارەی تیادایە، بە پێچەوانەی بەربەستی سزادان، ئەوە كاریگەری نیە لەو دوو بەرپرسیارێتی یەدا، مەگەر ئەو بەربەستە هۆیەك نەبێ لە هۆكارەكانی ڕێپێدان یاخود بەربەستێ نەبێت لە بەربەستەكانی بەرپرسیارێتی سزادان، لەبەر ئەوەی پەیوەندیی ژێربێژانەی نێوان بەربەستی سزادان‌و نێوانی هەر هۆكارێك لە هۆكارەكانی ڕێپێدان‌و بەربەستێك لە بەربەستەكانی بەرپرسیارێتی سزادانی، گشتی‌و تایبەتی رەهایە، جا هەر هۆكارێك بۆ ڕێپێدان یاخود بەربەست لە بەرپرسیارێتی سزادان، بەربەستە لە سزادان، بەبێ پێچەوانە گشتی یەكەی.

# بەشی دوهەم

## کارە تاوانکاریەکان لە شەریعەتی ئیسلامی دا

زانایانی شەریعەتی ئیسلامی کارە تاوانەکانیان لە بارەی مەترسیەکانی و مافی دەستدریژی لەسەرکراو و سەرچاوەکانیان کردۆتە سێ بەشی سەرەکی یەوە کە ئەمانەن:

تاوانە سنوریەکان

تاوانەکانی تۆلەکان و خوێنسەندن

تاوانە ڕووشکێنەکان

بۆ لێکۆڵینەوە لەهەر یەکێك لەو سێ بەشە باسێکی سەربەخۆی بۆ تایبەت کراوە، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەو سوود لێ وەرگرتنیان.

# جێباسی یەکەم:
# تاوانە سنورییەکان

تاوانە سنوریەکان ئەوەیە کە تاوانبارکردن‌و سزاکانی بە دەقی شەرعی دیاری دەکرێت، بۆیە ناونراوە تاوانە سنوریەکان مافی دەستدرێژی بۆسەرکراو تیایدا یان مافی گشتی یە (مافی پوختی خوای پەروەردگار)[1] یاخود مافی هاویەش لەنێوان خوای پەروەردگارو بەندەدا، بەڵام مافی گشتی تیایدا زاڵە.

گرنگترین تاوانە سنوریەکانیش کە لە فیقهی ئیسلامی دا ناسراوە حەوتن و ئەمانەن:

١- تاوانی (الزنا)= داوێن پیسی‌و شەرواڵ پیسی.

٢- تاوانی (القذف)= بوختانی داوێن پیسبوون.

٣- تاوانی دزی کردن.

٤- تاوانی قطع الطريق (أو السرقة الكبرى) جەردەیی‌و رێگری

٥- تاوانی الردة= هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام.

٦- تاوانی یاخێتی (البغي).

٧- تاوانی بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان.

---

[1] ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە کە دەستەواژەی (الحق العام = مافی گشتی) لەیاسادا بەرامبەرەکەی دەستەواژەی (حق الله المحض= مافی پوختی خوای پەروەردگارە) لەبەر ئەوەی مافەکە ناگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێکی دیاری کراو لە خەڵکی بەڵکو بەبێ تایبەت بوون هەموو خەڵکی سوودی لێ وەردەگرن، هەروەها مافی تایبەتی لە یاسادا بەرامبەرەکەی مافی بەندەیە (یاخود مافی خەڵکی)یە، لەبەر ئەوەی تایبەتە بە تاکە کەسێك یاخود کۆمەڵێکی دیاری کراو.

جا بە کورتی ئەو حەوت تاوانە ڕون دەکەینەوە.

**یەکەم: تاوانی زینا کردن (داوێن پیسی- شەرواڵ پیسی)**

خوای پەروەردگار لە تاوان بارکردنی تاوانی (داوێن پیسی)دا دەفەرموێ: (وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا)[1] لە ئایەتێکی تردا لە دیاری کردنی سزای ئەو تاوانە ناشیرینەدا فەرموویەتی (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ)[2] سزادان بە بەردباران کردن لە قورئانی پیرۆزدا باسنەکراوە، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر ژمارەیەکی کەم لەو کەسانەی ئەو تاوانەیان ئەنجام داو ژندار بوون یاخود مێردداربوون جێبەجێی کردبوو، بەپێی ئەوەی لە تەوراتی خوای پەروەردگاردا هاتبوو، وە بە دانپیانانی تاوانکارەکەو داوای جێبەجێ کردنی حوکمی خوای پەروەردگاری بەسەریدا، پاشان لەنێوانی زانایانی ئیسلام دا ڕاجیایی دروست بوو کە ئایا سزادان بە بەردەباران کردن ماوەتەوە هاوشان لەگەڵ سزای جەڵدلێدان دا, بەو پێیەی یەکەم بۆ ژن و پیاوی هاوسەردارەو دوهەمیش بۆ بێجگە لەوانە, یاخود بە ئایەتی (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي)[3] هەڵوەشاوەتەوە (نەسخ بۆتەوە).

ئەگەر ئەو وتەیەمان وەرگرت کە دەڵێ ئەو سزایە ماوە هەروەکو ڕای جمهورە، مانەوەکەی دەبێتە نەمانەوە لەلایەنی کرداریەوە ئەگەر تاوانەکە بە شایەتیدانی چوار پیاوی دادپەروەر جێگیر نەبێت، کە لەسەدا سەد وتەکانیان وەك یەك بێت و جیاوازی لە وتەکانیاندا نەبێت، خۆ ئەگەر بەڕێگایە تاوانەکە جێگیر نەبوو دەگۆڕێت بۆ تاوانی ڕووشکێنی لەبەربوونی گومان،و تاوان کار بەو سزایە سزا دەدرێت کە لە یاسادا دانی پێدانراوە، خۆ ئەگەر بەبێ ژمارەی تەواوی جێگیربوو کە دەقی قورئانی پیرۆزی

[1] سورەتی ئیسراء /٣٢.
[2] سورەتی نوور/٢.
[3] سورەتی نوور/٢.

لەسەر هەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ)[١] یاسای سزادانی عێراقی چارەسەری کردووە[٢] ئەو تاوانە بە هەرهۆکارێك لە هۆکارەکان ناگۆڕێت بۆ کارێکی ڕێپێدراو بەرەهایی، بەڵام دەبێتە ڕوخسەت لە هەردوو باری زۆرە ملێو ناچاری دا ئەگەر مەرجەکان هەبوون.

**دوهەم : تاوانی بوختانی داوێنپیسی**

بریتیە لە تۆمەتبارکردنی کەسێك (نێر بێ یاخود مێ) بە تۆمەتی داوێنپیسی، ئەمە تایبەتترە لە تاوانی بوختانی داوێنپیسی لە یاسا.[٣]

خوای پەروەردگار لە بە تاواندانانو سزای ئەو تاوانەدا بۆ قەدەغەکردنی زمانی خەڵکی لە درێژ بوون بۆ سەر ناموسی خەڵکی دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ[٤] ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ(٤) إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ).[٥] ئەم ئایەتە پیرۆزە دەری دەخات کە هەرکەسێك ئادەمیزادێکی داوێن پاکی بەڕێزو شکۆدار تۆمەتبار بکات (نێربێت یاخود مێ) بە تاوانی زینا کردنو نەشیتوانی ئەو تۆمەتە بسەلمێنێ بە چوار شایەت، ئەوا بەسێ جۆر سزا دەدرێت: سزای یەکەمیان سزایەکی (لاشەیی) بنەڕەتی یە کە بریتیی یە لە هەشتا جەڵدە، سزای دوهەمو سێیەم دوو سزای مەعنەویو دەروونین کە دەمیننەوە، ئەو دووسزایەش ئەوەیە کە شایەتی یان

---

[١] سورەتی نوور/٤.

[٢] ژمارە (١١١) بۆ ساڵی/١٩٦٩.

[٣] لە مادەی (٤٣٣) لە یاسای سزادانی عێراقی دەق هاتووە لەسەر (القذف= خستنە پاڵی نادروست) خستە پاڵی ڕووداوێکی دیاری کراو بۆ کەسێکی تر بە یەکێك لە ڕێگا ئاشکراکان لە کەمو کوڕی لێ گرتنی ئەگەر ڕاست بێت کە سزای بۆ پێویست ببێ لەوەی دلوێتی یە پاڵی یاخود سوکایەتی پێ کردنی لەلای هاونیشتمانیانی، ئەو کەسەی بیخاتە پاڵ کەسێکی تر بە نادروستی ئەوا سزا دەدرێت بەبەندکردنو سزای پارەیی یاخود بە یەکێکیان.

[٤] بەرزو بڵند کردنی ئافرەتانی داوێن پاك.

[٥] سورەتی نوور/ ٤–٥.

لێ وەرناگیرێت و باس کردنێتی بە نەنگی و شورەیی خراپەکارو لە کۆمەڵگەدا لە خراپەکاران دادەنرێت، ئیتر نابێتە جێگای باوەڕو، شیاو نابێ بۆ هەڵگرتنی لێپرسراوێتی و شیاو نابێ بۆ ئەوەی پابەندییەکی دینی و دنیایی، هەبێت لەبەرژەوەندییە گشتی یەکاندا.

ئەو بەدەرکردنەی کە لەو ئایەتە پیرۆزەدا هاتوە کە دەفەرموێت: (إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا) ناگەڕێتەوە بۆ سزادانی یەکەم بە کۆڕای زانایانی شەرع، ئەوە بە تەوبە کردن لاناچێت لەبەر ئەوەی دەستدرێژی یە بۆ سەر مافی هاوبەش لەنێوان خوای پەروەردگارو بەندەدا. تاوانەکە دوو دەستدرێژی پێکەوە کۆ دەکاتەوە، دەستدرێژی کردن بۆ سەر مافی خوا (مافی گشتی)و دەستدرێژی کردن بۆ سەر مافی ئەو کەسەی تاوانە نادروستەکەی خراوەتە پاڵ، ئەمەیان مافی تایبەتی یە بە تەوبەکردن لەکۆڵی نابێتەوە.

بەڵام لەباری گەڕانەوەی بۆ دوهەم و سێهەم، زۆرینەی شەرعزانان وای دەبینن جێگیر بووە لەسەر ئەوەی ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر هەردووکیان، بەڵام حەنەفیەکان ڕایان جیاوازەو دەڵێن: دەگەڕێتەوە تەنها بۆ سزای کۆتایی یەکە بەپێی ئەو ڕێسایە ئەگەر پێوەندەکە لەنێوانی نزیک و دووردا بوو دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەکە، لەبەر ئەوەی جیاکردنەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ناچاری، ناچاریەکانیش بەپێی خۆیان مەزەندە دەکرێن، ناچاریش لەگەڕانەوە بۆدوا پابەندیدا نامێنێت.

پەسەندەکەیان وتەی جمهورە لەبەر ئەوەی بەربەستێك نیە بۆ گەڕانەوە بۆ هەردوو سزاکە، خوای پەروەردگار لە بڕیاردان لەسەر (بوختانی داوپیسبوون) لەنێوانی دوو هاوسەردا دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ[1] وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (٦) وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ

---

[1] بەوەی تاوان باری دەکات بە زینا یاخود (نەسەب= ڕەچەڵەك)ی یەکێك لە منداڵەکانی بەدرۆ دەخاتەوە بەوەی کە دەڵێ ئەو منداڵە لە من نیە.

عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٧) وَيَدْرَأُ[١] عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ (٨) وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ)[٢].

تاوانی (بوختانی داوێنپیسی) بەرەهایی ئیتر لەنێوانی دوو هاوسەردا بوویێ یاخود لەنێوانی کەسانی تردا بێت بڕیاری ڕێپێدان وەرناگیرێتو ناگۆڕێت بۆ کاری ڕێپێدراو بەهەرهۆیەك بێت لە هۆکارەکان، ئەو بڕیارەی لەسەر (لیعان= العان= لەعنەت کردن) دامەزراوە ئەوە خۆی بۆخۆی جیاکردنەوەیە لەنێوانی دوو هاوسەردا، لەدوای تەواو بوونی ڕێکارە باسکراوەکان لەبەردەمی دادوەردا لە یەکتری جیا دەبنەوە، لەبەرئەوەی گومانەکان دزەی کردۆتە ناو ژیانی هاوسەرێتی یانەوە ئیتر حیکمەتێك نامێنێت لە بەردەوامبوونی هاوسەرێتی یاندا کە بریتی یە لە دڵ ئارامیو سۆزو بەزەیی لەنێوانیان دا.

### سێهەم: تاوانی دزی کردن

دزی کردن بردنی ماڵی خاوەنداره لەشوێنێکی پارێزراودا بە پەنامەکی، قەدەغەکردنی خاوەنەکەی لە سوود وەرگرتن لە سامانەکەی دزی کردن نیە بەڵکو زەوت کردنە، هەروەها بردنی سامانێکی ڕەوا بۆ هەموان وەکو ماسی لە ڕووباردا یاخود سامانێکی بێ بەها (غیرمتقوم) وەکو سەگی پاسەوانیو بردنی ماڵێك لەشوێنی ناپارێزراودا، ئەمانە بەدزی ناژمێردرێن.[٣]

خوای گەورە لە حەرام کردنی دزیو بەتاواندانانیدا دەفەرموێت (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ)[٤] لە سزادانی دزدا

---

[١] لە قورئانی پیرۆزدا (ويد رؤا).

[٢] سوورەتی نوور/ ٦-٩.

[٣] پاراستن وەکو هەموو شتێك بەپێی جیاوازی سروشتەکەی جیاواز دەبێت، پاراستن وەکو ئۆتۆمبێل بۆ نمونە گەراج.

[٤] سوورەتی نیساء/ ٢٩ ئەوەی شایەنی باسە خواردنی ماڵی کەسانی تر بەبێ بەهانەی شەرعی بەرپرسیارێتی یەکەی شارستانی یەو پێویستە قەرەبوو بکرێتەوە وەکو ئەوەی کەسێکی ناچار ←

(نێر بێ یاخود مێ) خوای پەروەردگار دەفەرموێت (وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)[1].

**لە مەرجەکانی جێبەجێکردنی بڕینی دەست لە دزیەکاندا:**

١- دەبێ دزەکە پێگەیشتوو ژیر بێو خۆی دزی کردنەکەی هەڵبژاردبێ، ناچار نەکرابێ,

٢- تاوانەکە بە شاهێدیدانی دوو شاهید جێگیر بکرێت یاخود بە دان پیانانی تاوانکارەکە.

٣- گومانی حەڵاڵی لە سامانە دزراوەکەدا نەبێت، بۆیە دزی کردن لەنێوانی دوو هاوسەردا یاخود لەنێوانی وەچەو باوان دا, یاخود لەنێوانی دوو هاوبەش لە سامانێکی هاوبەش دا دەستبڕین نییە، بەڵکو لەجیاتی ئەو سزایە سزای ڕووشکێنی جێی دەگرێتەوە.

دزی کردن بەهیچ هۆکارێك ڕێپێدراو نیە، بەڵام لەوانەیە دەرفەت هەبێت وەکو دزی کردن بۆ کەسی ناچارو نەدار, کە مەترسی برسێتی هەڕەشە لە ژیانی دەکات، ئەو کەسە لەبواری سزاداندا لێی ناپرسرێتەوەو سزا نادرێت، بەڵام لە بواری مەدەنیدا بەرپرسیارەو داوای قەرەبوو کردنەوەی لێ دەکرێت.

**چوارەم: چەتەیی یان جەردەیی یان تۆقاندن**

جەردەییو ڕێگری بریتی یە لە بردنی سامانی خەڵکی بەزۆر، یان کوشتنی بێتاوان، یاخود تەنها تۆقاندنو ترساندنی خەڵکی، ئیتر ئەو کارە لە دەرەوەی سنوورەکانی شارەوانی دا بێت یاخود لەناو شاردابێ، مادام تاوان لەسەر کراو کەسێکی دەست نەکەوێت لەو تاوانکارییو دەستدرێژی کردنە ڕزگاری بکات، خۆشی

---

سامانی کەسێکی تر بەبێ مۆڵەت دانی خاوەنەکەی دەخوات، ئەوە وەکو دزی نەکردن کە پێویستە سزا بدرێت وەکو دزین.

[1] سوورەتی مائیدە/٣٨.

نەتوانێ بەرگری لەخۆیو سامانەکەی بکات، خوای پەروەردگار لە بەتاوان دانانی ئەو دەستدرێژی کردنو سزاکەیدا دەفەرموێ: (إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ[1] أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٣٣)إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ[2] فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٣٤))[3].

وشەی (أو) لەو ئایەتەدا بۆ هەڵبژاردن نیە بەڵکو بۆ درێژە پێدانو دابەش کردنە، سزاکان بەپێی قەبارەو مەترسیەکەی بەسەر تاوانەکاندا دابەش دەبێت، شایەنی باسە بڕیارەکانی ئەو ئایەتە لە ئیسلامدا یەك جار بەسەر (عەرنییەکان) دا جێبەجێکراوە، کە لە هۆزی (قضاعە) بوون، موسڵمان ببوونو داوای یارمەتی دارایان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد، ئەویش کۆمەڵێ حوشتر[4]ی پێ دان لەگەڵ شوان دا، بۆ ئەوەی سوودیان لێ ببینن، ئەوانیش شوانەکەیان کوشتو سامانەکەیان تاڵان کردو لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، لەکاتێکدا ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە خاچ دانو شێواندنی جەستەی مردووی حەرام کردووە ئیتر لە هەر چینو دینێك بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئایەتانەی لە بارەی جەردەییو ڕێگریەوە هاتوون شایستەی ئەوەن ببنە سەرچاوە بۆ گەورەترین یاسادانان بۆ لێدان لە دەستی تۆقێنەرەکانو کۆمەڵە خراپەکارەکانو دەستدرێژکاران بۆ سەر گیانو ماڵو سامانو ئابڕووی بێ

---

[1] دەستی چەپو قاچی ڕاست دەبڕدرێت یاخود بە پێچەوانەوە.

[2] واتە لە پێش ئەوەدا بگیرێن خۆیان بدەن بەدەستی دەسەڵات دارەوە بە هەڵبژاردنی خۆیان.

[3] سوورەتی مائیدە/٣٣-٣٤ وە لە (نیل الأوطار)ی شەوکانی دا (١٧٢/٧) لە ئیبن عەباسەوە لە بارەی جەردەییو ڕێگری یەوە دەڵێ: (ئەگەر کوشتیانو سامانیان برد ئەوا دەکوژرێنەوەو لە خاچ دەدرێن، وە ئەگەر بکوژنو سامان نەبەن ئەوا دەکوژرێنەوەو لە خاچ نادرێن، ئەگەر سامان بەرنو نەکوژن دەستیان دەبڕدرێت، ئەگەر لە ڕێگاکە ترسانو سامانیان نەبرد ئەوا لەزەوی دا شار بەدەردەکرێت) شافیعی لە (مسند)ەکەیدا گێڕاویەتی یەوە.

[4] دیارە کە حوشترەکان هی (بیت المال) بوون

تاوانه‌كان، به‌ڵكو ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر تاوانه‌كان كوشتنیشی تیادا نه‌بێت یاخود بردنی سامانه‌كه‌شی تیادا نه‌بێت مادام تۆقاندن‌و ترساندنه‌كه له‌جێی خۆیه‌تی‌و هه‌یه.

تاوانی جه‌رده‌یی‌و ڕێگری وه‌رناگیرێ‌و ناگۆڕێت بۆ كاری ڕێپێدان، ئیتر هۆكاره‌كه‌ی هه‌رچی یه‌ك بێت، تاكه تاوانیشه كه سزای تاوانه‌كه‌ی ده‌درێت له دنیاو له ئاخیره‌تیشدا هه‌روه‌كو خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت: (ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ).

**پێنجه‌م: تاوانی هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه له ئایینی پیرۆزی ئیسلام**

په‌نا ده‌گرین به‌خوای په‌روه‌ردگار، ئه‌و هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌یه‌ش به كرده‌وه یاخود به وتن ده‌بێت كه ئاده‌میزاد كوفری پێ ده‌كات‌و به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر چوونه‌ده‌ره‌وه له ئیسلام، خوای په‌روه‌ردگار له بڕیاری هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌دا ده‌فه‌رموێت: (وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ)[1] ئه‌و تاوانه ده‌ستدرێژی كردنه بۆ سه‌ر مافی پوختی خوای په‌روه‌ردگار، له‌به‌ر ئه‌وه له‌باروبۆخی زۆره‌ملێ كردن دا له‌به‌ر ناچاری دروسته ئه‌گه‌ر دڵی دڵنیابوو به باوه‌ڕ، قورئانی پیرۆز له‌و باره‌یه‌وه ده‌فه‌رموێت (مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ)[2].

له فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ری خوادا (ﷺ) هاتووه: (مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ)[3] ئه‌و فه‌رمووده‌یه ده‌رباره‌ی هه‌ندێ له هاوبه‌ش په‌یداكه‌ران دا هاتووه، كه ئیسلامیان وه‌رگرت‌و موسڵمان بوون‌و له نهێنی موسڵمانان ئاگاداربوون، پاشان له ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌و په‌یوه‌ندییان كرد به دوژمنانی ئیسلام‌و موسڵمانانه‌وه له هاوبه‌ش

---

[1] سووره‌تی به‌قه‌ره/٢١٧.

[2] سووره‌تی نه‌حل/١٠٦.

[3] صحیح البخاری، به‌رگی/٦ لاپه‌ڕه/٢٥٢٧، ژماره/٦٥٢٤.

پەیداکران، پاشان دەستگیرکران، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بە کوشتنیان نەك هەر لەبەر ئەوەی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، بەڵکو لەبەر ناپاکی یە گەورەیەیان، واتە: کوشتنەکە سزای سنووریی (حدود) نیە بەڵکو سزای سیاسی یە.

نەیاری نیە لەنێوانی ئەو فەرموودەیەو لەنێوان بێ دەنگ بوونی قورئان لە کوشتنی هەڵگەڕاوەوە لە ئیسلام لەلایەکو، فەرموودەی خوای پەروەردگار کە فەرموویەتی (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) لە لایەکی تر، کە قورئانی پیرۆز لە داڕوخانی کردەوە چاکەکانی دا کورتی کردۆتەوە.

### شەشەم: تاوانی یاخیتی

خوای پەروەردگار لەروونکردنەوەی بڕیاری ئەو تاوانەدا دەفەرموێت (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)[1].

### حەوتەم: تاوانی بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان

کاتێك ئیسلام هات، لە هەموو ماڵەکاندا یاخود لە زۆربەی ماڵەکان دا شەراب دروست دەکراو زۆربەی خەڵك لە دانیشتنە تایبەتیو گشتیەکان دا دەیان خواردەوە، بەشێوەیەك ئالودەبوون بە خواردنەوەی سەرخۆشکەر ببوە نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی درێژخایەن، کە نەدەتوانرا بە کتو پڕی لەناوببرێت، بەڵام بۆ لەناو بردن و ڕیشەکێش کردنی، پێویستە شێوازی پلە پلەو بەکارهێنانی دانایی بگیرێتەبەر، لەبەر ئەوە قورئانی پیرۆز ڕێگای خۆش کردووە بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی ئەو نەخۆشی یە کوشندەیە، ڕێگایەکی خۆش و ئاسان، بە گرتنەبەری چوار قۆناغ بۆ نەهێشتنی، بە قەدەغەکردنێك کە مانای حەرامکردنی هەمیشەیی دەدات، ئەوەش مانای ئەوە نیە کە ئیسلام لە هیچ قۆناغێك لەو قۆناغانە ڕێگەی داوە بە خواردنەوەی سەرخۆشکەر،

---

[1] سوورەتی حوجورات/٩.

هەروەکو زۆر خەڵك وای نیشان دەدەن، جا چوونە سەر ئەو ڕاو بۆچوونە داڕوخاوەو پلەپلەیی و سڕینەوەیان تیکەڵ کرد، قۆناغی دوایی دانرا بە سڕەرەوەی قۆناغی پێش تر.

ڕووی هەڵەی ئەوە بۆچوونە ناژیرانەییە لەوەدایە کە هۆکاری بە حەرام دانانو بە تاوان دانانی خواردنەوە سەرخۆشکەرەکان لە هەموو ئایەتانەی لەبارەی ئەو کارە تاوانکاریەوە هاتوون، هۆکارێکی ئاشکراو ڕاشکاوانەیە لە هەریەکە لەو چوار قۆناغەدا کە باسیان دێت:

لە قۆناغی یەکەم دا خوای پەروەردگار لە هەموو ڕۆژگارو شوێنێکدا ئادەمیزاد دەدوێنێ کە دەفەرموێت: (وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ)[1] خوێنەری وردبین لەم قۆناغەدا بەریەك کەوتنێکی شاراوەو ئاماژەیەکی عەقڵی ژیرانە دەدۆزێتەوە کەوا سەرخۆشکەرەکان بە هەموو جۆرەکانیەوە لە خۆیاندا پیسن، بنەڕەتی ئەو پیسی یەشی بریتی یە لە زیانی عەقڵی تەندروستیو کۆمەڵایەتیو ئابووری، شاراوە لە مادەی سەرخۆش کەرو لە خواردنەوەیدا، بەڵگە نەویستە، کە باسی چاکیو خراپی ڕەفتارەکانی ئادەمیزاد لە هەموو ڕۆژگارو شوێنێکدا بریتی یە لە سوودو زیان، جا هەر شتێك لەخۆیدا سوودبەخش بێت, ئەوا لەخۆیدا چاکە،[2] وە هەر شتێك بۆ هی دیکە سوودبەخش بێت، ئەوا بۆ هی دیکە چاکە[3]، هەرشتێك بۆخۆی زیانبەخش بێت، ئەوا لەخۆیدا خراپە،[4] وە هەر شتێك بۆ هی دیکە زیانبەخش بێت، ئەوا بۆ هی دیکە خراپە[5].

[1] سوورەتی نەحل/٦٧.
[2] وەکو (داد پەروەری).
[3] وەکو دروکردنێك کە ژیانی ستەم لێکراوێك ڕزگار دەکات کە لەستەم کارێکەوە داوای کراوە.
[4] وەکو (ستەمو زۆرداری).
[5] وەکو (ڕاستی یەك کە بەبێ بیانوو زیان بە کەسێك بگەیەنێ).

چاکی و خراپـی لـەو ئایەتـەی باسـکرا لـە دانـەپاڵی (رِزْقًـا حَسَـنًا) بـۆ (سَـكَرًا) وەرگیراوە، دانەپاڵیش بۆ جیاوازییـە، ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی سەرخۆشـبوون خراپـە، چونکە لەنێوان چاك و خراپدا بەشی سێیەم نییە.

ئەو ئایەتە نە لە نزیکەوەو نە لەدوورەوە بەڵگە نییە لەسەر رێپێـدانی خواردنـەوە سەرخۆشکەرەکان، لەبەر بـوونی نـەگونجانێکی ئاشـکرا لـەنێوانی رێپێـدانی شـتێك‌و ناشیرین کردنیشی لە هەمان کـات دا، لەبـەر ئـەوەی ئـەو دوو سـیفەتە لەیـەك شـتدا کۆنابنەوە، لە پێوانەی شەریعەتی ئیسلامی دا نابێ یەك شت لەکاتێدا لەخۆیـدا چـاك بێت‌و لەکاتێکی تریش دا لەخۆیدا خراپ بێ. هەرکەسێك وا هەڵبەتێت کە ئەو ئایەتـە رێگـەی بـە خواردنـەوەی سەرخۆشـکەرەکان داوەو پاشـان لـە قۆنـاغی کۆتـایی دا سڕاوەتەوە، ئەوە هەڵەیەکی کردووە کە لێخۆشبوونی نیە.

لە قۆناغی دوهەم دا لە حەرام کردنی سەرخۆشکەرەکان قورئانی پـیرۆز شـێوازی وتاری خۆی گۆڕیوە، پشتی بە بـەراوردکردنێکی تـر بەسـتووە، ئـەقڵی ئـادەمیزادی ئاراستەکردووە بۆ بەراوردییەك لەنێوانی ئەو سوودو زیانەی کەسێك لە خواردنـەوەی سەرخۆشکەرەکان بەدەستی دێنێت، یاخود لەنێوانی قازانج‌و زیانی ئەنجامـدانی ئـەو کارە بەدناوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا)[1]

مەبەست لە تاوان لەو ئایەتەدا بریتی یە لە زەرەرکردن بە بەڵگەی بـەراوردکردنی لەگـەڵ سـوودەکەی، ئایەتەکـە هـەر بەتـەنها بەڵگـە نیـە لەسـەر حـەرام کردنـی خواردنەوەی سەرخۆشکەرو قومارکردن، بەڵکو بە ئاشکراو بەڕوونی بەڵگەیـە لەسـەر هەموو ئەو شتانەی کە زیانی زۆرترە لە قازانجی، چونکە پرسیارکردنەکە بـۆ زانینـی حوکمی خواردنەوەی سەرخۆشکەرو قومارکردن بـوو، بـەڵام خـوای پـەروەردگار بـە روونکردنەوەی ئەو حوکمە وەڵامـی نەدایـەوە، بـەڵکو بـە هۆکـاری حـەرام کردنەکـە

---

[1] سوورەتی بەقەرە/٢١٩.

وەلامی داوەتەوە، ئەوەش ئەوەیە کە زیانی ئەو دوو مادەیە زیاترن لە سودەکانی، ئەو هۆکارە لەبەر تیشکی ڕێسای بنەماکانی فیقهی پێی دەوترێت هۆکارە دەق دارەکانو پلەکەی بۆ بەلگە لەسەر بڕیاردان وەکو پلەی دەقی ڕاشکاو وەهایە، بەلگەش لەسەر ئەوە ئەوانەی نکولّی لە بەلگەی پێوانەکردن دەکەن، نکولّی لە بەلگەی هۆکاری دەق دار ناکەن، لەبەر ئەوەی وەکو دەقی ئاشکرا وەهایە.

بەو پێیە قورئانی پیرۆز ڕێنماییمان دەکات بۆ ڕێسایەکی گشتی ئەوەش ئەو،یا کە هەرشتێك زیانەکەی زۆرتر بوو لە قازانجەکەی ئەوە حەرامە وەکو حەرامی خواردنەوەی سەرخۆشکەرو قومارکردن، بەوەش دەقەکە جگەرەکێشانیش دەگرێتەوە بە هەمان پلەی حەرامکردن، چونکە زیانی زیاترە لە قازانجی، بەڵکو بەپێی وتەی کۆی زانایانی بواری پزیشکی هیچ سوودێکی تێدا نیە، بەڵکو مەترسی جگەرەکێشان زیاترە لە مەترسی سەرخۆشکەرو قومار، هەوەکو لە بواری پزیشکی تازەدا[1] جێگیر بووە.

ئەوەی شایەنی باسە مەبەست لە (الخمر) لەو ئایەتەو لە ئایەتەکانی تریش دا هەموو ئەوانەن کە عەقلّ بێ هۆش دەکەنو کەمو کورتی دەخەنە عەقلّەوە، ئەوەش هەموو سەرخۆشکەرەکان دەگرێتەوە، ئیتر کەرەستە خاوەکەی هەرچییەك بێت و هەرجۆرێك بێت، پێویست بە بەکارهێنانی پێوانە ناکات بۆ سەلماندنی حەرام کردنی سەرخۆشکەری تر، وە پێوانەکردنی (بیرە) لەلای هەندێ لە شارەزایانی بواری (أصول)[2] لەسەر (عەرەق) لە حەرام کردن دا، لەبەر ئەوەی هەردووکیان لە هۆکاری حوکمەکەدا هاوبەشن کە بریتیە لە سەرخۆش کردن، کە لە دوو ڕووەوە تاوانە:

[1] مەترسی جگەرەکێشان هەموو ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە لە شوێنەکەیان نزیکە لە جگەرە خۆرەکەوە، ئەوەش کە پێی دەوترێت جگەرەکێشانی نالەبار، پاش ئەوەی جگەرەکێشان لە گرنگترینی هۆکارەکانی توش بوونی ئادەمیزادە بە شێرپەنجەی دەمو قورگو میزەڵدان سی یەکان بێجگە لەوەی ئادەمیزاد توشی ڕەق بوونی خوێن بەرەکان دەکات، بڕوانە کتێبی (التدخين أضراره وتحريمه في القرآن) نوسینی دانەرمان.

[2] لەوانە مامۆستا دکتور عبدالكريم زيدان لە کتێبەکەیدا کە ناوی (الوجيز في أصول الفقه)ە.

یەکەم: خواردنەوەی بێهۆشکەر لە تاوانە سنوریەکانە و بە پێوانە جێگیر نابێ، لەبەر ئەوەی یەکێك لە جیاکەرەوەکانی تاوانە سنوریەکان ئەوەیە، بەتاوانداناان بە دەق جێگیر دەبێ‌و سزاکەشی هەر بەدەق جێگیر دەبێ، بەڵام سەبارەت بەدیاری کردنی سزا کە هەشتا جەڵدەیە، چل دانەیان سنوری(حدی)یە کە بە سوونەتی پێغەمبەر (ﷺ) جێگیر بووە، چل دانەشیان ڕووشکێنی یە کە بەپێوان لەسەر (بوختانی داوێنپیسی) جێگیر بووە.

دوهەم: لەو ئایەتە پیرۆزەدا مەبەست لە (الخمر) مانای زمانەوانیەکەیەتی بەبێ گوێ دانە جۆرەکەی‌و سروشتەکەی‌و کەرەستە خاوەکەی.

لە قۆناغی سێهەم دا دانەری شەرع کاتی لەسەر عەرەقخۆر تەسك کردۆتەوە بۆ ئەوەی ئامادەبێت بۆ وازلێهێنانی کۆتایی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ)[1] ئەو ئایەتە بەڵگە نیە لەسەر دان پیانانی ڕێپێدانی خواردنەوەی سەرخۆشکەر لە دەرەوەی نوێژدا، ئەوەش وەکو ئامۆژگاری پزیشك وەهایە بۆ کەم کردنەوەی جگەرەکێشان سەبارەت بەو نەخۆشەی کە ئالودەبووە بە جگەرەکێشان، ڕێنومایی کردنەکەی بۆ کەم کردنەوە لە باروبۆخێکدایە کە نەخۆشەکە ناتوانێت بەیەك جار واز لە جگەرە بێنێت، ئەوەش بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە دانی بەوەدا نابێ بە جگەرەکێشانی کەم و دڵنیای کردبێ کە زیانی پێ ناگات.

لە قۆناغی چوارەم‌و کۆتاییدا کە لوتکەی پلە بەپلەکەو جێگیر بوونی تەواوی حوکمەکەو ملکەچبوونی تەواوە بۆی‌و گوێڕایەڵی کردنی قەدەغەکردن بەشێوەی کۆتایی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ[2] مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ(٩) إِنَّمَا يُرِيدُ

---

[1] سوورەتی نیسا/٤٣.

[2] وهي قداح الاستقسام.

الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ)[1] .

ئه‌و ئایه‌ته به‌ڵگه‌یه، به‌ڵگه‌یه‌كی بن بڕه له‌سه‌ر حه‌رام كردنی هه‌موو جۆره‌كانی سه‌ر خۆش كه‌ره‌كان حه‌رام كردنێكی یه‌كجاره‌كی له حه‌وت ڕووه‌وه كه ئه‌مانه‌ن:

١– دانانی سه‌رخۆشكه‌ر و قومار له ڕیزی بتپه‌رستی كه ملكه‌چ كردن بۆ بته‌كانیش ئه‌وپه‌ڕی كوفركردنه.

٢– باسی سه‌رخۆشكه‌ر به‌وه‌ی كه كرده‌وه‌ی بۆگه‌نه(رجس)، بۆگه‌نیش لانابرێت به‌پێچه‌وانه‌ی پیسی یه‌وه ده‌كرێت لابرێت.

٣– باس كردنی خواردنه‌وه‌ی سه‌رخۆشكه‌ر به‌وه‌ی كه له‌كاری شه‌یتانه، ژیرانه نیه كه كاری شه‌یتان ڕێپێدراوبێت.

٤– خوای په‌روه‌ردگار فه‌رمانی كردووه به دووركه‌وتنه‌وه له خواردنه‌وه‌ی سه‌رخۆشكه‌ر، ده‌سته‌واژه‌ی (فَاجْتَنِبُوهُ) به‌هێزترو ره‌واتره له ئاماژه‌دان بۆ قه‌ده‌غه‌كردن‌و حه‌رام كردن، له‌ده‌سته‌واژه‌ی (النهی أو الحرمة)و وه‌رگێراوه‌كانی، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی دووركه‌وتنه‌وه به‌كار ناهێنرێت مه‌گه‌ر له‌وه‌دا كه مه‌ترسی تیادابێت‌و به‌خێرایی ته‌شه‌نه بكات وه‌كو (تاعون= كولێرا).

٥– خوای په‌روه‌ردگار به‌سه‌رچاوه‌ی شه‌ڕو دوژمنایه‌تی‌و ڕق‌و قینه باسی ده‌كات، به‌هۆی ئه‌وه‌وه له‌كاتی سه‌رخۆشی دا له‌ده‌می سه‌رخۆشه‌وه ده‌رده‌چێت‌و ئاگاو هۆشی نامێنی‌و كه‌م ئه‌قڵ ده‌بێت.

٦– خوای په‌روه‌ردگار به‌وه باسی كردووه كه به‌ربه‌سته له‌به‌رده‌م بیركردنه‌وه‌دا بۆیه ده‌بێت به ئه‌قڵ بیری لێ بكرێته‌وه له‌وه‌دا كه پێویسته‌و داوا ده‌كرێت كه هاوبه‌شی بكات له په‌ره‌پێدانی ژیانی كه‌سێتی‌و ژیانی گشتی بۆ كۆمه‌ڵگه.

٧– داواكردنی كۆتایی هێنان به‌و قۆناغه‌ی كه باس كران بۆ خواردنه‌وه

[1] سووره‌تی مائیده/٩٠–٩١.

سەرخۆش کەرەکان بەپرسیاری نکوڵی کردن (فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ؟) پرسیاری نکـوڵی کـردن بەڵگەیــە لەســەر قەدەغــەکردنی بەڵگــەی بــەهێزترە لــە دەستەواژەی (النهی) یاخود دەستەواژەی (التحریم)، (قەدەغەکردن یـاخود بەتاوان دانان).

خواردنەوەی سەرخۆش کەر لەگەڵ ئەوەدا کە کارێکی ناشیرینە، بەڵام دەشکرێت لەبەر ئەوەی دەبێتە ڕێپێدراو بۆ ئەو کەسەی زۆری لێ بکرێت، زۆرە ملێیەك کە بکرێتە دەسـتپێچ لـە بـارودۆخی ناچـاری دا وەکـو برسـێتیو تینـوێتی زۆر تونـدو بـەهێزو هاوشێوەیان، کاتێ کە ژیـانی ئـادەمیزاد دەکەوێتـە مەترسـی یـەوە، لەبـەر ئـەوەی خواردنەوەی سەرخۆشکەرەکان دەستدرێژی کردنە بۆ سەر مافی خوای پەروەردگار، ئەوە دەبێتە ڕێپێدراو بـە مۆڵـەتی یاسـادانەر، بـەڵام نـەك بـۆ تـەداویو چارەسـەری نەخۆش، لەبەرئەوەی پیسەو خوای پەروەردگاریش شیفاو چاك بوونەوەی لـە شـتی پیس دا بەدی نەهێناوە.

**سزای تـاوانە سنوریەکان ( جرائم الحدود )**

سزاکانی ئەم تاوانانە جۆراو جۆرن بەپێی جیاوازی سروشتی تاوانەکە جیاوازییان هەیە کە ئەمانەن:

١- لێدان بە قامچی هـەروەکو لـە تـاوانی (داوێنپیسـی)و تـاوانی (خواردنـەوەی سەرخۆش کەردا هەیە).

٢- کوشتن وەکو لەتاوانی جـەردەیی‌و تـاوانی تـاوانی زیناکردنـدا هەیـە ئەگـەر زیناکەرە پیاوەکە یاخود ژنەکە لە باری خاوەن هاوسەری دابن‌و تاوانەکە بە چوار شایەت جێگیر بوو سەلما، یاخود تاوانکەرەکە خۆی دانی بەوەدا نابوو کـە تاوانەکـەی ئـەنجام داوە پێگەیشـتوو ئـاقڵیش بـوو خـۆی ئـەو کـارەی هەڵبژاردبوو چوار جار لەبەردەم دادوەردا دانی پیادا نابێ، لەسەر ئەو ڕایەی کە وا دەبینێ سزای بەردەباران کردن نەسڕاوەتەوە، بەڵگە نەویستیشە کە ســەلماندنی زینــا بــە بەڵگــە ئەســتەمە، بــەڵام دەتــوانرێ بــەڕێگا

پێشكه‌وتووه‌كانی زانست بسه‌لمێنرێت، به‌و پێیه‌ش سزا كه‌ زیاتر ترساندن وه‌ك له‌وه‌ی كرداریو جێبه‌جێكردن بێ به‌پێی مه‌زه‌نده‌كردنی مانه‌وه‌ی.

٣- بڕین وه‌كو له‌ تاوانی جه‌رده‌یی له‌ هه‌ندێك حاڵه‌تیداو له‌ تاوانی دزی كردن دا هه‌یه‌.

٤- به‌ندكردن یاخود دوورخستنه‌وه‌ وه‌كو له‌ بارودۆخی ترساندنو تۆقاندن دا هه‌یه‌ ئه‌گه‌ر ده‌ستدرێژی كردنی له‌گه‌ڵ دا نه‌بوویێ، بۆ سه‌ر كه‌سو گیان خوار گیانیش یێن سامانو ئابڕوو.

**تایبه‌ت مه‌ندییه‌كانی تاوانه‌ سنوریه‌كان:**

تاوانه‌ سنوریه‌كان به‌ چه‌ند تایبه‌تمه‌ندیو جیاكه‌ره‌وه‌یه‌ك جیا ده‌كرێته‌وه‌ كه‌ له‌ تاوانه‌كانی تردا نین ئه‌مانه‌ له‌ گرنگترینیان:

١- مافی ده‌ست بۆ درێژكراو له‌ تاوانه‌ سنوریه‌كان، یان مافی تایبه‌ت به‌خوای په‌روه‌ردگاره‌ (مافی گشتی) وه‌كو تاوانی هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ له‌ دینی ئیسلامو تاوانی به‌كارهێنانی ماده‌هۆشبه‌ره‌كان، یاخود مافی هاوبه‌شه‌ له‌ نێوان خوای په‌روه‌ردگارو به‌نده‌داو مافی خوا زاڵه‌، وه‌كو له‌ تاوانه‌ سنوریه‌كانی تردا هه‌یه‌.

تاوانو سزا هه‌ردوكیان به‌ ده‌قی شه‌رعی له‌ قورئانی پیرۆزو له‌ سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوادا (ﷺ) دیاریی كراوه‌ وه‌كو سزادانی به‌كارهێنانی ماده‌ هۆشبه‌ره‌كان دیاری كراوه‌ به‌ چل قامچی به‌ سوننه‌تی كرداری پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ئه‌و سزایه‌ به‌ چل جه‌ڵده‌ی تر زیاد كراوه‌، چونكه‌ چله‌كه‌ی پێشوو نه‌ده‌بوه‌ ڕێگرو به‌ربه‌ستو چاكسازی بۆیه‌، چل قامچی یه‌كه‌م سزای سنوریه‌و چله‌كه‌ی دی سزای ڕووشكێنی یه‌.

سزای تاوانه‌كانی سنوری نه‌ سازش هه‌ڵده‌گرن نه‌ لێبوردنو نه‌ وازهێنان، له‌به‌رئه‌وه‌ی له‌ مافه‌كانی خوای په‌روه‌ردگارن نه‌ك له‌ مافه‌كانی ده‌ستدرێژی بۆ سه‌ركراو، وه‌ مافی سه‌رۆكی وڵات یاخود دادوه‌ریش نیه‌و ڕێسای شه‌رعی یاسایی گشتی بڕیاری داوه‌ كه‌ (فاقد الشيء لا يعطيه)= ئه‌و شتێكی به‌ده‌ست نه‌بوو ناتوانێت

بیبەخشێ).

سزای تاوانە سنورییەکان کاریگەر نابێت نە بە باروبۆخی ئاسانو نە توندو نارەحەت، بەڵکو پێویستە ئەنجام بدرێو جێبەجێ بکرێت هەروەکو ئایەتی پیرۆزی قورئانو سوننەتی پێغەمبەری لەسەر هاتووە (ﷺ) ئەگەر سزایەکی تری بۆ زیادکرا بەهۆی باروبۆخێکی توندەوە یاخود بەهۆی شتی ترەوە، ئەوا زیادەکە سزادانێکی رووشکێنی یە نەك سنوری، ئەو تایبەتەش بەڵگەیە لەسەر نەبوونی تاوانی بەردباران کردن، چونکە هاوسەرێتی بە باروبۆخی توند ئەژمار ناکرێت بۆ توندکردنی سزای زیناکردن.

٢- سزای تاوانەکانی سنوری لە باروبۆخی نیمچە چارەسەرکردندا یان جێبەجێناکرێت وەکو لەچوونە ناو هاوسەرگیری هەڵوەشاوەدا هەیە، هەرکەسێك هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێك دا ئەنجام بدات بۆ نموونە بەبێ ئامادە بوونی دوو شاهێد یاخود بەهۆیەکی ترەوە هەڵوەشابێتەوە، ئەوا چوونەلا (سەرجێیی)یەکە گومانی دەکەوێتە سەر کە لەرووکەشدا هاوسەرگیرییەکە دروستە، بۆیە ئەم شوێنەوارانەی لەسەر دادەمەزرێت:

أ- ئەو ئافرەتەی چووەتە لای، مارەیی هاووێنەی یان کەمتر لە مارەیی دیاریکراوی دەکەوێت، مارەیی هاوشێوەش قەرەبووکردنەوەیە بۆ ئەو زەرەرە مەعنەوییەی بە ئافرەتەکە کەوتووە بەهۆی چوونەلای.

ب- ئەو منداڵەی کە لەو سەرجێیی کردنەوە پەیدا دەبێت رەچەڵەکی جێگیر دەبێ، مافەکانی هەیەو پابەندبوونەکانی لەسەرە هەروەکو بۆ منداڵێکی شەرعی هەیە، فەلسەفەکەشی پاراستنی مافە رەچەڵەکی یەکانی منداڵەکەیە لەداهاتوودا.

ت- خزمایەتی پێ جێگیر دەبێ، ژنەکە حەرام دەبێ لەسەر بنەچەو لقەکانی ئەو پیاوەی چۆتەلای، هەروەکو بنەچەو لقەکانی ئافرەتەکەش بۆ پیاوەکە حەرام دەبێ.

# جێباسی دووەم:
# تاوانی تۆڵەو خوێنسەندن

بریتی یە لە تاوانی دەستدرێژی كردنە سەر گیان‌و كەمتر لـە گیـان (الـنفس ودون النفس) (وەكو بریندار كردن) ئەو تاوانە لە تاوانـە نامەبەسـتیەكان ئـەژمار دەكرێـت، لەبـەر ئـەوە یاسـادانانی تاوانكـاری ئیسـلامی‌و یاسـادانانی سـزادانی یاسـایی دابەشیانكردووە بۆ سێ بەش كە ئەمانەن: بە ئەنقەست‌و نیمچە ئەنقەست و هەڵە.[١]

١- كوشتنی بە ئەنقەست بریتی یە لە تیابردنی گیانی ئادەمیزاد بە ئەنقەست بە هۆكارێك زۆربەی جار مرێنەرە، وەكو چەكی ئاگرین.

٢- كوشتنی نیمچە ئەنقەست، كوشتنی ئەنقەستە بـە هۆكارێـك كـە زۆربـەی جـار مرێنەر نیە، وەكو بەردو تەختەو لێدان بەدەسـت‌و هاوشـێوەیان، لـە بەرامبـەر

---

[١] هەنـدێ وەكـو (حەنەفی)یـەكان دابەشـی كـردووە بـۆ پێـنج بـەش وەك (بـە ئەنقەسـت‌و نیمچـە ئەنقەسـت‌و هەڵـەو كـەوتن بەسـەری دا وەكـو خەوتوویـەك هەڵگەڕێتـەوە بەسـەر كەسـێك داو بیكوژێ‌و كوشتن بەبونە هۆكار وەكو هەڵكەندنی بیرێك لە شوێنێكی ڕێگە پێ نـەدراو كەسـێكی تێ بكەوێ‌و بمرێت.

هەندێكەسی تری وەكو (مالیكی) دابەشی كردووە بۆ (بەئەنقەست‌و هەڵە لەسەر ئـەو بناغەیـەی كە نیمچە ئەنقەست لەژێر بەئەنقەستی دا ڕێ دەگرێ، بەڵام دابـەش بـوون بـۆ سـیانەكە ڕاسـت ترە، لە (شرح الخرشی المالكی (٨/٧)) هاتووە (ئەو كوشتنەی كـە پێویسـت ئـەكا سزا بـدرێت ئەوەیە كە كەسە بكوژەكە مەبەستی لێدانی بـووە واتـە مەبەسـتی خسـتنی بـووە، مـەرج نیـە مەبەستی لە كوشتنی بوبێ بەبێ تاوان كاری بنـەڕەتی لەسـەر لقەكـەی، جـا ئەگـەر مەبەسـتی لێدانی بوویێ بەوەی دەی كوژێ زۆربەی جار بەو هۆیەوە مردووە ئـەوا سـزا دەدرێـت هـەروەها ئەگەر مەبەستی لێدانی بوویێ بەوەی كە نەمرێ زۆربەی جار كە بـەوە مـرد ئـەوەش هـەر سـزا دەدرێت، وای دەبینم كە سێ بەشەكە پەسەند ترێ.

ئـەوە لـە یاسـای سـزاداندا لێـدانێك ببێتـە هـۆی مـردن هـاتووە.[1] پێـوەری جیاکردنەوەی نێوان بە ئەنقەستو نیمچە ئەنقەست بریتی یە لە پێوەری مـادی (بابەتی) کە بریتییە لەو هۆکارەی لە جێ بەجێ کردنی تاوانەکەدا بەکار هاتووە.

٣- کوشتنی هەڵە بریتی یە لە خوێنڕشتنی ئادەمیزادێك کە لە ژیان دا بـووبێ بـەبێ مەبەست، مەبەستی تاوانکاری لە کوشتن دا لە یەکێ لەم دوو بارودۆخەدا بوونی نییە:

یەکەم: هەڵە کردن لە پێکانی نیشـانەدا وەکـو ئـەوەی دەیگرێتـە نیشـانەیەك بـە گومانی ئەوەی بۆ نمونە ئاسکەو دەیکوژێ، پاشان دەردەکەوێ کە ئادەمیزادێکی بێ تاوانە.

دوهەم: هەڵـەکردن لـە کارەکـەدا وەکـو ئـەوەی بـۆ نمونـە دەمانچـەکەی خـاوێن دەکاتەوە، نازانێ گولەیەکی تێدایە، لەکاتی خاوێنکردنەوەکەدا گولەکە دەردەچێتو بەر کەسێکی بێ تاوان دەکەوێتو دەیکوژێ یاخود بریندار دەکات.

پێوەری جیا کردنەوەش لەنێوانی ئەنقەستو هەڵـەدا کەسـی یـە، لەبـەر ئـەوەی مەبەستەکە لـەدڵی بکوژەکـەدا شـاراوەتەوەو ئاشـکرا نابێـت مەگـەر بـەدان پیانـانی کەسەکە خۆی یاخود بەڵگەیەك. جا لەسەر دادوەر پێویستە کـە پشـت ببەسـتێ بـە بـارودۆخی تاوانەکـەو باگراونـدەکانی و، بـارودۆخی تاوانکارەکـە، بـۆ ئاشـکراکردنی مەبەستی تاوانکارەکە.

سزای کوشتنی بە ئەنقەستی دوژمنکاری بریتیە لە تۆڵەسەندنەوە، ئەگەر پایەکانو مەرجەکانی تیادا هاتنەدیو بەربەستیش لە ئارادا نەبوو، فەلسەفەش لەو سزادانەدا بریتی یە لە پاراستنی گیانی بێ تاوانەکان، هەروەکو دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆزی لەبارەوە هاتووە کە دەفەرموێت (وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ)[2]، پیتی (ڤ) لەو ئایەتەدا بۆ هۆکارە جا هۆکاری بکەری بڕیاردانەکە دەسەڵاتی

---

[1] برگەی (٤١٠) لە یاسای سزادانی عێراقی پەیڕەوکرلو.

[2] سوورەتی بەقەرە/١٧٩.

یاساداناني خواییە، هۆكارە ئامانجیەكەشی بریتی یە لە بەرژەوەندی ئادەمیزاد، كە بریتیە لە پاراستنی ژیانی، كە یەكێكە لە بەرژەوەندیە پێویستی یە شەرعیەكانی ئادەمیزاد و، یەكێكە لە مەبەستەكانی یاسادانەر.

تۆڵەسەندنەوەش وەكو سزادان لەوكاتەوەی پەیدابووە ملكەچە بۆ سێ سیستمی سەرەكی كە ئەمانەن:

أ- سیستمی هۆز و پاڵنەرەكەی بریتی بووە لە حەزی تۆڵە سەندنەوە.

ب-سیستمی دەوڵەت، هۆكاری پاڵنەر بۆ دەوڵەت بریتی یە لە پارێزگاری كردن لە هێمنایەتی‌و ئاسایش‌و سەقامگیریی و پارێزگاری كردن لە گیانی بێ تاوانەكان.

ت-سیستمی ئیسلام، ئامانج لە تۆڵەسەندنەوە لە سێبەری ئەو سیستمە خواییەدا بریتی یە لەسەرجەمی پاڵنەرە ناوبراوەكان لە سیستمی هۆزو دەوڵەت، كە بریتیە لە: رەچاوكردنی حەز ویستی ئادەمیزادە وەكو سروشت كە هەرچەندێ شارستانیەت پێش بكەوێ لێی جیا نابێتەوەو، پاراستنی ئەو سیستمەی كە دەوڵەت بەڕێوەی دەبات، ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە سیاسەتی تاوانكاری‌و فەلسەفەی سزادان دلوای دەكات لە پارێزگاریكردنی هەردوو لایەنە باسكراوەكە، بۆ ئەوەی سزادان مەبەستە جێ ئومێدەكان بێنێتە دی.

## تۆڵە(قصاص) و حەزی تۆڵە سەندنەوە(انتقام)

تۆڵەسەندنەوە لە سروشتە سەرەتاییەكەیدا لە مافی تایبەتی خۆی دەبینیەوە كە تاك خۆی ئەنجامی دەدا لەژێر سێبەری گردبوونەوەی كۆمەڵێك لە شێوەی خێزان یاخود عەشیرەت یاخود هۆز، وە بەهاوكاری كەسانی تر لەو گردبوونەوە سروشتی یە بە پاڵنەری حەزو تۆڵەسەندنەوە، ئەوە كاردانەوەیەكی خۆڕسك بوو دژ بە دەستدرێژی بۆ سەر گیانی كەس یاخود كەمتر، ئەوە تاكە وێنەیەكە كە لەگەڵ ژیانی سروشتیدا رێك دەكەوێت. سەرەڕای ئەوە لەوانەیە ببێتە هۆی لێكەوتەی نادروست، بەهۆی نەبوونی بنەمای كەسێتی بەرپرسیارێتی سزادان و بنەمای كەسێتی سزادان، كە دەقی قورئانی لەسەر هاتووە، لەبارەی یەكەم دەفەرموێت(كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ

رَهِينَةٌ)[1] (لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ)[2] لەبارەی بنەمای دوهەم دەفەرموێت (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى)[3] زۆرجار تۆڵەستێن کاسەی تورەیی خۆی دەڕشت بەسەر هەر کەسێك کە دەیبینی و سەربە خێزان یاخود عەشیرەت یاخود هۆزی تاوانبارەکە بوو، بەمەش ئەنجامدانی مافی تۆڵە سەندنەوە بەپێی حەزو ویستەکان، هەندێك جار بازنەیەکی پڕ لە شەڕی وێرانکاری دەکەوتە نێوانی هەردوو هۆزی تۆمەتبارو تاوان لەسەرکراو. پاش ئەوەی ژیان هەنگاوی سستی نا بەرەو کەمێك پێش کەوتن‌و ڕێکخستنی عەقڵی، بیرۆکەی وازهێنان لە دەستدرێژکار بۆ هۆزی تاوان لەسەرکراو دەرکەوت، بەوشێوەیە دەستدرێژکار دەکەوتە ژێر ڕەحم‌و سۆزی یەوە، گەر بیویستبا دەیکوشتەوە یاخود دەیکردە کۆیلە، هەروەکو بیروڕای حەرامکردنی تۆڵەسەندنەوە لە شوێن و کاتی تایبەت دا دەرکەوت، وەکو مانگە حەرامەکان لەلای عەرەب لە پێش ئیسلام دا.[4]

لە پاش ئەوەی ئادەمیزاد گێمێکی تری لە پێشکەوتنی شارستانێتی بڕی، ڕژێمی تر دەرکەوتن، تا ڕادەیەکی زۆر شێوازی تۆڵەسەندنەوەیان ڕێکخست، وەکو هەردوو سیستمی تۆڵەو خوێنسەندن (القصاص والدية).

سیستمی خوێنسەندن بەواتەی دەربڕینی ڕەزامەندی لەنێوان هەردوو هۆزی تاوانبار و تاوان لەسەرکراو بوو، بۆ ڕێکەوتن لەسەر بڕێك لە پارە تاوان لەسەرکراو یاخود کەسە نزیکەکانی لە تاوانبارەکەیان وەردەگرت، لەبەرامبەر وازهێنان لە دەستدرێژکار. پاشان ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات بە شێوەیەکی دادپەروەرانەی

---

[1] سوورەتی المدثر/٣٨.

[2] سوورەتی البقرة/٢٨٦.

[3] سوورەتی الزمر/٧.

[4] مامۆستا دکتۆر علی راشد (فلسفة تأريخ القانون الجنائي) وە مامۆستا دکتۆر عمر ممدوح مصطفى (أصول تأريخ القانون).

تاوازه، حوكمی (سزادان‌و خوێنسه‌ندن)ی ڕێك خست، پایه‌و مه‌رج و به‌ربه‌ستی دانا بۆ هه‌ریه‌كه‌یان‌و چۆنیه‌تی و چه‌ندێتی خوێنسه‌ندنه‌كه‌یشی دیاری كرد.

## مه‌رجه‌كانی سزادانو خوێنسه‌ندن

### یه‌كه‌م: تۆڵه (القصاص)

بـۆ پیـاده‌كردنی سیســتمی تۆڵــه‌و جێبــه‌جێ كردنــی چــه‌ند مــه‌رجێك هه‌یــه گرنگترینیان ئه‌مانه‌ن:

١- سه‌لماندنی تاوانه‌كه به به‌ڵگه‌ی باوه‌ڕپێكراو یاخود به دانپیانانی تاوان باره‌كـه، كه پێگه‌یشتوو (بالغ)و عاقڵ بێ‌و سه‌رپشك بێت له دانپیانان دوور له هه‌موو زۆر لێ كردن‌و ئازاردانێك.

٢- گرتنه‌به‌ری هه‌موو ڕێكاره دادگاییه‌كان له سایه‌ی سیستمی بنه‌ماكانی دادكارییه سزایی یه‌كان.

٣- نه‌مانی به‌ربه‌سته ڕێگره‌كـان وه‌كـو شـێتی كـاتی، ئه‌گـه‌ر لـه‌دوای ئه‌نجامـدانی تاوانه‌كـه شـێت بـوو، ڕێكـاره دادگاییـه‌كان لـه‌دژی ده‌وه‌سـتێنرێت و لـه دوای ده‌رچوونی بڕیـاریش جێبـه‌جێكردنی ده‌وه‌سـتێنرێت، ئه‌گـه‌ر به‌شـێتیش مـرد خوێنسه‌ندن له سامانه‌كه‌ی جێگه‌ی تۆڵه‌كه‌ی ده‌گرێته‌وه.[1]

٤- په‌سه‌ندكردنی له‌لایه‌ن سه‌رۆكی وڵاته‌وه.

٥- خاوه‌نی خوێنه‌كه پاشگه‌زنه‌بێته‌وه له تۆڵه‌وه بۆ خوێنه‌سندن یان وازهێنـان لـه سزا ئه‌سڵیه‌كه(تۆڵه) و جێگره‌وه‌كـه‌ی (خوێنسـه‌ندن)، له‌بـه‌ر ئـه‌وه‌ی قورئـانی پیرۆز یه‌كێك له‌م سێ هه‌ڵبژاردنه‌ی داناوه بـۆ خـاوه‌نی خوێنه‌كـه كـه ئه‌مانـه‌ن:

---

[1] وای ده‌بیـنم كـه ڕاسـتی ئه‌وه‌یـه هه‌ڵبژاردنـه‌كان بهێڵرێنـه‌وه، جـا ده‌وڵـه‌ت مـافی ئـه‌وه‌ی بـۆ سزای گونجاو دابنێ له‌بـه‌ر ئـه‌وه‌ی تـاوان كـار ده‌سـتدرێژی كردۆتـه سـه‌ر دوو مـاف (گشـتی‌و تایبه‌تی) خۆ ئه‌گه‌ر خاوه‌نی خوێنه‌كه وازی له مافی تایبه‌تی هێنـا، ئـه‌وا سـزادانی ده‌سـتدرێژی كردنی بۆ سه‌ر مافی گشت ده‌مێنێـه‌وه

داواكردنى جێبەجێكردنى تۆڵە یاخود پاشكەزبوونەوە بۆ خوێنسەندن یاخود وازهێنان لە هەردوكيان، خواى پەروەردگار لە قورئانى پیرۆزدا دەفەرموێت: (وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا)[1] (السلطان) بریتى یە لە هەڵبژاردنى یەكێك لە سێ هەڵبژاردنەكە، ئەوەى شایەنى باسە ئەو هەڵبژاردنە نامێنێت ئەگەر تاوانكار پێشتر تاوانى لەسەر گیانى كەسێك یاخود كەمتر كردبێ، لەبەر ئەوەى لەو بارودۆخەدا شایەنى هاوكارى كردنو بەزەیى پیاهاتنەوە نیە، بەبەڵگەى ئەوەى كە مەترسى دارە لەسەر كۆمەڵگە.

بناغەى حیكمەت لەو سەرپشكیەدا بریتییە لە رێساى (زیان بە قازانج كردنە= الغرم بالغنم) جا ئەو خەمو نارەحەتیانەى لە ئەنجامى تاوانەكەدا توشى خێزانى تاوان لەسەر كراو دەبێت، زۆر لەوە زیاترە كە توشى كۆمەڵگە دەبێت كە دەوڵەت نوێنەرایەتى دەكات، جا مافەكەى لە سزادان زیاترە.

بەڵام لەسەردەمى ئێستادا زۆربەى یاساكانى سزادان دان نانێ بەو (السلطان)ەى كە لە قورئانى پیرۆزدا هاتووە سەبارەت بە خاوەنى خوێنەكە، لەسەر ئەو بناغەیەى كە سزادان لە دیاردەكانى سەروەرى دەوڵەتە، تاك دەستى تێوەرنادات، چونكە ئەو دەستوەردانە دەستدرێژیە بۆ سەر سەروەرى دەوڵەت.

ئەوەى شایەنى باسە بۆ كوشتن سزاى ترى بەدوادا دێت كە بریتیە لە بێبەش كردنى بكوژەكە لە میراتو بەجێ ماوى كوژراوەكە, ئەگەر لە میراتگرانى بوو، وە لە راسپاردەكانى ئەگەر راسپاردەى بۆ كردبوو، وە لە وەقفەكەى ئەگەر وەقفى بۆكردبوو، بەومەرجەى كوشتنەكە ئەنقەست یاخود نیمچە ئەنقەست بێت[2]، دانایىو

---

[1] سوورەتى ئیسرا/٣٣.

[2] لەلاى مالیكى سزاى كوشتنى نیمچە ئەنقەست (القصاص) سزادانەكە وەكو ئەنقەست، لەلاى كەسانى تریش خوێنسەندن هەیە، لەلاى (حەنەفى) سزادانى كوشتن بە هۆكار (الدیة)یەكە دەكەوێتە سەر (العاقلة)= كەسى باوكى، الاختیار لتعلیل المختار ٣٥/٥ پێشەوا عبدالله الموصلي.

فەلسەفەش لەوانەدا پاراستنی گیانی بێ تاوانانە، لەبەر ئەوەی هەركەسێك پەلە لە شتێكدا بكات لە پێش هاتنی كاتی خۆی دا بەبێبەش كردنی سزا دەدرێت.

دوهەم: خوێنسەندن

بریتی یە لە سزای بنەڕەتی سەرەكی بۆ كوشتنی بە هەڵە بە كۆڕاو، كوشتنی نیمچە ئەنقەست لەلای هەندێ لە شەرعزانان، وەكو ئەبو حەنیفەو شافیعیو ئەحمەد، خوێنەكەش دەكەوێتە سەر كەس‌و كار و بەرپرسانی بكوژەكە، بەڵگەشیان داوەری كردنەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) كاتێ دوو ژن لە هۆزی (هونیل) بوو بە شەڕیان، یەكێكیان بەردی گرتە ئەوی تریان، خۆیو منداڵەكەی سكیشی كوشت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوەری كرد بە خوێنسەندنی كوژراوەكە لەسەر كەس‌و كارو بەرپرسانی(عاقلە) ژنە بكوژەكە، لەكاتێكدا كوشتنەكە نیمچە ئەنقەست بوو، لەبەر ئەوەی لێدانەكە بووە هۆی مردنی.

سێهەم: كەفارەت (الكفارة)

ئەوەش دادەنرێت بە سزای بنەڕەتی بۆ كوشتنی نیمچە ئەنقەست، كە بریتی یە لە ئازادكردنی كۆیلەیەك، ئەگەر ئەوە دەست نەكەوت یاخود ئەگەر بەهاو نرخەكەی نەبوو كە بیكات بە خێر، ئەوا لەسەری پێویستە دوو مانگی لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت، جا ڕۆژووگرتنەكە سزایەكی جێگرەوەیە.

سزای كوشتنی بەهەڵەش بریتی یە لە خوێنسەندن كە لە ئیسلام دا بەسەد حوشتر دیاریكراوە، یاخود شتێك یەكسان بێ بەو، ئەوەش بەرزترینی ڕادەیە، دەكرێ ڕێكەوتن بكرێ بەكەمتر لەوەش، بەڵام جیاوازی هەیە لەنێوان خوێنسەندنی نیمچە ئەنقەست و بەهەڵە، لە یەكەمدا پەسەندتر ئەوەیە كە خوێنسەندنەكە لەسەر تاوانكارەكەیەو، لەدووهەم دا خوێنسەندنەكە لەسەر كەس‌و كار و بەرپرسێتی، لەیەكەمدا بە پێچەوانەی دوهەمەوە بەشبەشكردنی دروست نیە، خوێنی هەڵەش بەكۆڕای زانایانی شەرع دەكەوێتە سەر بەرپرس(العاقلە)ی تاوانكارەكە.

## مەرجەكانى پێویست بوونی خوێنسەندن لەسەر بەرپرسەكە(العاقلە).

(عاقلە) بريتيە لەو خانەوادەو هۆزەی كە تاوانكارەكەی تێدايە، لە حاڵەتى نەبونيان، ئەوا ئەو تاوانكارە سەر بە چ دامەزراوەيەكە وەكو نەقابەو وەزارەت ياخود هاوشێوەيان، ئەوانە لێپرسراون لە خوێندانەكە.

ئەگەريش هيچ كامێك لەوانە بونيان نەبوو ئەوا خوێنەكە دەكەوێتە سەر (گەنجينەی گشتى) دەوڵەت، فەلسەفەش لەوەدا كە (گەنجينەی گشتى) خوێنەكە لە ئەستۆ دەگرێت ئەوەيە لەوبارەدا، ئەگەر ئادەميزادێك مردو ميراتى هەبوو، بەڵام ميراتگرى نەبوو، ئەوا ميراتىو بۆماوەكە بۆ (گەنجينەی گشتى) دەبێت، سەرچاوەی كەفارە تيش قورئانى پيرۆزە، بۆ ئەوەی خوێن بكەوێتە سەر خانەوادەو هۆزى تاوانكارەكە چەند مەرجێك هەيە، ئەمانە گرنگترينيانن:

١- دەبێت كوشتنەكە بەهەڵە بێت، خوێنسەندنى نيمچە ئەنقەست بەلاى ڕاى پەسەند ترەوە، ياخود جێگرەوەی خوێندان لە سامانو دارايى تاوانكار دەبێ.

٢- تاوانەكە بەدان پيانانى تاوانكار نەسەلمێنرێت، چونكە دەگونجێت ڕێكەوتن لەنێوانى تاوانكارو خاوەنى خوێنەكەدا بوبێت، تا ئەو كوشتنەی پێويستى بە تۆڵەيە، بە كوشتنى هەڵەی دابنێن، بۆ بەدەستهێنانى خوێنەكە.

### سروشتى خوێنسەندن

ئايا خوێنسەندن سزايە ياخود قەرەبووە؟ هەندێ بۆ ئەوە چوون كە بە سزاى دابنێن، بەڵام هەندێ تر واى دەبينن كە قەرەبوو كرنەوەيە، بەڵام لەڕاستى دا نە سزاى پوختەو نە قەرەبووكردنەوەی پوختە، بەڵكو سيفاتەكانى سزادانو سيفاتەكانى قەرەبووشى تيادا كۆدەبێتەوە، وەكو ئەوەی كە دێت:

**أ- ئەو سيفەتانەی سزادان كە لە خوێنسەندندا دا هەن:**

١- حوكم لەسەردانى لەسەر داواكارى تاوان لەسەر كراو يان ميراتگرەكانى ناوەستێ، بەڵكو مافى دادوەرە كە ڕاستەوخۆ حوكمى لەسەر بدات.

٢- لە کاتێکدا کە خاوەنی خوێنەکە لە خوێنەکە خۆش ببێ، ئەوا سزادانی دەستدرێژی سەر مافی گشتی جێگەی دەگرێتەوە کە سزایەکی ڕووشکێنی یە، لەبەر ئەوەی تاوانکار دەستدرێژی کردووە بۆ سەر دوو ماف (گشتیو تایبەتی)، بەڵام لە قەرەبووکردنەوەدا ئەگەر زیان لێکەوتوو لێ ی خۆش بوو، هیچ شتێکی تر جێگەی ناگرێتەوە.

٣- خوێنسەندن، لەلایەن دانەری شەرعەوە پێشتر بڕیاری لەسەر دراوە، بەڵام قەرەبوو تەنها بە بڕیاری دادگا یان بەڕێکەوتنێکی ڕازی بوون دەبێت، لەدوای ڕوودانی هۆکارەکەی.

٤- بڕەکەی ناگۆڕێت بە جیاوازی کاتو شوێنو کەسەکان، لەڕووی بچووکیو گەورەییو هەژاریو دەوڵەمەندی و بەهێزیو بێ هێزی و پلەی سیاسیو کۆمەڵایەتی و هاوشێوەیان.

**ب-سیفەتەکانی قەرەبوو لە خوێنسەندندا:**

١- ئەوە دارایی یەکی تایبەتی پوختە بۆ تاوان لەسەرکراو ئەگەر لە ژیان دا مابوو، ئەگینا بۆ میراتگرەکانێتی، ئەگەریش سزایەکی پوخت بوایە ئەوا دەگەڕایەوە بۆ گەنجینەی گشتی وەکو باجی دارایی لە سزاکان دا.

٢- تاوان لەسەرکراو یاخود میراتگرەکانی بۆیان هەیە لێ ی خۆش ببن، خۆ ئەگەر سزای پوخت بوایە ئەوا ئەو لێ خۆش بوونە دروست نەبوو.

دەقی ئایەتی پیرۆزی قورئانو سوننەت هاتووە بە هەلگرتنی تاوان (بەرپرسیارێتی سزادان) لە هەڵە، نەبوونی تاوانیش نەبوونی سزا دەخوازێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ)[1]، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمویەتی: (رُفِعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأُ وَالنِّسْيَانَ وَمَا

[1] سورە الاحزاب\٥.

اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ).[1]

ئەگەر سزا بوایە ئەوا نەدەکەوتە سەر بەرپرسانی (العاقلة)[2] بەپێی فەرمودەی خوای پەروەردگار: (وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى).

## فەلسەفەی خوێنکەوتنە سەر باوانی تاوانکارەکە

فەلسەفەی ئەو بەرپرسیارێتی یەکە بکەوێتە سەر بەرپرسانی تاوانکارەکە ئەمانەی خوارەوەیە:

١- یارمەتی دانو هاوکاری کردنو دەستبارگرتنە.

٢- بکوژی بەهەڵە لە دەروونەوە سزا دراوە، کاتێ هەست بە ئەنجامەکانی هەڵەکەی دەکات، جا بۆ ئەو سزا دەرونیەی کە هەیەتی سزای مادی بۆ زیاد ناکرێت، بە پێ هەلگرتنی بەرپرسیارێتی دانی خوێنەکە.

٣- لەوانەیە بکوژەکە هەژار بێت و نەتوانێ خوێنەکە بدات، کە ئەندازەکەی زۆرە، جا لەو کاتەدا نەدانی خوێنەکە دەبێتە هۆی تۆڵەسەندنەوە لێی لەلایەن میراتگران یاخود خزمانی کوژراوەکەوە، بەو شێوەیە دەگەرێنەوە بۆ ژیانی سەرەتایی لە دروستبونی دوژمنایەتی بەردەوام لەنێوان خزمانی بکوژو کوژراودا.

٤- بەرپرسانی تاوانبارەکە بەشێکی لێپرسراوێتی رووداوەکە(کوشتی بەهەڵە) لە ئەستۆ دەگرن، لەسەر بنەمای رێسای شەرعی کە لەسەر زمانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) هاتووە کە فەرموویەتی: (كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه)[1].

---

[1] سنن ابن ماجە، بەرگی١ لاپەرە٦٥٩ ژمارە٢٠٤٣.و سنن البيهقي الكبرى، بەرگی٦ لاپەرە٨٤ ژمارە١١٢٣٦، موارد الظمآن ، بەرگی١ لاپەرە٢٦٠ ژمارە ١٤٩٧.

[2] العاقلة لە (عقل)ەوە وەرگیراوە ئەوەش رێگری کردنە لەبەر ئەوەی (الديه= لەبری) قەدەغەی تەشەنەکردنەکانی رووداوی کوشتنەکە دەکات، یا لە (عقل الابل) وەرگیراوە واتە: بەستنەوەی وشتر، لەبەر ئەوەی ئەو لایەنەی (لەبری)یەکەی دەدا، حوشترەکەی لەبەردەمی ماڵی میراتگری تاوان لەسەر کراوەکەدا دەبەستەوە لەکاتی پێدانی دا.

## بەراورد لە نێوانی تاوانە سنورییەكان و تاوانەكانی خوێنسەندن:

ئەم دوو لەچەند لایەكەوە جیاوازن گرنگترینیان:

١- مافی دەستدرێژی بۆكراو لە تاوانی سزادان و خوێنسەندندا مافێكی هاوبەشە لەنێوانی خێزانی تاوان لەسەركراو و كۆمەڵگەداو، مافی خێزان زاڵە، لەبەر ئەوە مافی تایبەتی لە سزاكەدا زاڵە، بەلام مافی گشتی (یاخود مافی خوای پەروەردگار) لە تاوانە سنورییەكاندا زاڵە، ئەگەر مافە دەستدرێژی لەسەر كراوەكە هاوبەش بێت.

٢- سنورەكان، بە بارودۆخە توندو سوكەڵەكانەوە كاریگەر نابن، بە پێچەوانەی تۆڵەو خوێنسەندنەوە، لە تۆڵە(القصاص)دا نابێ خاوەن خوێنەكە لێی خۆش بێ، ئەگەر هاتوو بكوژەكە خوی بە تاوانكردن گرتبێ، لەخوێنسەندنیشدا ئەگەر لەجیاتی تۆڵە بوو یاخود لە نیمچە ئەنقەست بوو، خوێندان ناكەوێتە سەر بەرپرسانی، بەڵكو بەرپرسیار لێی تەنها بكوژەكە خۆیەتی، لەبەر ئەوەی شایەنی ئەوە نیە یارمەتی پێشكەش بكرێت، مادام مەبەستی تاوانكاری لەلای ئەو هەبێت لەكاتی ئەنجامدانی تاوانەكەدا.

٣- لە تاوانەكانی سزادان و خوێنسەندندا چوونەناویەك نیە، ئەگەر ئادەمیزادێك زیاتر لە كەسێكی بەهەڵە كوشت، خوێنسەندن بۆ هەر كوژراوێك لەسەر بەرپرسانی بكوژەكە پێویست دەبێت، بە پێچەوانەی سنورەكانەوە، هەروەكو لە ڕوونكردنەوەی تایبەتمەندیەكاندا پێشتر هاتووە.

٤- تاوانە سنورییەكان هەموویان بە ئەنقەستن، بە پێچەوانەی تاوانەكانی تۆڵە و خوێن، لەوانەیە بە ئەنقەست بێ و دەكرێ بەهەڵە بێت، مەبەستی تاوانكاری تیادا نابێت.

---

[1] صحیح البخاری، بەرگی١ لاپەڕە\٨٤٨ ژمارە\٢٢٧٨، صحیح مسلم، بەرگی٣ لاپەڕە\١٤٥٩ ژمارە\١٨٢٩.

٥- تاوانەکانی تۆڵەو لەبری لە شەریعەتی ئیسلام دا بەبەسەرچوون ناکەوێ، لەبەر ئەوەی مافی تایبەتی تیادا زاڵە بە پێچەوانەی تاوانە سنوریەکانەوە.

٦- تاوانە سنوریەکان سولح وەرناگرێ، بە پێچەوانەی تۆڵەو خوێنەوە.

سزا سنوریەکان جۆراوجۆرن، بە پێچەوانەی تاوانەکانی تۆڵەو خوێنسەندن (القصاص والدیة).

تۆڵەو[1] خوێنسەندن بە تەوبەکردن لە کۆڵ ناکەون، لەبەر ئەوەی مافی تایبەتی تیایاندا زاڵە، بە پێچەوانەی سنوریەکانەوە کە هەندێ لە سزاکان بە تەوبەکردن دەکەون، وەکو لە تاوانی (بوختانکردن)دا هەیە سەبارەت بە شایەتی و یاخیێتی(فسق).

٧- سزای سنوری سزادانی رووتە، بەڵام (خوێنسەندن) سروشتێکی دوو لایەنی هەیە، سیفاتی سزادان‌و سیفاتی قەرەبووکردنەوەی تیادایە، ناچاریش لە بەربەستەکانی بەرپرسیارێتی تاوانکاری یە لە هەندێ تاوانی سنوریدا، وەکو تاوانی زینا، وە لە هۆکارەکانی رێپێدانە لە هەندێکیاندا وەکو خواردنەوەی سەرخۆشکەرەکان لەژێر پاڵەپەستۆی ناچاری دا، وەکو لە هەردوو بارودۆخی تینوێتی‌و برسێتی زۆردا، بەڵام لە تاوانەکانی تۆڵەدا ناچاری بارودۆخی سوکەڵەن بۆ سزادان.

٨- زۆر لێکردن لادەری سزا سنوریەکانە، لەبەر ئەوەی تاوانە سنوریەکان هەموویان مەبەستێن‌و زۆرلێکردنیش دەبێتە هۆی دروستبوونی گومان، گومانیش سزای سنوری لادەبات، بەڵام لەتاوانی کوشتنی بەئەنقەستی دوژمنکاری دا لەژێر پاڵەپەستۆی زۆر لێکردن دا، بابەتێکە راجیایی لەسەرە لەنێوانی زانایانی شەرعزاندا، چوار بۆچوونی لەبارەوە هەیە:

---

[1] القصاص= ئەوەیە تاوان بار سزای تاوانی هاوچەشنی لێ بستێنرێ، بڕوانە قاموسی رستە، مەلا مەحمودی گەلآلی، لاپەڕە\٢١٢٦.

**بۆچوونی یەکەم:** تۆڵە لە هەردوو زۆرکارو زۆرلێکراو دەکرێتەوە، ئەوەش مەزهەبی مالیکی[1]و حەنبەلی[2] یەکانەو لە مەزهەبی شافیعی[3] پەسەنترەکەیانە. ئەو بۆچوونەش پشت بە چەند بەڵگەیەك دەبەستیّ لەوانە:

أ- زۆرکار بوە هۆی شتێك کە مردنی لێکەوتەوە، وەکو ئەوە وایە کەسێك بخرێتە ناو بیرێکەوە ئاژەڵێکی درندەی تیادا بیّو پەلاماری بدات، یاخود بیخاتە ڕووبارێك یا دەریایەکەوەو بیشزانیّ ئەوەی خراوەتە ئاوەکەوە مەلە نازانیّ، ئەو کەسەی زۆری لیّ کراوە، سەرپشك بێت لەنێوانی هەڵبژاردنی ئەوەی هەڕەشەی پیّ لیّ کراوەو کوشتنی ئەوەی زۆری لیّ کراوە بۆ کوشتنی، جا دوهەمیان هەڵبژێریّ و خۆی لەپێشتر دابنیّ.

ب- هەردوکیان هاوبەشن لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا، ئەویان کە بۆتە هۆی ئەنجامدانی تاوانەکە، ئەویشیان ڕاستەوخۆ بە کارەکە هەستاوە، هاوبەشەکانیش یەکسانن لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی تاوانێکدا کە هاوبەشییان کردووە لە ئەنجام دانی دا.

**بۆچوونی دوهەم:** تۆڵە لە هیچ یەکیّ لەوان ناکرێتەوە، بەڵام زۆرکارەکە خوێنی دەکەوێتە سەر. ئەوەش بۆچوونی ئەبو یوسفی هاوڕێی ئەبو حەنیفەیەو بەڵگەشی ئەوەیە کە زۆرکارەکە بە بڕیار بکوژە نەك بەڕاستیو زۆرلێکراوەکە بکوژی ڕاستی یە نەك بە بڕیار، تۆڵەش لەسەر کەسێکە بەڕاستیو حوکمیش بکوژ بێت[4].

**بۆچوونی سێهەم:** تۆڵە لەسەر زۆرکارە نەك زۆرلێکراو لەبەر ئەوەی زۆر لیّ کردن بیانویەکی بەربەستە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (رُفِـعَ عَنْ أُمَّتِـي

[1] شرح الخرشي ٩/٨.
[2] المغنى لا بن قدامه ٦٤٥/٧.
[3] تحفة المحتاج ٣٨٨/٨.
[4] پەراوێزی ابن عابدين ١٣٦/٦.

الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ)[1] ئـەوەش بۆچـوونی ئـەبو حەنیفـەو موحەممـەد الشیبانی[2] هاورێیەتی.

**بۆچوونی چوارەم**: تۆڵە لە زۆرلێکراو دەکرێتەوە، لەبەر ئەوەی بکەری ڕاستی یە بەوەی هەستاوە بە ئەنجامدانی تاوانەکەو، زۆرکـار بـە بەنـدکردن هـەتا مـردن سـزا دەدرێت، ئەوەش ڕاو بۆچوونی شیعەی ئیمامی[3] و چەند کەڵە زانایـەکن لـە مەزهـەبی حەنەفی[4].

لە ڕاو بۆچوونی ئێمەش دا زۆرکار شایانی تۆڵەلێکردنەوەیە، بەڵام زۆرلێکراو ئەگەر وای بۆ دەچوو کـە پێویسـتە گوێڕایـەڵی فـەرمانی زۆرکـار بکـات، ئـەوا نـە لـەبواری تاوانکاریداو نە لەبواری مەدەنیدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت، بەڵام ئەگەر دەیزانی ئەو لەسەر هەق و ڕاستی نیە لە زۆرلێکردنەکەدا، ئەوا پێویستە سزا بدرێت بـە سـزای ڕووشکێنی، لەبەر ئەوەی مانەوەی خۆی پێ چاکتر بووە بەسەر مانـەوەی کەسـانی تردا.

## توانای گۆڕانی تاوانەکانی تۆڵەو خوێنسەندن بۆ کارێکی ڕەوا

ئەو تاوانانە دەگۆڕێن بۆ کاری ڕێپێدراو و لە سیفاتە تاوانکاریەکانیان دادەڕنێن بە هۆکاری زۆر، هەروەکو لە بەشەکانی داهاتوودا هەندێکیان بەدرێژی دێن لەوانە:

ئەگەر کوشتنەکە یاخود بریندارکردنەکە تۆڵەی پێویست دەکرد و، ئایەتی قورئان لەسەر ڕێپێدانی، هەرچەندە تۆڵەیان لەسەرە، وەك دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَن

---

[1] ابن حزم المحلى ١٩٣/٥ صحيح.

[2] بدائع الصنائع للكاساني ٤٤٨٨/٩.

[3] الخلاف الفقه الطوسي ٣٥١/٢.

[4] سوورەتی بەقەرە ١٧٨، البدائع سەرچاوەی پێشوو ٤٤٨٨/٩.

اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ)[1] ئه‌و ناوانه‌ی له‌م ئایه‌ته‌دا هاتوون تێگه‌یشتنی پێچه‌وانه‌یان نیه‌، به‌لکو ئه‌گه‌ر که‌سێکی ئازاد کۆیله‌یه‌کی کوشت تۆڵه‌ی لێ ده‌سه‌نرێته‌وه‌، هه‌روه‌ها به‌ پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌وه‌، ئه‌گه‌ر نێرینه‌یه‌ك مێینه‌یه‌کی کوشت له‌تۆڵه‌ی ئه‌و ده‌کوژرێته‌وه‌ هه‌روه‌ها به‌ پێچه‌وانه‌وه‌، به‌لگه‌ش له‌سه‌ر ئه‌وه‌:

ئه‌گه‌ر تێگه‌یشتنه‌ پێچه‌وانه‌که‌ له‌گه‌ڵ ده‌قه‌که‌ نه‌گونجا، هه‌روه‌کو له‌و ئایه‌ته‌دا هاتووه‌ (ئه‌گه‌ر وای دابنێین بوونی هه‌یه‌)، هه‌روه‌کو له‌ فه‌رمووده‌ی خوای په‌روه‌ردگاردا هاتووه‌: (وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ) ده‌قه‌که‌ پێش چه‌مکه‌ پێچه‌وانه‌که‌ی ده‌خرێت.

ئه‌و ئایه‌ت سه‌باره‌ت به‌ دوو هۆز هات که‌ له‌دوای شه‌ڕکردنیان هاتنه‌ ناو ئیسلامه‌وه‌، به‌هێزه‌که‌یان وای ده‌رده‌خست که‌ ده‌یه‌وێ له‌بری کۆیله‌یه‌ك که‌سێکی ئازاد بکوژێ و له‌ جیاتی مێینه‌یه‌ك نێرینه‌یه‌ك بکوژێ له‌ تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه‌دا، خوای په‌روه‌ردگاریش ده‌فه‌رموێت(وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)[2] به‌لگه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی تێگه‌یشتنی پێچه‌وانه‌ نیه‌ بۆ ئه‌و ناوانه‌ی که‌ له‌ ئایه‌تی پێشوودا هاتوون.

تێکڕای فه‌رمووده‌که‌ی خوای په‌روه‌ردگار (وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنْفَ بِالْأَنْفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَنْ تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)[3].

ئه‌گه‌ر کوشتنه‌که‌ یاخود بریندار کردنه‌که‌ بۆ به‌رگری کردنی شه‌رعی تایبه‌تی یاخود گشتی بوو، خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ: (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ).[4]

---

[1] سووره‌تی به‌قه‌ره‌ ١٧٨.

[2] سووره‌تی به‌قه‌ره‌ ١٧٩.

[3] سووره‌تی مائیده‌ ٤٥.

[4] سووره‌تی به‌قه‌ره‌ ١٩٤.

هەڵگەڕانـەوە لـە ئیسـلامو وەسـتانەوە لـە دژی ئیسـلام بـەهاوکاریکردن لەگـەڵ دوژمنانی ئیسلامو موسڵمانان، پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (مـن بـدل دینـە فاقتلوە)[1] ئەوە لە بارەی مورتەد (لەدین هەڵگەڕاوە) هاتووە کـە لـەدوای ئـەوەی لـە ئیسلام هەڵگەڕایەوە یارمەتی هاوبەش پەیداکەرانی دا، جا کوشتنەکەی تەنها بەهۆی هەڵگەڕانەوەکەیەوە نەبوو.

[1] الألباني، إرواء الخليل ١٢٥/٨ اسناده صحيح على شرط الشيخين.

# جێباسی سێ هەم:
# تاوانە ڕووشكێنەكان

تاوانە ڕووشكێنەكان، سزایەكی ڕووشكێنی یە لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانەری سەروەختەوە لەرووی چۆنیەتیو چەندێتی.

جا وەلی ئەمر (سەرۆكی وڵات) بە یارمەتی لەگەڵ ئەهلی شورا (پەرلەمان) تازەكردنەوەی ئەو سزایە دەگرنەئەستۆ، بە شێوەیەك بگونجێ لەگەڵ مەترسی تاوانەكەو تاوانبارەكەدا، لەبارەی سروشتی یەوە دابەش دەبێت بۆ سێ جۆر.

**جۆری یەكەم:** ئەو تاوانانەی كە دەقێ قورئانو سوونەتی پێغەمبەر (ﷺ) یان لەسەر هاتووە بەبێ ئەوەی سزاكەیان باس كردبێت وەكو ئەمانە:

تاوانی سیخوڕیكردن دەقی ئایەتی قورئانی لەسەر هاتووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَلاَ تَجَسَّسُوا)[1].

تاوانی شایەتی دانی درۆ، لە ئایەتی پیرۆزی قورئاندا دەقی لەسەر هاتووە (فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ)[2].

تاوانی فێڵو گزی كردن لە پێوانو كێشان دا دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆزی لەسەرە (وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ/ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ)[3].

---

[1] سوورەتی حوجورات ١٢.

[2] سوورەتی حەج ٣٠.

[3] سوورەتی موتەففین ١-٣.

تاوانی زەوت کردنو تالآن کردن کە لە بارەیەوە خوای پەروەردگار دەفـەرموێت: (وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ)[1].

تاوانی پاوان کردن دەقی فـەرموودەی پێغەمبـەری خـوای (ﷺ) لەسـەر هـاتووە (الجالب مرزوق والمحتكر ملعون ولا يحتكر إلا خاطيء)[2].

تاوانی بەرتیل، پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی (لعـن الله الراشـي والمرتشـي والرائش)[3].

**جۆری دووەم**: تاوانی سنوریو تۆڵە کە مەرجەکانی تەواو نەبوویێ وەکـو تـاوانی زینا ئەگەر بە چوار شایەت نەسەلما، یـاخود بـە چـوار جـار دان نـان بـە تاوانەکـەدا لەبەردەم دادوەردا، بەڵام نیشانەی تر هەبێ لەسەر روودانـی، جـا سـزادانی سـنوری هەڵدەگیرێتو سزادانی رووشکێنی جێگەی دەگرێتەوە، وەکـو تـاوانی دزی لـەنێوانی بنەچەو لقەکاندا یاخود لەنێوانی ژنو مێـرد دا، کـە گومـانی حـەڵاڵی تیـادا بێـت، وە تاوانی کوشتنی بە ئەنقەستی دوژمنکاری ئەگەر خاوەنی مافەکـە لـە تۆڵەکـە خـۆش بوو، بە هەمان شێوە هەموو تاوانێکی سنوری کە گومانی تیادا بێتە بەر دەگۆڕێت بۆ تاوانی رووشکێنی.

**جۆری سێیەم**: تاوانە تازەداهاتووەکان، بریتین لەو تاوانانـەی کـە شـەرع دەقـی لەسەر بە تاوان دانانی و لەسـەر سزاکەشـی دانـەناوە، وەکـو ئـەو تاوانانـەی کـە لـە داهێنراوی پێشکەوتنەکانی ژیانە، وەکو تاوانی سەرپێچی یـەکانی هاتوچۆو تـاوانی قاچاخێتیو شتانی تریش کە لە رابردووی دووردا بوونیان نـەبووە. ئەوانـە لـە دەقـە گشتی یەکانی قورئانی پیرۆزو سوننەتەکانی پێغەمبەری خـوادا (ﷺ) هەڵدەهێنرێن، کاربەدەست لەلایەنی یاسادانەرەوە دەسەڵاتی پێ دراوە کە هەرکارێك یاخود وتەیەك

[1] سوورەتی بەقەرە ۱۸۸.
[2] سبل السلام ۳/۳۲.
[3] سبل السلام ٤/١٦٤.

زیان بدات لە بەرژەوەندی گشتی بە تاوانی دابنیّو سزایەكی وەهای بۆ دیاری بكات كە لەگەڵ قەبارەو مەترسی یەكەی دا بگونجیّ.

سەرپێچی یەكانی هاتوچۆ (مرور) دەبێتە هۆی ئەوەی گیانو سامان بەهیلاكا بەرێت لەبەر ئەوە یاسادانەری كەسی بە تاوانی داناوەو بەپێی یاسای هاتو چۆ سزاكانی بۆ دیاری كردووە.

تاوانی بەقاچاخ بردن(التهریب) لە ناوەوەی وڵاتەوە بۆ دەرەوەی وڵات یاخود بە پێچەوانەوە زیان دەگەیەنیّ بە ئابووری نیشتمان لەبەر ئەوە ماف دەداتە یاسادانەری كەسی كە بە تاوانی ئابووری لە قەڵەمی بدات لەگەڵ دیاری كردنی سزاكانیو بەو شێوەیە.

## دەستەڵاتی كاربەدەست (ولي الأمر) لە بەتاوان دانان و رووشكاندن دا

ئەگەر لە مافی كاربەدەست بێت دەستەڵات دارێتی ڕووداوە تازەكانو سزادانەكان ئەوا ئەو دەسەڵاتدارێتی یە ڕەها نی یە بەڵكو پابەندە بەچەند پابەندبوونێكەوە گرنگەكانیان ئەمانەن:

١- تاوانێك یاخود سزادانێك ڕوونادا كە نەیاربێت لەگەڵ دەقێكی ڕاشكاو لە قورئانی پیرۆز یاخود سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یاخود سەرپێچی كردن بێت بۆ كۆی زانایانی شەرع.

٢- دەبیّ هۆكارە پاڵنەرەكە پارێزگاری كردن بێت لە بەرژەوەندی گشتی.

٣- سروشتی گشتی بۆ تاوان باركردنو ڕووشكێنی بریتیە لە دادپەروەریو یەكسانی بەبیّ ئەوەی خزمەتی چەند كەسێكی تێدا بێت لەسەر حسابی چەند كەسێكی تر.

٤- گونجاندن هەبێت لەنێوانی قەبارەی تاوانو قەبارەی سزادا.

٥- نابێ دەسەڵات دار بە تەنیا یاسا دابنێ بەڵکو لەسەری پێویستە ڕاوێژ بە کەسانی پسپۆڕو تایبەتمەند بکات لەو بوارەداو پشت ببەستێ بە ئەهلی ڕاوێژو ئەهلی (الحل والعقد).

٦- ئاگادار کردنەوە لەپێش سەرپێچی کردنو سزادان داو ئاگادارکردنەوەی گشت، بە هەموو ئەو یاسایانەی کە دادەنرێن لە تاوانو لە سزاکەی لە ڕێگای هۆکارە ڕەسمی یەکانی ڕاگەیاندنەوە لەبەر ئەوەی شەریعەتی ئیسلامی لەپێش یاساکانەوە دانی ناوە بە بنەما شەرعی یەکان دا (نە تاوان هەیەو نە سزادان هەیە مەگەر بەدەق).

ئەوەی شایەنی باسە دادوەرخاوەنی دەستەڵاتی داهێنانی تاوان یاخود سزای نیە لەبەر ئەوەی ئەو دەسەڵاتە شەریعەتی ئیسلامی کورتی کردۆتەوە لە (ولی الأمر= دەسەڵات داردا) بە هاوکاری ڕاوێژکاران.

**چەند نمونەیەك لە پیادەکردنە فیقهی یەکان لە ڕووشکێنی یەکان دا**

لە فیقهی مالیکی دا: (دەسەڵاتدار ڕووشکێنی دەکات لەبەر سەرپێچیی خوا وەکو خواردن لە ڕەمەزان دا (واتە لە ڕۆژەکانی ڕەمەزان دا) بەبێ بوونی بیانوویەك، یاخود لەبەر مافی ئادەمیزادێك وەکو جنێودان بە کەسێکی تر یاخود ئازار دانی بەشێوەیەك، ڕووشکێنی تیایدا دەگەڕێتەوە بۆ پێشەوا)[1].

لە فیقهی حەنەفی دا: دەسەڵاتدار بۆی هەیە وەکو سیاسەت دز بکوژێت کاتێك زانی پشێوی لەوڵاتدا دروستدەکات، ئەوە لە کاتێکدا کە بگەڕێتەوە (چەندبارە دزی بکاتەوە).[2]

---

[1] شرح الخرشي ١١٠/٨.

[2] رد المحتار ٣١٩/٦.

لـه فیقهـی شـافیعی دا: (هه‌ركه‌سـێك سه‌رپێچـیه‌كی كـرد كـه سـزای سـنوری و كه‌فاره‌تیشی تیادا نـه‌بێت، ئـه‌وا ده‌سـه‌ڵات بـه‌پێی ئـه‌وه‌ی ده‌ی بینـێ ڕووشـكێنی ده‌كات)[1].

له فیقهی جه‌عفه‌ری دا: (ئه‌گه‌ر پیاوێك نێربازی كـردو كاره‌كـه‌ی تـه‌واوكرد، ئـه‌وا كوشتنی له‌سه‌ر پێویست ده‌بێـت، پێشـه‌واش سه‌رپشـكه لـه‌نێوان كوشـتنی یـاخود دیوارێكی به‌سه‌ردا بڕوخێنێ یاخود له شوێنێكی به‌رزه‌وه فڕێی بداته خواره‌وه)[2].

وشه‌ی (الإمام= پێشه‌وا) له‌و ده‌قه فیقهی یانه‌دا مه‌به‌ستی سه‌رۆكی وڵاته.

له فیقهی حه‌نبه‌لی دا: (ڕوشكاندن بریتیه له ئه‌ده‌ب دادان، لـه هـه‌موو سه‌رپێچـی یه‌ك پێویسته كه نه سزای سنوری‌و نه كـه‌فاره‌تی تیادایـه، كه‌مترینه‌كه‌شـی دیـاریی نه‌كراوه، له‌وه‌دا ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئیجتیهادی سه‌رۆكی وڵات‌و دادوه‌ر، كه چۆنی ده‌بینن و  بارودۆخی كه‌سه‌كه چی ده‌خوازێت)[3].

**به‌راورد له‌نێوانی سنورییه‌كان و ڕوشكاندنه‌كان**

١- سزا سنوریه‌كان سزاكه‌یان به‌ده‌قه شه‌رعییه‌كان له قورئان‌و سوننه‌ت دا دیـاری كـراوه، بـه پێچـه‌وانه‌ی ڕووشـكاندنه‌كانه‌وه، كـه كـاری داهێنـان‌و دیـاریكردنی سزاكانی به‌جێهێڵراوه بۆ ده‌سته‌ڵاتی یاسادانانی سه‌رده‌م.

٢- ڕووشكاندن به‌پێی بنـه‌ڕه‌تی یه‌كـه، بـه جیـاوازی قـه‌باره‌و سروشـتی تاوانه‌كـه ده‌گۆڕێت، به‌ڵام (سزای سنوری) سزایه‌كی دیاری كراوه نه زیاد ده‌كاو نه كـه‌م، سزای دزینی یه‌ك دینار هه‌مان سزای دزینی یـه‌ك ملیـۆن دینـاره بـۆ نمونـه كـه بریتی یه له بڕینی ده‌ست.

---

[1] المهذب ٢/٣٦.

[2] كتاب الخلاف للطوسي ٢/٤٤٤.

[3] الأقناع ٤/٢٦٨.

٣- سەرۆكى ولآت بۆى هەيە سزاى ڕووشكێنى لابداتو لێبوردنى گشتى ياخود لێبوردنى تايبەتى دەربكات، سەبارەت بە تاوان بارانى تاوانە ڕووشكێنى يەكان، ئەگەر بينى ئەو لێبوردنە لە بەرژەوەندى گشتى دايەو لێبوردنەكەى مافە تايبەتى يەكانى تاوان لەسەركراو لەدەست نەدات، بە پێچەوانەى سزا سنوريەكانەوە كە مافى خواى پەروەردگارەو هيچ كەسێك مافى ئەوەى نيە لاى ببات.

٤- ڕووشكێنى يەكان كاريگەريى باروبۆخە توندو سوكەڵەكانيان دەكەوێتە سەر بەپێچەوانەى سزا سنوريەكانەوە.

٥- سزا سنوريەكان بەپێى جياوازى كاتو شوێنو كەس ناگۆڕێن، بە پێچەوانەى سزا ڕووشكێنى يەكانەوە كە بەپێى جياوازى كاتو شوێنو كەسەكان دەگۆڕێن، بۆ نمونە لەوانەيە شتێك لەولاتێكدا سزا بێتو لە ولاتێكى تردا ڕێز بێت، بەڵكو لە دوو هەرێم دا ياخود لەدوو سەردەمدا لەيەك ولات.

٦- لە تاوانە سنوريەكاندا پێويستە ژمارەى شايەتى دان تەواوبێت، بە پێچەوانەى ڕووشكاندنەكان، بۆ نمونە شايەتەكانى زينا دەبێ ژمارەيان لە چوار كەس كەمتر نەبێتو شايەتەكانى تاوانە سنوريەكانى تر ژمارەيان لە دوو پياوى عاديل كەمتر نەبێت، بەلآم لە ڕووشكاندنەكاندا تاوانەكە بەيەك شايەتو سوێند خواردنى داواكار ياخود بەڵگە دەسەلمێت.

٧- دادوەر بۆى هەيە سزايەكى تر بگۆڕێت بە سزايەكى بريار لەسەردراو لە تاوانە ڕووشكاندنيەكان دا، بە پێچەوانەى سزا سنوريەكانەوە، دادوەر دەسەلآتى نيە بۆ گۆڕينى ياخود سوكەڵەكردنى ياخود توندكردنى.

٨- تاوانە سنورى يەكان هەميشە كاتين، لە كاتێكدا ڕوودانيان زياتر لە كاتێكى پێويست ناخايەنێ بۆ ئەو ڕوودانە، وەكو تاوانى دزى كردن كە بە بردنى ماڵەكە بەشاراوەيى لە شوێنى پاراستنى هاوشێوەى تەواو دەبێت، بە پێچەوانەى تاوانەكانى ڕووشكاندن، كە كاتى يەو بەردەواميشە وەكو بەندكردنى كەسێك

بەبێ بیانوو، وەکو نەدانی شایەتییێکی پێویست لەسەری، یاخود هەڵگرتنی دارایی و سامانی دزراو لەلای دزەکە، یاخود کەسێکی تر، هەڵگرتنی سامانی زەوت کراو لای زەوت کەر یاخود کەسێکی تر.

٩- سزا سنوری یەکان جێبەجێ ناکرێت تەنها دوای پەسەند کردنی سەرۆکی وڵات لەسەر بڕیارەی دادوەر، لەبەر مەترسی دارێتی یەکەی، بە پێچەوانەی سزای تاوانەکانی ڕووشکاندن، ئەگەر سزادانەکە کوشتن نەبێت، لەبەر ئەوەی لە هەموو کوشتنێکی ڕەوادا پێویستە سەرۆکی وڵات بڕیاری دادوەرەکە پەسەند بکات.

١٠-شیاویی، لە سزادانی سنوریدا مەرجە تاوانبارەکە شیاوی بەرپرسیارێتی بێ واتە پێگەیشتوو (بالغ) بێ، عاقڵ بێ، ئازاد بێ لە ویستەکەیدا، بە پێچەوانەی تاوانەکانی ڕووشکاندنەکانەوە، کە شیاوی ناتەواویش سزا دەدرێت بە سزای ڕووشکێنی ئەدەب دادان، جا ئەدەب دادانی باوکان بۆ ڕۆڵەکانیان دەبێتە سزادانێکی ڕووشکێنی.

بەرگری شەرعی دابەش دەبێت بۆ تایبەتو گشتی:

١- بەرگری شەرعی تایبەت ئەوەیە كە مافی دەستدرێژی كراو بۆسەری مافێكی تایبەتی یە وەكو دەستدرێژی كردن بۆسەر گیانی كەسەكە یاخود ئابڕووی یاخود دارایی، ئیتر ئەوە سەبارەت بە بەرگری كار یاخود كەسێكی تر بێت، لەسەر ئادەمیزاد پێویستە بەرگری لەكەسانی تر بكات هەروەها لە داراییو لە ئابڕووی هەروەكو بەرگری دەكات لەخۆیو ئابڕوییو دارایی یەكەی.

٢- بەرگری شەرعی گشتی ئەوەیە كە بەرژەوەندی دەستدرێژ كراو بۆ سەری گشتی بێت، ئەو بەرگری یە شەرعی یە سەبارەت بە بەرپەرچدانەوەی مەترسی ناوخۆیی پێی دەوترێت (الحسبة)و فەرمان كردن بە چاكەو قەدەغەكردنی خراپە، هەروەكو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: (وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)[1]، بەلام سەبارەت بە بەرپەرچدانەوەی مەترسی دەرەكی پێی دەوترێت تێكۆشان لەپێناوی خوا یاخود لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی دا، وە لەو ئایەتە پیرۆزانەی قورئاندا كە فەرمان دەدات بە جیهاد و تێكۆشان (بەرگری شەرعی گشتی)، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)[2] واتە: لە پێناووی بەرژەوەندی گشتی پێویست دا، كە بریتیە لە بەرژەوەندی پارێزگاری لە دینو پارێزگاری لە ژیانو پارێزگاری لە ئابڕوو وە پارێزگاری لە داراییو پارێزگاری لە زەوی.

بەپێی فەرمانی ئەو ئایەتە قورئانییانەی فەرمان دەكەن بە بەرگری شەرعی گشتی لەسەر هەموو موسڵمانان پێویستە بەشێوەیەكی گشتی تر و، ولاتە عەرەبی

---

[1] سوورەتی ئالی عیمران ١٠٤.

[2] سوورەتی التوبە ٤١.

یەکان بەشێوەیەکی گشتیو عێراقی یەکان بەشێوەیەکی تایبەت، بە هاوکاری مادیو مەعنەوی بوەستن لە دژی مەترسی ئیرهاب– ترسو تۆقاندن– لەسەر گەلی عێراق لە ئێستادا.

خوای پەروەردگار لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا دانی ناوە بە مافی ئازادی بەرگری شەرعی بە هەردوو بەشی گشتیو تایبەتی، بەڵکو ئەو بەرگری کردنەی داناوە بە ئەرکی سەرشانو پابەندبوونە بۆ هەرکەسێك کە دەتوانێ پێی هەڵبستێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ)[1].

قورئانی پیرۆز بەرگری کردنی شەرعیو لێ وەرگیراوەکانی لە چەندین ئایەتی پیرۆزدا بەکار هێناوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ)[2] واتە: بەرەفتارێکی چاك لە لێبوردەیی و خۆلادان، بەلاو نەهامەتیو خراپەو ئازارەکانیان لەخۆت دووربخەرەوە، هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ)[3] وە فەرموودەی خوای پەروەردگارە: (إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ)[4] هەروەها دەفەرموێت(وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ)[5] واتە: ئەگەر خوای پەروەردگار هەندێ لەخەڵکی کە کەسە شەڕانیو یاخی بووەکانن بە هەندێ کەس لەناو نەبات کە کەسە چاکو گوێڕایەڵو ئیماندارەکانن ئەوا زەوی تێك دەچێت. (لولا) وشەی قەدەغەکردنی

[1] سوورەتی بەقەرە ١٩٤.

[2] سوورەتی مؤمنون ٩٦.

[3] سوورەتی فصیلت ٣٤.

[4] سوورەتی حەج ٣٨.

[5] سوورەتی بەقەرە ٢٥١.

بوونه، به مانای خراپەكردن لەسەر زەوی دا قەدەغە كراوه بەهۆی بوونی لابردنی هەندێك خەڵكی بەهۆی هەندێكیانەوه.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ)[1] جیاوازی له نێوانی (الدفعو الرفع)، (الدفع) بریتی یه له بەرپەرچ دانەوەی شت لەپێش ڕوودانی دا، (الرفع) بریتی یه له لابردنی شتەكه لەدوای ئەوەی كه ڕووی داوه.

وه وتەی (الشرعی) لەو ڕووەوەیه كه شتێك بدرێته پاڵ سەرچاوەی بڕیارەكەی، لەبەر ئەوەی شەرعی خوای پەروەردگار كه بڕیاری پێویست بوون یاخود ڕێپێدان دەدات بۆ بەكارهێنانی هێزی گونجاو بە نیازی ئەوەی شەڕی چاوەڕوان كراو ڕوونەدات.

بەرگری شەرعی بەپێی پێكهاتەكەی بریتی یه له وەستان لەدژی مەترسی هاوكاتی دروست بەهۆكاری لەبار، لەكاتێكدا كه لایەنێك نەبێت پەنای بۆ ببرێت لەلایەن ئەوەوه كه كەوتۆته مەترسییەوه له دەسەڵاتی گشتی یاخود بێجگه لەو، لەبەر ئەوەی بەرگری كردن لەوكاتەدا غەریزەیەكی سروشتی یه بۆ هەموو بوونەوەرێكی زیندوو ئیتر ئەوه ئادەمیزاد بێت یاخود گیاندار.

مافی بەرگری كردن به مافێكی تایبەتی بوو، تاك بەخۆی ئەنجامی دەدا، یاخود به یارمەتی دانی لەلایەن كەسانی ترەوه، له ڕۆڵەكانی بنەماڵەو هۆزەكەی، تا پەیدابوونی دەوڵەت، پاشان دەوڵەت مافی بەرگری كردنی له ژێردەستەكانی بۆ دەسەڵات دارێتی خۆی پاوانكرد، بەوپێیەی دیاریدەیەكه له دیاریدەكانی سەروەری وڵات، تاوای لێ هات بەرگری كردن له هەموو مافێك یاسا بیپارێزری بووه ئەركی دەوڵەت وەكو بنەڕەتو

[1] سوره الحج/٤٠.

بناغه، بەڵام تـاك بـۆی هەیـە ئـەو مافـە پـەیڕەو بكـات وەك لادان لـەو بنەمایـە لـەو بارودۆخانەدا كە دەسەڵات تیایدا بوونی نیەو ناتوانرێت پەنای بۆ ببرێت.

چەندین توخم (ڕوكنەكانو مەرجەكان) هەیە، پێویستە لە بەرگری كردنی شەرعی تایبەت هەبن، بۆ ئەوەی لەبەرچاو بگیرێت، بەو سیفەتەی هۆیەكـە لـە هۆكارەكـانی ڕێپێـدان، هـەروەكو چـەندین سەرچـاوە هـەن بـۆ ڕەوایـەتیو خـاوەنی سروشـتێكی تایبەتی یە لە حوكمكردن و پێشكەوتنی داو لە بناغەو لە شوێنەواری دا، لەبەر ئـەوە توێژینەوە لەسەری دابەش دەكرێت بۆ سێ باس.

یەكەم تایبەت دەكرێ بە توخمەكانی.

دوهەم بۆ سەرچاوەو چۆنیەتیو گەشەكردنی.

سێهەم بۆ بناغەو شوێنەوارەكانی.

# جێباسی یه‌كه‌م:
# توخمه‌كانی به‌رگری شه‌رعی

به‌رگری شه‌رعی بریتیه له‌وه‌ستانه‌وه به میكانیزمێكی گونجاو دژی مه‌ترسیه‌كی گه‌مارۆده‌ر كه هه‌ڕه‌شه له سه‌رمافێك له‌ومافانه ده‌كات كه شه‌رع و یاسا دانیان پێداناوه‌و پارێزگاری لێده‌كه‌ن.

وه به‌هۆیه‌ك داده‌نرێت له هۆكاره‌كانی ڕێپێدانی كاره تاوانه‌كان ئه‌گه‌ر توخمه‌كانی تیادابوو، توخمه‌كانی هه‌موو شتێك ئه‌و شتانه‌ن كه ئه‌و شته‌ی له‌سه‌ر وه‌ستاوه، جا ئه‌گه‌ر له‌به‌شه‌كانی بوو ئه‌وا پێی ده‌وترێت ڕوكن (پایه) ئه‌گینا پێی ده‌وترێت مه‌رج، وه مه‌رجی شتێكیش له‌پێش بوونی دا هه‌یه، به‌لام پایه له كاتی بوونی دا بوونی هه‌یه.

### پایه‌كانی به‌رگری شه‌رعی:

له پێناسه‌ی به‌رگری شه‌رعی وه‌رده‌گیرێت كه پایه سه‌ره‌كی یه‌كان سیانن، ئه‌مانه‌ن:

مه‌ترسی‌و، مافێك ده‌كه‌وێته مه‌ترسی یه‌وه‌و، به‌رپه‌رچدانه‌وه‌یه‌كی له‌بار بۆ مه‌ترسی یه‌كه، بۆ هه‌ر پایه‌یه‌كیش له‌م پایانه مه‌رجی شه‌رعی‌و یاسایی خۆی هه‌یه كه ده‌بێ هه‌بن هه‌تاكو له هۆكاره‌كانی ڕێپێدان بژمێردرێن.

## مەرجەکانی پایەی یەکەم: مەترسی

دەبێ چەند مەرجێکی تیادا بێ گرنگەکانیان ئەمانەن:

**مەرجی یەکەم:** دەبێ سەرچاوەی مەترسی یەکە لە خۆیدا کارێکی نارەوا بێت‌و پەندیش لە نارەوایی یەکەی بە وەسفی کارەکەیە نەکو بە بەرپرسیارێتی بکەرەکە، واتە مەترسی نارەوا، بەهانەی بەرگری کردنە، بە چاوپۆشین لە شیاوی سەرچاوەی مەترسی یەکەو پۆلەکەی‌و جۆرەکەی‌و رەگەزەکەی‌و شیاویە تاوان کاریەکەی، زانایانی شەرع ناسی‌و یاسا کۆکن لەسەر ئەوەی کە دروستە بەرگری بکرێت لە دژی مەترسی نادروست، ئیتر ئەگەر سەرچاوەکەی ئادەمیزاد بێ یاخود ئاژەڵ بێت، ئیتر ئەو ئادەمیزادە نێر بێ یاخود مێ بێ، منداڵ بێ یاخود گەورەبێ، موسڵمان بێ یاخود ناموسڵمان بێ، نزیك بێ یاخود دووربێ، پێگەیشتووی ژیر بێ یاخود شیاویی نەبێت (وەکو منداڵێك کە جیانەکاتەوەو شێتێك‌و ئەوانەش کە لە بڕیارەکەیدا هەیە).

بەڵام زانایانی بواری شەریعەتی ئیسلام جیاوازییان هەیە لە لێپرسینەوەی بەرگری کار لەرووی مەدەنی یەوە، لە باروبۆخی نەبوونی شیاوی سەرچاوەی مەترسی یەکەدا.

زۆرینەی ئەو زانایانە دەڵێن بەرگری کار لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێت نە لە بواری تاوانکاری داو نە لەبواری مەدەنیدا، نە سزا دەدرێت و نە داوای قەرەبو و لەبری لێ دەکرێت، لەبەر ئەوەی پەند لە بوونی مەترسی نارەوایە کە هەڕەشە لە مافێکی رەوای لەژێر چاودێری دا (پارێزراو) دەکات.

ئەبو حەنیفەو هاوەڵەکانی زەمانەتکردنی مەدەنی بە پێویست دەزانن ئەگەر سەرچاوەی مەترسی یەکە شێتێك یاخود منداڵێکی ناشیاو و هاوشێوەیان یان ئاژەڵێك بوو، ئەگەر لابردنی مەترسییەکە بە کوشتنی سەرچاوەکەی بوو، لەبەر ئەوەی کرداری کەسێك شیاو نەبێت بۆ بەرپرسیارێتی تاوانکاری، بە تاوان دانانرێت، لەبەر نەبوونی ویستی رەچاوکراو لە ئەنجامدانی تاوانەکە، بەو پێیە پێویستە بەرگریکار

خـوێنی دەسـتدرێژیكاره شـێتەكه یـان منداڵـه ناشـیاوەكه بـدات و، بـەهای ئاژەڵـه دەستدرێژكارەكه بۆ خاوەنەكەی بدرێت ئەگەر كوشتی بۆ بەرگری كردن لەخۆی.

ئەبو یوسف (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) جیاوازی كردووه له نێوانی ئاژەڵو ئادەمیزانێكدا كه شیاوی نەبێت، ڕای وایه: دەبێت زەمانەتی بەهای ئاژەڵەكه بدرێت ئەگەر بەرگری كارەكه كوشتی، بەڵام كەسی ناشیاو زەكانەت ناكرێت[١].

ئەوەی بەڕاستی دەزانم ڕای جمهوری زانایـانی بـواری شـەریعەته لەبـەر ئـەوەی دەسـتدرێژی كـردن لەخۆیـدا تاوانـه بـه چاوپۆشـین لـه سەرچـاوەكەی‌و، سـیفەتی تاوانكاریەكەی ون ناكات به نەبوونی شیاویی دەستدرێژكار.

مەرجی دوهەم: دەبێت مەترسی یەكه دەسـت بـەجێ بێـت: لـه یـەكێك لـەم دوو بارودۆخەدا به دەست بەجێیی دادەنرێت:

یەكەم: خەریكه ڕوویداتو هێشتا ڕووی نەداوه، بەڵام دەبێت ڕوودانی له گومـانی زاڵی بەرگری كاردا چاوەڕوان كراو بێت، بەوەی چەند بەڵگەیەكی پەسەندو نیشـانەی بابەتی هەبێت لەسەر ئەوەی دەستدرێژكار دوژمنایـەتی یەكـەی جێبـەجێ دەكـاتو گومانی زاڵی ئەوه دەبێت كه ئەگەر چارەسەری ئەو مەترسی نـەكات ئـەوا دەكـەوێ بەسەریا.

دوهەم: ئەوەیه بەكردار ڕوویداتو بـەردەوام بـێ‌و هێشـتا كۆتـایی نـەهاتبێ، لـەو بارودۆخەدا ڕۆڵی بەرگریكردن خۆپاراستنه بۆ وەستاندنی بەردەوام بـوونی مەترسـی یەكه، وەكو ئەوەی دەسـتدرێژیكار (پـەلاماردەر) گوللـەی ئـاگرینی تێبگـرێ و پێـی نەكـەوێ و هـەوڵ بـدات گوللەیـەكی دیكـەی تێبگـرێ، یـاخود دزێـك بچـێته ژوورێ بەمەبەسـتی دەسـتدرێژی كردنـه سـەر ژیـان یـاخود دارایـی یـاخود ئـابڕووی، لـەو

---

[١] بڕوانه: تكملة البحر الرائق ٣٤٨/٨. ورد المحتار لا بن عابدين (محمد أمين) ٤٨٢/٥.

بارودۆخەدا خاوەن ماڵ یاخود بۆ ئەوانەی لەوێن، بۆیان هەیە پەنا بەرنە بەر لابردنی مەترسی یەکە بە هۆکارێك کە لابردنەکەی لەسەر وەستاوە.[1]

**مەرجی سێهەم:** دەبێ ویستی دەستدرێژکار (پەلاماردەر) ڕاستەقینەبێت بۆ دوژمنکاری لەگەڵ توانای ڕوودانی مەترسی یەکە بەپێی گومانی زاڵی بەرپەرچ دەرەوەکە، بەپێی هۆکاری پەسەند، بۆی نیە بەرگری بکات ئەگەر بینی بەرامبەرەکەی گاڵتەو سوعبەتی دەکرد یاخود بەڕاستی بوو بەڵام دوژمنکاریەکە ناکرێت ڕوویدات لەبەر بوونی بەربەستێك هەبێ، وەك ئەوەی بیەوێ لەپشت دیوارێك یاخود کۆسپێك یاخود ڕووبارێك یاخود قەڵایەك یاخود هاوشێوەی ئەوانە دەستدرێژی بکاتە سەری.

**مەرجی چوارەم:** دەبێ مەترسی یەکە ڕاستی بێ، بەوەی لەڕاستی دا بوونی هەبێو بە هەمان شێوە لەبیری بەرپەرچ دەرەوەکەدا بێ، بەلای کەمەوە گومانی زاڵ بێ لەسەر ئەوەی کە ئەو لەبەردەم مەترسی یەکی ڕاستەقینەدایە کە خەریکە ڕوودەدات، ئیتر گومانەکەی لەگەڵ ڕووداوەکەدا یەك بگرێتەوە یان نا، دەبێ هۆکاری شیاو هەبن پشتیوانی ئەو گومانە زاڵە بکەن کە هەڵەیەکەی ڕونە، ئەوەش لێپرسراوێتی سزادان لادەبات نەك مەدەنی بە پاڵپشت بە فەرموودەی خوای پەروەردگار (وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ)[2] پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (رُفِعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ) واتە: سەرزەنشتو لێپرسینەوەی سزادانی هەڵگیراوە لە بارودۆخەکانی ئەنجام دانی تاوانەکاندا لەژێر کاریگەری هەڵە یاخود لەبیرچوونەوە یاخود زۆر لێ کردن دا.

---

[1] لەسەرچاوە فیقهی یەکاندا بڕوانە: القرافی/ سەرچاوەی پێشوو ١/١٨٤، ٤/٢٣٧ الأنوار للعلامة یوسف الأردبیلي الشافعي ٢/٣٤٣.

[2] سورة الأحزاب\٥.

**پێوه‌ری مه‌ترسیی راسته‌قینه:**

دیاره پێوه‌ر له ئه‌سڵدا كه‌سیی (خودیه) سه‌رباری هه‌ندێ پێوه‌ری مادی (بابه‌تی) وه‌ك نیشانه‌كان(قرائن)، له‌رووی كه‌سی بوونیه‌وه ئه‌وه‌یه كه به‌رگریكار گومانی زاڵـی وایه كه مه‌ترسییه‌ك روبه‌ڕوی به‌رژه‌وه‌ندییه‌كی ڕه‌وا بۆتـه‌وه كـه شـه‌رع (یـان یاسـا) ده‌یپارێزێت، ته‌نها وه‌هم به‌س نییه كه لایه‌نی لابراوه(مرجـوح) به‌رامبـه‌ر گومـان كـه لایه‌نی پێشخراوه(راجح)، لێره‌دا، له‌رووی له‌پێشترییه‌وه شك به‌س نییه كه دوودڵییه له‌نێوان بوون و نه‌بووندا وه‌ك یه‌ك به‌بێ پێشخستنی لایه‌ك به‌سه‌ر لایه‌كه‌ی تردا.

بۆیه ئه‌و یه‌قینه مه‌رج نییه كه بریتییه له باوه‌ڕی ته‌واوی چه‌سـپاوی هاوشـێوه‌ی واقیع، چونكه ئه‌وه لوتكه‌ی درك پێكردنه، به‌مه‌رج دانانی واده‌كات زۆر مافی به‌رگری شه‌رعی بكرێته قوربانی، به‌ڵام له‌سه‌ر قازێ پێویسته ره‌چاوی ته‌مه‌ن و پۆل و پلـه‌ی هه‌ستكردن و هێزی ده‌مـاریی به‌رگریكاره‌كـه بكـات، هـه‌روا ره‌چـاوكردنی بارودۆخـه بابه‌تییه‌كان فه‌رامۆش نه‌كات بۆ روودان له‌شـه‌و یـان رۆژ، لـه‌ناو شـار یـان ده‌ره‌وه‌ی شار.

**مه‌رجی پێنجه‌م:** ناڕه‌وایه‌تی مه‌ترسییه‌كه: مه‌رجـه ئـه‌و مه‌ترسـییه‌ی بیـانوه بـۆ به‌رگری كردن، مه‌ترسییه‌كی ڕه‌وا نه‌بێت، بینـا له‌سـه‌ر ئـه‌وه ئـه‌و كه‌سـه‌ی حـوكمی سزایه‌كی به‌سه‌ردا دراوه، مافی ئه‌وه‌ی نییه دژ بـه جێبـه‌جێ كردنـی بوه‌سـتێته‌وه، به‌بیانووی دوچاربونی به مه‌ترسیی له‌سێداره‌دان یان له‌ده‌سـتدانی ئازادییه‌كـه‌ی یـان هاوشێوه‌ی ئه‌وانه، چونكه جێبه‌جێ كردنی حوكمه‌كه ڕه‌وایه‌و ده‌بێ ملكه‌چی بێت.

هه‌روا ئه‌و سه‌ربازه‌ی فـه‌رمانی پـێ ده‌كرێـت بـه‌ره‌و هێڵـه‌كانی پێشـه‌وه‌ی شـه‌ڕ بڕوات، تـا دژی ده‌سـتدرێژیی ده‌سـتدرێژكار بوه‌سـتێته‌وه، بـۆی نییـه رێگـر بێـت و سه‌رپێچی فه‌رمان بكات، چونكه ئه‌و چـوونه پێشـه‌وه‌یه ئه‌ركێكـه له‌سـه‌ری و مـافی ئه‌وه‌ی نییه بیانوو بێنێته‌وه به دوچاربوونی مه‌ترسیی كوشتن یان به‌دیل گـرتن یـان هاوشێوه‌ی ئه‌وه.

ئەو پۆلیسەی فەرمانی پێکراوە هەڵمەت بەرێتە ناو شوێنێکەوە راکردوویەکی دەستی دادوەریی(عدالە) تیا ون بووە، بۆی نییە رێگر بێت لەو چوونە ژوورەوەیە بەبیانووی دوچاربوونی بە مەترسی، چونکە بە پێی پیشەکەی، ئەو کارە ئەرکە لەسەری.

**مەرجی شەشەم**: مەترسییەکە بەر لە دەستپێکردنی بەرگرییەکە لانەچووبێت.

لەیەکێك لەم حاڵەتانەدا مەترسی بە لاچوو دادەنرێت:

أ- بەرگری کردنی بەرگریکار بە کارێکی رەوا بووە هۆی لەکارکەوتنی دەستدرێژییەکە، ئەوسا بۆی نییە بەردەوام بێت، بەڵکو دەبێ بەوەندە بەسی بکات، چونکە مەترسییەکە لاچووە.

ب- دەستدرێژکارەکە دوای ئەوەی پلانی دانابوو بۆ ئەنجامدانی دەستدرێژی، بەهاندەرێکی خۆویست پاشگەز بێتەوە، وەك لە تاوانی هەوڵدان (الشروع) ئەگەر بە ویست و بژاردەی خۆی، لە کارەکە کشایەوە.

ج- هەڵاتنی دەستدرێژکار بەر لە جێبەجێ کردنی تاوانەکەی، بەرگریکار بۆی نییە بە پاڵنەری بەرگری کردن شوێنی بکەوێت، مەگەر بەمەبەستی دەستگیرکردنی و دانەدەستی دەسەڵاتی گشتی بێت.

د- دەستدرێژکار دەستەوسان بێت لە جێبەجێکردنی دەستدرێژییەکەی لەبەر هۆی دەرەوەی ویستی خۆی.

هـ- دەستدرێژی بۆسەر کراو، لەجیاتی پەنابردنە بەر بەکارهێنانی هۆیەکی بەرگری، توانی رابکات بەمەبەستی رزگاربوون لە خراپەی دەستدرێژکارەکە.

جێی ئاماژەیە کە بەرگریکار لەکاتی بەرگری شەرعی، نە لە شەرع و نە لە یاسا، داوای لێ ناکرێت رابکات، لەبەر ئەوەی ناشیرینە و نیشانەی ترسنۆکییە، بەڵام ئەگەر دەستدرێژکار پەیوەندییەکی خزمایەتیی نزیکی لەگەڵی هەبوو، وەك ئەوەی باوکی یان دایکی یان برای یان خوشکی یان یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بێت، چاکتر وایە

رابكات نەك بەرگری بكات، چونكە لەو حاڵەتەدا راكردن كارێكی خوازراوە بۆ دورخستنەوەی كاردانەوەی سەلبی و پەشیمانی لەكاتێك پەشیمانی دەست نادات.

**مەرجی حەوتەم:** دەبێت دەستدرێژیكردنەكە درووستبوو و داكەوتەی كەموكورتی دەستدرێژی لەسەركراو نەبێت. وەك توڕەكردنی دەستدرێژكار یان دەستپێشخەری لە دوژمنكاری، یان هەر هۆیەكی دیكە لە دەستدرێژی لەسەركراو روویدات و دەستدرێژیكار هانبدات بۆ دەستدرێژیەكەی. بەو پێیە بەرگری كردنی ژنی زیناكار و هاوبەشەكەی بەرامبەر مێردەكەی كە دەیەوێت بیانكوژێت یان یەكێكیان بكوژێت، بە بەرگری شەرعی دانانرێت.

**مەرجی هەشتەم:** دەبێت دەستدرێژیكردنەكە تاوان بێت، ئەم مەرجە جیاوازیی لەسەرە، روونە كە دەستدرێژی ئاژەڵ بۆ سەر مرۆڤ بە تاوان دانانرێت، بەپێچەوانەی شێت و هاوشێوەكانی.

ژێربێژیی یاسایی وادەخوازێت كە كار بەو مەرجە نەكرێت، چونكە حیكمەت لە بەرگری شەرعی لابردنی مەترسییەكە هەڕەشە لە بەرژەوەندییەك (یان مافێك) دەكات كە بە یاسا پارێزراوە، ئەو حیكمەتەش لە حاڵەتی دەستدرێژیی ئاژەڵدا بوونی هەیە.

### مەرجەكانی پایەی دووەم: ئەو مافەی دەستدرێژی كراوەتە سەر:

مەرجە كە لەو مافانە بێت كە بە شەرع و یاسا پارێزراون، وەك ئایین و ژیان و ناموس و سامان و هاوشێوەی ئەوانە، لەوانەی یاسا بڕیاری لەسەردەدات و دەیپارێزێت.

بەو پێیە دەرمانساز بۆی نییە بەرگری بكات لە لەكارخستنی داوودەرمانەكانی ئەگەر خراپ بوون یان وایان لێهاتبوو بە كەڵكی بەكارهێنان نەدەهاتن، بازرگان بۆی نییە بەرگری لە لەكارخستن یان دەستبەسەرداگرتنی ماددە خۆراكییە نەشیاوەكانی دابگرێت. قۆرخكار بۆی نییە بەرگری لە سامانە قۆرخكردووەكەی بكات ئەگەر دەسەڵاتی گشتی خستیەڕوو بۆ فرۆشتن بە نرخی بازاڕ، قاچاخچی بۆی نییە بەرگری لە سامانە قاچاخەكانی بكات كە بەرێگای ناڕەوا ئاودیوی كردوون، ئەگەر دەسەڵاتی

گشتی ویستی دەستی بەسەردابگرێت، هی دیکەش لەو مافانەی کە شەرع یان یاسا بڕیاری لەسەر نادات و ناشی پارێزێت.

## مەرجەکانی پایەی سێیەم: لابردنی دەستدرێژی

لەم پایەیەدا مەرج نییە بەرگریکار خاوەنی بەرژەوەندییە پارێزراوەکە بێت بە شەرع یان یاسا و، دوچاری مەترسیی دەستدرێژی بووبێتەوە، بەڵکو بەرگری ڕێپێدراوە و لەوانەیە پێویستیش بێت لە بەرژەوەندیی خۆی یان کەسێکی دیکە، هەرچەندە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەو کەسەدا نەبێت بە خزمایەتی یان هاوسەرگیری یان هاوڕێیەتی یان دۆستایەتی یان هاوشێوەی ئەوانە، جا لەسەر هەموو مرۆڤێکی تواناداره کە بەرگریی لە مافی کەسانی دیکە بکات لەکاتی کەوتنە مەترسییدا.

ڕەزامەندی دەستدرێژی بۆسەرکراو بە دەستدرێژییەکە کاری پێ ناکرێت، ئەگەر ئەو ڕەزامەندییە پێچەوانەی سیستەمی گشتی و ئادابە گشتییەکان بێت، ئەگەر ئافرەتێك، هاوسەرداری هەبێت یان نا، خۆی خستە بەردەست کەسێك لەرووی جنسییەوە لەگەڵی تێکەڵ بێت، هەرکەس بیزانێت دەبێت بەرگری بکات لە ڕوودانی ئەو کارە قێزەونە، لەبەر ئەوەی دەستدرێژییە بۆ سەر بەها و نەریتەکانی کۆمەڵگا. هەروا ڕەزامەندی نەخۆش کاری پێ ناکرێت ئەگەر مۆڵەتی دا بە پزیشك تا ژیانی کۆتایی پێ بێنێت بۆ ڕزگاربوون لە نەخۆشییەکەی یان ئازارەکانی کە ئومێدی چابوونەوەی نییە، چونکە ئەو مۆڵەتە وەکو خۆکوشتنەو، ئەوەش بە یەکدەنگیی هەموو شەریعەت و یاساکان قەدەغەیە.

بە گرنگترین مەرجەکانی لابردنی دەستدرێژی ئەمانەن:

١- بەکارهێنانی هێز بۆ لابردنی دەستدرێژی زەروری و پێویست بێت، شایانی باسە پێوەرێکی بابەتی نییە بۆ جیاکردنەوەی پێویست و ناپێویست، بەڵکو ئەو بابەتە بۆ دەسەڵاتی خەمڵاندنی دادگای بابەتەکە جێهێڵراوە، ئەگەر جیاڕایی تێکەوت، بەو شێوەیەش ناکەوێتە ژێر چاودێریی دەسەڵاتی قەزایی باڵا.

پێوەری هێزی پێویست كەسییە، بۆیە دەگۆڕێت بەپێی قەبارەی دەستدرێژی و كەسی دەستدرێژكار و دەستدرێژی بۆكراو، لەو ڕووەوە كە نێرە یان مێیە، بچووكە یان گەورەیە، لەگەڵ ئەوەشدا قەبارەی ئەو هێزە بە دۆخی دەستدرێژییەكەش كاریگەر دەبێت، دۆخی شەو جیاوازە لە ڕۆژ، دۆخی ئاوەدانی جیاوازە لە دەرەوەی و... بەو شێوەیە. گرنگ ئەوەیە خەملاندنی بەرگریكارەكە لەسەر بنچینەی هۆی مەعقولی وەرگیراو بێت.

٢- هێزی بەكارهاتوو لە بەرگرییەكەدا تاكە هۆ بێت بۆ گەیشتن بە ئامانجی لابردنی مەترسییەكە، بەو پێیە مافی بەرگری شەرعی بوونی نییە ئەگەر دەكرا لەكاتی گونجاودا پەناگیری بكرێت تا خۆی بە پیاوانی دەسەڵاتی گشتی بپارێزێت، بەوەی بەرگریكار كاتی پێویستی لەبەردەستدا بێت بۆ هانابۆبردنی.

وەك باسمان كرد لە هەندێك دۆخدا واچاكە پەنا ببرێتە بەر هەڵاتن لەجیاتی بەكارهێنانی هێز، بەتایبەتی ئەگەر هێرش هێنەرەكە ئاژەڵێك یان مرۆڤێكی نەفام وەك شێت بێت، یان یەكێك لەخزمان یان هاوسەرەكان بێت.

٣- هۆی بەكارهێنراو لە بەرگری شەرعی گونجاو بێت بەگەڵ مەترسی دەستدرێژییەكە، لە فیقهی شافیعیدا هاوشێوەیی مەرج نییە، ئەگەر لابردنەكە لەسەر تاكە هۆی بەرگریی بەردەست وەستابوو، ئەویش مەترسیدارتر بوو لە هۆی دەستدرێژییەكە، وتیان: ئەگەر كەسێك بە قامچییەكەوە یان دارێكەوە پەلاماری دەدا، پەلاماردراویش هیچی لەبەردەست نەبوو بێجگە لە شمشێر، ڕاست ئەوەیە كە بەوە لێی بدات، لەبەر ئەوەی ناتوانێت بەبێ ئەوە بەرگری لەخۆی بكات. [1] لە فیقهی ئیمامیدا هاتووە: مرۆڤ بۆی هەیە بەرگری لەخۆی و خێزانی و سامانی بكات چەندی توانی، پێویستە پشت بە ئاسانترەكە ببەستێت، تێپەڕادن كاتێك دێتەدی كە بڕێكی توندی هێزی بەكارهێنابێت كەچی

---

[1] مغني المحتاج للخطيب الشربيني:٤/١٩٦.

کەمێك هێز بەس بووە بۆ بەرگریی لە دەستدرێژییەکە، بەڵام بەرگریکار لەسەری نییە پابەند بێت بەو بڕە کەمە، مەگەر بەوە بتوانێت بەرگریی دەستدرێژییەکە بکات. [1] ئەم قسانەش لە مانادا لەگەڵ شافیعییەکان جیاواز نین.

لە فیقهی زەیدیدا لە هاوتاییدا پێویستە سوکترین پێش بخرێت ئینجا سوکترەکە، ئەگەریش لە سوکترەکە لایدا بەرەو توندتر و بە سووکترەکە لادەبرا، ئەوا زامنە. [2]

قورئانی پیرۆز باسی لە هاوشێوەیی نێوان مەترسیی دەستدرێژی و مەترسیی لابردنی ئەو دەستدرێژییەی کردووەو فەرموویەتی: (فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ) و بە ئایەتی (وَاتَّقُوا اللَّهَ) پابەندیی بەو هاوشێوەییەی دوپات کردۆتەوە، واتە ترسی سزای خواتان هەبێت لەکاتی تێپەڕین لەسنوری پێویست بۆ لابردنی مەترسییەکە، پاشان لەهەمان ئایەت بۆ جاری دووەم بە (أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) دوپاتی دەکاتەوە، واتە ئەوانەی لەخوا دەترسن و لە سنورەکەی تێناپەڕن خوا لەگەڵیانە.

لە م٤٥ی یاسای سزاکانی عێراقی ئێستا هاتووە کە مافی بەرگری شەرعی ڕێنادات زیانێك دروست بکات لەوە زیاتر بێت کە ئەو بەرگرییە پێویستێتی.

**زیادەڕەوی کردن لەبەرگری شەرعی دا**

هەروەکو پێشتر باسمان کرد گونجاندن لەنێوانی دەستدرێژی کردنو بەرگری کردن دا مەرجێکی بنەڕەتی یە بۆ ڕەوایەتی بەرگری شەرعی، بەرپەرچدانەوە نەگونجاو دەبێت ئەگەر لە ڕادەی پێویستی خۆی زیاتر بوو بۆ بەرپەچ دانەوەی دەستدرێژی کردن. [3]

---

[1] شرائع الإسلام للحلي:٤/١٨٩.

[2] البحر الزخار للامام احمد بن يحي:٥/٢٦٩.

[3] لە بڕیارەکانی پێداچوونەوەیی دادگای پێداچوونەوە، بڕیاری ژمارە ٣١١، (جنایات= تاوانە گەورەکان)٩٧١ لە ١٩٧١/٣/١ (بڕیاری تاوان بارکردنی تاوانبار بەپێی م٤٥٠ لە یاسای سزادان ←

تێپەڕاندن لە سنوورەكانی بەرگری كردنی شەرعی پێویست بەبوونی هەموو مەرجەكانی بەرگری دەكات بێجگە لە مەرجی ون بوونی هاوشێوەیی. لەپاش تێپەڕاندنی سنوورەكانی بەرگری شەرعی لەلایەنی بەرپرسیارێتی سزادان و دیاری كردنی بەرپرسیارێتی زیادەڕەوی كردن پێویستە لەنێوانی ئەو سێ بارودۆخەدا جیاكاری بكرێت.

١- زیادەڕەوی لە سنوورەكانی بەرگری شەرعی بە ئەنقەست بەوەی مەبەستی بێت زیاد لە پێویست هێز بەكاربێنێ بۆ دوورخستنەوەی مەترسی دەستدرێژی لەگەڵ ئەوەی بتوانێ بە كەمتر لەوە بەرپەرچی بداتەوە، وەكو ئەوەی توانای ئەوەی هەبووبێ بەرپەرچی بداتەوە بەبێ ئەو كوشتنەی بەرگریكار ئەنجامی داوە، ئاشكرایە تاوانەكە لەو بارودۆخەدا دەبێتە ئەنقەست.

٢- زیادەڕەوی لەبەر كەمتەرخەمی: بە كەمتەرخەمی دادەنرێت ئەگەر بەرگریكار بەهۆی كەمتەرخەمی خۆی نەیتوانی گەورەیی ئەو مەترسی یە دیاری بكات، بۆیە هێزی زیاتری بەكارهێنا لەوەی كە پێویست بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی، هەروەكو ئەوەی دەستدرێژی یەكە بە دارێك یاخود بە ئامێرێكی تر ڕووی دابێ، كە برینداركەری سەخت نەبێ، كەچی گەورەیی مەترسی دەستدرێژییەكەی دیاری نەكردبێ و هۆكارێكی مرێنەری بەكارهێنابێ، لەو بارودۆخەدا بەرگریكار تاوانێكی ئەنجام داوە كە بەئەنقەست نەبووە.

٣- زیادەڕەوی لە سنوورەكانی بەرگری شەرعی دا بەهەڵە، وەكو ئەوەی وای زانیبێ كەوا لەبارودۆخی بەرگری شەرعیدایە، بەڵام ئەو لەو بۆچونەیدا هەڵەبێت، وەكو ئەوەی ئەگەر گومانی كردبێ كە مەترسی یەك هەیە هەڕەشەی كوشتنی لێ

---

گونجاو بۆ یاسا، لەبەر ئەوە بڕیاری پەسەندكردنی درا، لەبەر ئەوەی ڕوون و ئاشكرایە لە ئەنجامدانی لێكۆڵینەوەو دادگایی كردن ڕووداوەكە تێپەڕیوە لەبەرگری كردن، لەبەر ئەوە لەسەر دادگای گەورە پێویستە چاودێری ئەو لایەنە بكات و بڕیارەكەی بە سزادان دەربكات لە جیاتی م٤٥ لە هەمان یاسا محسن ناجی الاحكام العامە لاپەڕە ٢٦١ گوێزراوەتەوە.

دەکات، ئەویش پەلەی کردبێ بۆ کوشتنی سەرچاوەی ئەو مەترسی یە گومان داره بە گومانێکی بەهەڵە، کە لەسەر هۆکارە شیاوەکان دانەمەزراوە.

ئەوەی شایانی باسە کە گومانی بەهەڵە ئەگەر لەسەر هۆکارە شیاوەکان دامەزرابێ کاری پێ دەکرێت.

**شوێنەواری زیادەڕەوی لە سنوورەکانی بەرگری شەرعی لەلایەنی سزادانەوە:**

بەرگری کار لەبواری بەرپرسیارێتی سزاداندا لێی دەپرسێتەوە لەسەر تاوانی بە ئەنقەست لە باروبۆخی یەکەمدا وە لە تاوانی نا ئەنقەست لە هەردوو باروبۆخی دوهەمو سێیەمی ناوبرلودا، بەڵام لەیاسادا لەهەرسێ باروبۆخەکەدا دەستەڵاتی هەڵسەنگاندنی دلوەتە دادوەری بابەتەکە، ڕێگەی پێ دەدا بڕیار بە سزای بڕیار لەسەردرلو بدات، ئەگەر زیادەڕەویەکە گەورەبوو، هەروەکو ڕێگەی پێ دەدا سزادانەکە سوک بکات بەوەی بە سزای تاوانی بچوك(جنحه) سزای بدات ئەگەر کارەکە تاوانی گەورە(جنایه) بوو، وە بەسزادانی سەرپێچی کردن(مخالفه) ئەگەر تاوانی بچوك(جنحه) بوو،[1] وە بیانوی سوکەڵە کردن بیانویەکی یاسایی یە (م٤٥) بڕیاری لەسەرداوەو دادگای سەرپشك کردووە کە سزادانی سوکەڵە تر بگۆڕێ بە سزای بڕیار لەسەردرلو.

سوکەڵە کردن شتێك نیە دادگا پێوەی پابەندبێت[2] هەروەکو بەپێی (م١٣٤) سزادان بارێکی دادوەری یە، لەبەر ئەوەی زیادەڕەی لەکاتی باروبۆخی بەرگری کردنو باری بەرگری کردن دا، سروشتێکی دوو لایەنەی هەیە، ئەوەش بەهانەیەکی

---

[1] (الجنایه= تاوانی گەورە) بەیەکێ لەم سێ سزایانە سزا دەدرێت: (الإعدام= لەناوبردن)و بەندکردنی هەتا هەتایی و بەندکردنێك لە پێنج ساڵ زیاترەوە بۆ پانزە ساڵ (م٢٥) (الجنحة= تاوانی بچوك= کەتن) بەیەکێ لەم دوو سزایە سزا دەدرێت، بەندکردنی توندو ئاسان لە سێ ساڵەوە بۆ پێنج ساڵ (م٢٦) (الخالفة= سەرپێچی کردن) تاوانێکە بەیەکێ لەم دوو سـزایە سزا دەدرێت: (بەندکردنی ئاسان (٢٤)سەعات بۆ سێ مانگ بە بژاردنێك کە بڕەکەی لە سێ دینار زیاتر نەبێ (م٢٧).

[2] هەروەکو لە باروبۆخی دادوەری سوکەڵەدا دەقی لەسەر هاتووە لە (م١٣٢) سزادان دا.

سوكەڵەی یاسایی یە. هەروەكو دەقـی (م٤٥) لـەوبارەوە هـاتووە، هـەروا بـارودۆخی دادگەری سوكەڵەكراو لەبەر ئەوەی سوككردنی سـزا بـەو ڕادانـەی كـە (م٤٥) دیـاری كردووە، كاری ڕێپێدراوە بۆ دادگا كە بڕیاری پێ بدات یاخود بڕیاری پێ نـەدات، لـەو كارەدا ڕەچاوی هەموو بارودۆخێكی بەجیا دەگیرێت.

**چاودێری دادگەری لەسەر بوونی بارودۆخی بەرگری شەرعی و سنور تێپەڕاندنی**

دادگای پێداچوونەوە چاودێریی نیە لەسەر پوخت كردنی ڕووداوەكانو ئەو بارودۆخەی كە بارودۆخی بەرگری شەرعی لێ بەرهەم دێت، لەبەر ئەوەی كارەكە پەیوەندی بەڕووداوەكانەوە هەیەو دەچێتە ناو دەسەڵاتی خەملاندنی دادوەری بابەتەكەوە، نەك لەسەر ئەوەی دادوەری بابەتەكە لەو بارودۆخو ڕووداوانە پێی دەگات، لەوانەی بەزیادەڕەوی سنوورەكانی بەرگری شەرعی هەژماری دەكات، جا لەسەر دادگای بابەتەكە پێویستە لە بڕیاردانەكەیدا ئەو بارودۆخو ڕودلوانە ڕوون بكاتەوە كە لێوەی گەیشتونەتە بوونی بەرگری شەرعی و زیادەڕەوی بەرگریكار لە سنوورەكان بۆ ئەوەی دادگای پێداچوونەوە بتوانێت چاودێری بكات ئەگەر ئەو پایە و مەرجانە بونیان هەبێت یان نا.[1]

[1] الاستاذ محسن ناجی، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٢٦٤.

# جێباسی دووەم:
# سەرچاوەکانی بەرگری شەرعی، سازاندنی، پەرەسەندنی

## یەکەم: سەرچاوەکانی بەرگری شەرعی

لە شەریعەتی ئیسلامی دا سەرچاوەکانی ڕەوایەتی بەرگری شەرعی ئەمانەن: قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺو کۆڕای زانایان و عەقڵی ساغ.

### یەکەم: قورئانی پیرۆز

لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتی زۆر هاتوون بە ڕوون و ئاشکراو ڕاشکاوانە ئاماژە دەکەن بە ڕەوایەتی بەرگری شەرعی و، دانانی بە یەکێك لە هۆکارەکانی ڕێپێدان، لەو ئایەتانە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ)[1].

کە دەفەرموێت (فَاعْتَدُوا) فەرمان کردنە، هەموو فەرمان کردنێکیش بۆ پێویست بوونە، ئەگەر بەڵگەیەك نەبێت لەسەر پێچەوانەکەی، مەبەست لە دەستدرێژی لێرەدا بەرگری شەرعی یە، ناوی وا لێ نراوە، بۆ پاراستنی وشەسازی یە لە لایەنی ڕەوانبێژی یەوە، لەبەرئەوەی کاری پەلامارداەرەکە پێی دەوترێت دەستدرێژی و بەرپەرچ دانەوەکەشی هەر بەوە ناونراوە، لەبەر ئەو پاراستنەی باسمان کرد. هاووێنەی فەرموودەی خوای پەروەردگار (وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا).[2] کە دەفەرموێت (وَاتَّقُوا

[1] سوورەتی بەقەرە ١٩٤.
[2] سوورەتی شوورا ٤٠.

اللّهَ) فەرمانە بە پابەند بوون بە هاوشێوەیی‌و زیادەڕەوی نەكردن لە سنوورەكانی بەرگری شەرعی، واتە لەخوای پەروەردگار و لە سزادانەكانی بترسن، لەسەر هەموو زیادەڕەوییەك لە ڕادەی پێویست بۆ بەرپەچدانەوەی دوژمنكاری، جارێكی تریش دوپاتی كردۆتەوە بە فەرموودەی (أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) واتە خوای پەروەردگار بەڕاستی لەگەڵ ئەو كەسانەیە كە تەقوایان تێدایەو پارێز دەكەن‌و لەخوای پەروەردگاریان دەترسن‌و پابەندن بەبڕی زەروری و پێویستیەوە بۆ بەرپەرچ دانەوەی دوژمنایەتی.

**دوهەم: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ:**

پێغەمبەری خوا ﷺ لە زۆر فەرمودەدا ئەوەی دوپات كردۆتەوە كە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە لەوەدا كە پەیوەندی هەیە بە بەرپەرچدانەوەی دوژمنكاری‌و پابەندبوون بە سنوورەكانیەوە، لەوانە: (مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِه فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِه فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِه فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِه فَهُوَ شَهِيدٌ)[1] وە فەرمودەی (من قتل دون مظلمة فهو شهيد)[2] وە فەرموودەی (مَنْ شَهَرَ سَيْفَهُ ثُمَّ وَضَعَهُ فَدَمُهُ هَدَرٌ)[3] واتە شمشێرەكەی بەشێوەیەك بەكارهێنا مەبەستی پێی كوشتن‌و لێدانی خەڵكی بوو بە ناڕەوا. وە فەرموودەی (انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا نَنْصُرُهُ مَظْلُومًا فَكَيْفَ نَنْصُرُهُ ظَالِمًا؟ قَالَ: تَأْخُذُ فَوْقَ يَدَيْه)[4] واتە لە ستەم كردن قەدەغەی بكەی، پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی: (ئەی

---

[1] رواه الترمذی عن سعيد بن زيد وقال حديث حسن صحيح بروانە جامع الترمذی ٤/٦٨١ ژمارەی فەرموودە ١٤٤٠ بروانە سنن أبی داود بشرح عون المعبود ٣/١٢١.

[2] سنن النسائی ٧/١١٧ ژمارەی فەرموودە (٤٠٩١).

[3] مسلم بە شەرحی نەوەوی ٣/١٦٣.

[4] بوخاری گێڕاویێتی یەوە بەشەرحی فتح الباری ١٢/١٨٥ موسلیمیش گێڕاویەتی یەوە بە شەرحی نەوەوی ١١/١٥٩–١٦٠ ژمارەی فەرمودە ٤٠٩٧.

پێغەمبەری خوا ئەگەر بینیت[1] کەوا پیاوێك هاتو ویستی سامانەکەم بەرێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (فلا تعطه مالك= سامانی خۆتی مەدەرێ)، پیاوەکە وتی ئەی ئەگەر شەڕی لەگەڵدا کردم، فەرمووی: (أقتله) بیکوژە، پیاوەکە وتی: ئەگەر ئەو منی کوشت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فأنت شهید) ئەوا تۆ شەهیدی، پیاوەکە وتی: ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هو في النار) ئەو لە ئاگردایە[2].

**سێیەم: کۆڕایی (الاجماع):**

زانایانی شەرعناس کۆڕان لەسەر ڕەوایەتی بەرگی شەرعی بە پاڵپشتی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، کۆڕایی لەو بارودۆخەدا سەرچاوە نیە بەڵکو ئەوە دوپاتکردنەوەی ئەوەیە کە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە، بۆیە پێناسەی زانایانی بنەماکانی فقهی بۆ کۆڕا بەسەردا جێبەجێ نابێ[3].

**چوارەم: عەقڵی ساغ:**

عەقڵی ساغ بڕیاردەدا لە دروستی هەموو ئەوانەی کە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دا هاتووە، پاشان عەقڵی ساغ وادەخوازێت کە دەستدرێژی بۆکراو لەژێر ڕەحمەتی دەستدرێژیکاردا بەبێ بەرگری بەجێ نەهێڵرێت، هەتا ئەوکاتەی پەنا دەباتە بەر دەسەڵاتی گشتی یاخود بەرگەی ئازاری دەستدرێژی یەکە دەگرێت، بەو پێیە بەرگری شەرعی دادەنرێت بە مافێك یاخود ئەرکێك وە هۆکارێك لە هۆکارەکانی ڕێپێدان، کارێکی پەسەندو شیاوە بەبڕیاری عەقڵی ساغ، سەرچاوەکانی لەیاسادا قەتیس دەمێنێتەوە لە یاساکانی سزادانو یاساکانی پاداشتو سزا.

---

[1] واتە لەبارەی حوکمەکەیەوە هەواڵم پێ بدە.

[2] سنن النسائی بەشەرحی السیوطی ۱۱۷/۷.

[3] کاتێ زانیمان کەوا ڕێکەوتنی ئومەتی موحەممەدی لەسەرە ﷺ لەسەدەیەك لە سەدەکاندا لە پاش کۆچی دوایی خۆی لەسەر بڕیاری شەرعیو ئاشکرایە کە بڕیاری بەرگری شەرعی ئیجتیهادی نیە لەبەر ئەوەی دەقی لەسەر هەیەو ئیجتهادیش لە شتێکدا نیە کە دەقی لەسەر هەبێت.

**دووه‌م: سازاندنی به‌رگری شه‌رعی:**

سازاندنی هه‌موو ده‌سته‌واژه‌یه‌ك بریتی یه له دیاری كردنی سیفه‌ته شه‌رعی یه‌كه‌ی یاخود یاسایی یه‌كه‌ی له‌لایه‌نی سروشته‌وه، مه‌به‌ست له سازاندن لێره‌دا، بڕیاره شه‌رعی یه‌كه‌ی یاخود یاساییه‌كه‌یه‌تی سه‌باره‌ت به به‌رگری كار، شه‌رع زانان جیاوازییان هه‌یه تیایدا.

أ- تیایاندا هه‌یه ده‌ڵێ ئه‌وه به‌ره‌هایی پێویسته (واجب)ه.

ب- هه‌یانه وای ده‌بینێ كه به‌ره‌هایی مافه (حه‌قه).

ت- هه‌شیانه درێژه‌ی پێداوه‌و وتویه‌تی: به‌رگری كردن له ئابڕو پێویسته‌و له بێجگه له‌ئابڕوش مافه، جا هه‌ركه‌سێك هه‌وڵیدا ده‌ستدرێژی بكاته سه‌ر ئابڕوو ئه‌وا له‌سه‌ر هه‌موو ئه‌و كه‌سانه‌ی توانایان هه‌یه پێویسته به‌ره‌پچی ئه‌نجامدانی ئه‌و هه‌وڵه بده‌نه‌وه، ئیتر ئه‌وه‌ی مه‌ترسی ده‌ستدرێژكردنه سه‌ر ئابڕووی له‌سه‌ره هی خۆی بێت یاخود ئابڕوی كه‌سێكی تر بێت.

پ- زۆریه‌ی شه‌رع زانه‌كانیش ده‌ڵێن: به‌رگری كردن له سامان‌و دارایی مافه‌و له‌سه‌ر بێجگه له‌وه (واجب) پێویسته، په‌سه‌ندتر ئه‌وه‌یه سه‌باره‌ت به بێجگه سامان‌و دارایی پێویستی یه‌كی ڕه‌هایه، به‌ڵام سه‌باره‌ت به دارایی ئه‌گه‌ر دارایی یه‌كه له‌خۆی دا گرنگ بوو یاخود سه‌باره‌ت به خاوه‌نه‌كه‌ی، ئه‌وا ئه‌ویش بڕیاری ئه‌وانی تری هه‌یه له پێویست بوون، ئه‌گینا پێویست نیه نه له‌سه‌ر خاوه‌نه‌كه‌ی وه نه له‌سه‌ر كه‌سانی تر، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی دارایی به پێچه‌وانه‌ی بێجگه له‌خۆی قه‌ره‌بوو ده‌كرێته‌وه.

ج- ئاڕاسته‌ی مه‌سیحیه‌ت كه هه‌ندێك یاسا پێی كاریگه‌ربوون، پێی وابوو بۆ سازاندن به‌وه‌ی كه به‌هانه‌یه‌كه، كاره تاوانكاریه به‌كارهاتووه‌كه له‌به‌رگری شه‌رعی دا له سیفه‌ته تاوانكارییه‌كه‌ی جیانابێته‌وه‌و دانارنرێ، به‌ڵام ڕێگره له سزادان، جا هه‌ركه‌سێك به‌رگری له‌خۆی یاخود له ئابڕووی یاخود له سامان‌و دارایی خۆی كرد به‌كردارێك له بنه‌ڕه‌تدا تاوان بێت، ئه‌وا پێویسته له‌سه‌ری داوای لێخۆشبوون

لەخوا بکاتو تەویە بکات لە تاوانەکەیو، لەسەر بەرگری کار پێویست بوو پەنابباتە بەر ڕاکردن لە دەستدرێژیکار ئەگەر توانیو ڕاکردن هۆکارێك بووە بۆ رزگار بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا وتویانە: لەسەر ئادەمیزاد پێویستە بەرگری لە مافی کەسانی تر بکات هەروەکو چۆن بەرگری لەمافی خۆی دەکات، ئەو بیروبۆچونە کەنیسەیی یە لە سازاندنی بەرگری شەرعی بەوەی کە بەهانەیەکی رێگرە لە سزادانو لە هۆکارەکانی رێپێدان نیە، دزەی کردە ناو یاسادانانی فەرەنسی یەوە لەسەردەمی کۆنیدا، جا بکوژی بەرگریکار لەخۆی، بە بڕیاری یاسا نەدەبەخشرا، بەڵکو لەسەری پێویست بوو داوای لێخۆش بوون لە پادشا بکاتو بەسەری رووتو لەسەر ئەژنۆکانی داوای لێخۆشبوون پێشکەش بکاتو، بچێتە زیندان هەتا فەرمانی سزادانەکە دەردەچێ، هەرچەندە دلوای لێخۆشبوون رەت نەدەکرایەوە، ئەگەر رون بوایەتەوە کە ناچاربوونێك هەیە بۆ بەرگری کردن لە ژیان، لەدوای شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٩٨دا یاسادانەری فەرەنسی لەو بیروبۆچوونە پاشگەز بوەوەو گەڕایەوە بۆ بیروبۆچونو فیکرەی پێشوو لە یاسای رۆمانیو بەرگری کردنی دارا بە مافو لە هۆکارەکانی رێپێدان لە یاسای سزادانەکان کە لە ساڵی ١٨١٠دا دەرچووەو (م٣٢٨) دەقی لەسەر ئەوە هەیە لە بەشی کوشتنو برینداریو ئەوەش گوێزرایەوە بۆ یاسای میصری[1].

## سێهەم: پەرەسەندنی مێژوویی بۆ بەرگری شەرعی

بەرگری لە دژی دەستدرێژی خوویەکی سروشتی یە بۆ هەموو بونەوەرێکی زیندوو کە بەویستی خۆیان دەجوڵێن، ئیتر ئادەمیزاد بن یاخود گیاندار، بەرگری کردنیش دادەنرێت بە کۆنترین هۆ لە هۆکارەکانی رێپێدانی سروشتیو دابو نەریتیو یاسایی، بەڵام بە پەرەسەندن دا تێپەڕی کردووە دەتوانین لەمانەدا کورتیان بکەینەوە:

---

[1] الأستاذ القللي سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٣٠٢.

مافی بەرگری کردنی شەرعی بەشێوەیەکی تایبەت دەستی پێ کرد کە تاکەکەس بەخۆی ئەنجامی دەدا یاخود بە هاوکاری لەگەڵ کەسانی تر لە ڕۆڵەکانی بنەماڵەکەی یاخود هۆزەکەی، بەو شێوازە مایەوە هەتا دامەزراندنی دەوڵەت، کە لەدوای دامەزراندنی، دەوڵەت هەستا بە پاوان کردنی مافی بەرگری لەو تاکانەی ملکەچن بۆی بۆ خۆی، بەو پێیەی دیاردەیەکە لە دیاردەکانی سەروەری دەوڵەت، بەوپێیە وای لێهات هەموو مافێك کە یاسا دەیپارێزێ بوو بەئەرکی سەرشانی دەوڵەت وەکو بنەماو ڕێسا، بەڵام بۆ تاکەکەس هەیە ئەو مافە ئەنجام بدات بەدەر لەو ڕێسایە، لەبارودۆخەکانی دیارنەبوونی دەسەڵات و نەتوانینی پەنابردن بۆی.

لەو ڕاستی یەوە بەرگری شەرعی گەشەی کرد کە یەکەم مافێکی سروشتی هەموو تاکێك بوو بەئازادی ئەنجامی دەدا، پاشان ملکەچی یاسا کرا لەلایەنی ڕێکخستن‌و سەروەری دەوڵەت لەبواری جێبەجێ کردن دا.

بەرگری شەرعی لەمیانەی گەشەسەندنیدا، سروشتی زیادەڕەوی‌و کەم‌و کوڕی وەرگرتووە،[1] زیادەڕەوی و بەخشینی بێسنوور لە بەکارهێنانی توندوتیژی‌و هێزدا بەبێ کۆت‌و بەند، لە یاسای ڕۆمانی دا ئاشکرا بوو، لە کاتێکدا بەرگری شەرعی بە مافێکی سروشتی ئەژمار دەکرا کە یاسای سروشتی داوێتی یە دەستدرێژی بۆکراو بەبێ ئەوەی مل کەچ بێت بۆ هیچ مەرجێك یاخود پێوەندێك.

ئەو ڕەهایی و زیادەڕەوی یە لەوتەیەکی مارس تولیوس نوسەری سیاسی ڕۆمانی بەناوبانگ بە (شیشرون) ١٠٦–٤٣ ق.م دەردەکەوێ: (لە جەنگی چەکدا، یاسا دەنگی نیە).

هەروەکو بەزایەدان و کەموکوڕی زۆریش لە ڕێنمایی یە مەسیحی یەکاندا دیارە کە خەریکە سیفەتی ڕەوایی بەرگری شەرعی دەسڕێتەوە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو ڕێنماییانە وەکو پەرچەکردارێك هاتن بۆ ئەوەی ئەوسا بەسەر بەرگری

---

[1] الأفراط تێپەڕاندنە لە ستووری خۆی لەلایەنی زیادەوە.

شەرعیدا زاڵببوو لە توندوتیژیو گیانی تۆڵەسەندنەو ڕووبەڕوو بوونەوەی شەڕ بەشەڕ، کە توندوتیژتر و مەترسیدارتر بوو. نمونەی بەزایەدانیش لەبەرتیشکی ئەو ڕێنومابیانەی کە لە عەهدی تازەدا (عهد الجديد= إنجيل متى)[1] هاتووە، کە ئەمە دەقەکەیەتی (بەڵام من پێتان دەڵێم بەرگری لەشەڕ مەکەن، بەڵکو ئەوکەسەی شەپازلەیەك لەڕومەتی ڕاستت دەدات تۆ ڕومەتەکەی تریشتی بۆ وەربگێڕە، ئەو کەسەش کە دەیەوێ شەڕت پێ بفرۆشێتو کراسەکەت ببات تۆ چاکەتەکەشتی بۆ بەجێ بێڵە، هەرکەسێکیش میلە ڕێیەك سوخرەیی پێکردی تۆ دوو میل لەگەڵیا برۆ).

لەژینگەی عەرەبی دا[2]، لەسەرەتاوە بەرگری شەرعی لە کۆمەڵگەی عەرەبی دا وەکو هەرکۆمەڵگەیەکی تری سەرەتایی، خۆی دەبینیەوە لە سروشتی تۆڵەسەندنەوە لەدەستدرێژیکار یاخود لەوکەسانەی کە سەر بە خانەوادە یاخود هۆزەکەی ئەون، بەرگریکردنێکی شەرعی بە تێگەیشتنە ڕاستەکەی لەئارادا نەبوو، ئەگەر کەسێك لە بنەماڵەیەك یاخود لە هۆزێك دەستدرێژی کردە سەر کەسێك لە بنەماڵەیەك یاخود لە هۆزێکی تر، ئەوا بەرپەرچ دانەوەی ئەو دەستدرێژی کردنە بە پاڵنەری تۆڵەسەندنەوە لە کەسی دەستدرێژی بۆ سەرکراو یاخود کەسانی تری خزمانی دەبوو وەکو باسمان کرد، جاری واش هەبوو دەستدرێژی بۆ سەر کەسێکی تر دەبویە هۆی ئەنجامی خراپو نەرێنی بەڵکو دەگۆڕا بۆ جەنگە بەردەوامەکان کە چەندین ساڵی دەخایاند لەنێوانی هۆزی دەستدرێژی کارو هۆزی دەستدرێژی لەسەرکراو، پاشان لەپاش تێپەڕبوونی ڕۆژگار بیرو بۆچوونی ئاژاوەگێڕیو تۆڵەسەندنی هەڕەمەکی گۆڕا بۆ بیروبۆچونی تەسلیم کردنی تاوانبار بەدەستی بنەماڵە یاخود هۆزی تاوان لەسەر کراو، جا ئەگەر بیان ویستایە دەیانکردە کۆیلەو ئەگەر بیان ویستایە ئەوا دەیانکوشت، ئەگەر بیان کردایە بە بەندە ئەوا ئەو کەسە کەسێتی یاسایی خۆی لەدەست دەدلو

---

[1] الأصحاح الخامس (٣٩–٤١).

[2] فلسفة وتأريخ القانون الجنائي الأستاذ الدكتور علي راشد محاضرات الدراسات العليا في القانون المطبوعة على الرونيو لاپەڕە ٥١.

دەبووە بەشێك لە (شتو مەك)ی گەورەکەی، وەکو هەرماڵو سامانێکی گوێزراوە دەفرۆشرلو دەکڕاو هەرچیەکی دەست بکەوتایە لە ژیانیدا ئەوا دەبووە شتو مەکی گەورەکەی لەبەرئەوەی ئەو شیاوی ئەوەی نەبوو کە ببێتە خاوەنی شتومەك.

پاشان بیروبۆچونی تەسلیم کردن (دان بەدەستەوە) پەرەی سەند بۆ بیرۆکەی (خوێنپێدان) لەلایەن تاوانبارەوە یاخود لەلایەن هۆزەکەی دەدرایە خاوەنی خوێنو خانەوادەی تاوان لەسەرکراو، ئەوەی کە لەبارەی (خوێنسەندنەوە بوو) لەبەشی دووهەم دا باسی کرا، پاشان ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات بەرگری شەرعی دیاری کردو پایەو مەرجو حوکمەکانی ڕونکردەوە بڕیارەکانیو سیستمی تۆڵەو خوێنسەندنی پوخت کرد بۆ پاراستنی ڕێزی ئادەمیزادو کەسێتی یەکەیو قەدەغەکردنی زیادەڕەوی لەسەر تاوانبارو لەسەر کەسانی ترو بنەمای تاوانو بنەمای کەسێتی سزادان لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا بڕیاری لەسەر دراوە لەو ئایەتە پیرۆزانە دەفەرموێ (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ)[1] هەروەها دەفەرموێ (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى)[2] هەروەها ئایەتی (مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا)[3].

وە بەو شێوەیە چەندین دەق هەیە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ژیانی ئادەمیزادو ئابرویو سامانو دارایی دەپارێزێو بە ناڕەوا دەستدرێژی کردنە سەری حەرامو قەدەغە دەکات.

[1] سوورەتی بەقەرە ١٩٤.

[2] سوورەتی ئەنعام ١٦٤.

[3] سوورەتی مائیدە ٣٢.

# جێباسی سێهەم:
# بناغەی بەرگری شەرعی و شوێنەوارەکەی

بناغەی هەموو شتێك ئەوەیە کە جگە لەخۆی لەسەری دادەمەزرێت، بناغەی بەرگری شەرعی سەرچاوەکەی‌و توخمەکانی نیە، بەڵکو بریتیە لە بەهانە فەلسەفیەکەی بۆ ڕەوابوونی، دوای ئەوەش کردویەتیە هۆیەك لە هۆکارەکانی بۆ گۆڕینی کاری تاوان بۆ کاری ڕێپێدراو بە داڕنینی لە سیفەتە تاوانکاریەی، وەدەرهێنانی لەوەی کە ئەو دەقە شەرعیە دەیگرێتەوە کە بە تاوانی داناوە، بەپێی ڕێسای تایبەتمەندی گشتی یاخود پابەندکردنی ڕەها.

چەندین بیردۆز هاتووە لەبارەی دیاری کردنی بناغەی بەرگری شەرعی‌و هیچ یەکێك لەوانە خاڵی نیە لە خەوش یاخود کەم‌و کوڕی یاخود واقیع و راستەقینە نەپێکان، هەوڵ دەدەین لەمەودوا بەناوبانگترین‌و گرنگترین ئەو بیردۆزانە بە کورتی بخەینەڕوو:

**یەکەم: بیردۆزی ناچارکردنی (زۆرلێ کردن)ی مەعنەوی[1]:**

ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە کە بەرگری شەرعی پشت دەبەستێ بە بەرگری کەسی کە هەڵدەقوڵێت لەدەروونی دەستدرێژی بۆ سەرکراو و، کاریگەربوونی بە پەستاندنێکی ناڕەوا لەلایەن کەسێکی ترەوە، کە ترس‌و تۆقاندن لەدڵی دا دروست دەکات، لە پاش ئەوە پاڵی پێوە دەنێ بۆ ئەوەی حەزی لێ ناکا لە بارودۆخی نەبونی ناچاری‌و زۆرلێ کردن دا بیکات.

---

[1] ئەوەیە کە لە فیقهی ئیسلامی دا دەوترێت (الآکراه الملجیء ).

ئه‌وه‌ی كه‌ به‌رگریكار له‌دژی ده‌ستدرێژی كار پێی هه‌ڵده‌ستێت له‌و بارودۆخی ترسه‌ په‌یدابووه‌ كه‌ توشی ده‌بێتو له‌ پێویستی یه‌كانی سروشتی خۆنه‌ویستی یه‌، بۆیه‌ بواری به‌رپرسیارێتیی نیه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به‌ هه‌ڵبژاردنی خۆی تاوانه‌كه‌ی ئه‌نجام نه‌دلوه‌، به‌ڵكو ئه‌و ناچاركراوه‌و راپێچكراوه‌ بۆ ئه‌نجامدانی تاوانه‌كه‌، ئه‌و خۆی هیچ ویستو هێزێكی نه‌بووه‌، جا كاره‌كه‌ی پاڵ نادرێ به‌لای هه‌ڵه‌وه‌ كه‌ له‌ گرنگترین پایه‌كانی به‌رپرسیارێتی یه‌، زۆرێك له‌ نوسه‌ره‌كانی سه‌ده‌ی تازه‌ له‌ ئه‌ڵمانیا مه‌یلیان به‌و ئاراسته‌یه‌دایه‌[1].

ئه‌و بیرۆزه‌ له‌ چه‌ند ڕوویه‌كه‌وه‌ ڕه‌خنه‌ی لێ گیراوه‌ له‌وانه‌:

١- به‌رگریكار ئه‌وه‌ی ده‌یكات به‌ ویستی ئازادانه‌ی خۆی كاره‌كه‌ی ئه‌نجامداوه‌ له‌وپه‌ڕی ئاگاداریو هۆشیاری خۆیدایه‌، كه‌ هه‌موو هێزی ژیریو به‌ده‌نی خۆی له‌ده‌ستیدایه‌، كاتێ بریاری له‌ چه‌ندێتی ترسناكی ده‌ستدرێژی كردنه‌كه‌ دادات و هۆكاری گونجاوی بۆ لابردنی هه‌ڵبژاردووه‌، هه‌رچه‌نده‌ ده‌رفه‌تی ته‌سكی بوه‌ له‌ هه‌ڵبژاردنه‌كه‌ی.

٢- زۆر لێ كردن مه‌عنه‌وی بێت یاخود مادی، خۆی له‌خۆی دا به‌ربه‌ستێكه‌ له‌ به‌ربه‌سته‌كانی به‌رپرسیارێتی سزادانیو به‌ربه‌ستی به‌رپرسیارێتی سزادان به‌ره‌هایی گشتگیرتره‌ له‌ هۆكاری ڕێپێدان، جا چۆن داده‌نرێت به‌ بناغه‌ بۆ ڕێپێدانی به‌رگری شه‌رعیو دارنینی كردار له‌ سیفه‌ته‌ تاوانكاری یه‌كه‌ی، دوای ئه‌وه‌ش لابردنی هه‌ردوو به‌رپرسیارێتی سزادانو مه‌ده‌نی.

٣- ئه‌گه‌ر خۆمان دابه‌ده‌ستی مشتومڕێكه‌وه‌ كه‌ بناغه‌كه‌ی بریتی یه‌ له‌ زۆرلێكرن له‌ بارودۆخی به‌رگری شه‌رعی له‌ ژیانیو ئابڕوی یاخود دارایی یه‌كه‌ی، جا چۆن ده‌بێته‌ بناغه‌ بۆ به‌رگری كردن له‌ ژیانی كه‌سێكی تر، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی له‌م بارودۆخه‌دا خۆبه‌خشانه‌ به‌بژارده‌ی خۆیو ویستی خۆی به‌رگریه‌كه‌ ده‌كات.

[1] الاستاذ الدكتور محمد مصطفى القللي في المسؤولية الجنائية لاپه‌ره‌ ٣٠٥.

٤- وەرگرتنی ئەو بیردۆزە وا دەکات لە تۆمەتباری هەڵهاتو نەپرسرێتەوە لەسەر بەرگریەکەی لە دژی ئەو کەسەی لەلایەن دەسەڵاتی گشتی یەوە دەیانەوێ دەستگیری بکات، لەبەر ئەوەی لەو بارودۆخەدا واخۆی دەبینێ کە زۆری لێ کراوە لەسەر بەرگری کردنەکە بەپێی پێویستی حەزو ئارەزووی، بۆیە بەرگری دەکات لەوەی لە بەرژەوەندی خۆی دا نیە.

جا بەپێی ئەو ڕەخنانەو تێبینیانە ناگونجێت کە زۆر لێ کردن بکرێتە بناغەیەك بۆ بەرگری شەرعی.

**دوهەم: بیردۆزی پاداشتی شەر بەشەر:**

ناوەڕۆکی ئەو بیردۆزە ئەوەیە کە بەرگری کار بە تاوان کارییەك هەڵدەستێ بەهۆیەوە بەرپەرچی تاوانێکی دەستدرێژکار دەداتەوە، ئەوەش لە داشکاندن(المقاصە) دەچێت لە قەرزەکان و لە پابەندییە مەدەنیەکاندا، جا بناغەکە داشکاندنە(المقاصە) لەنێوانی شەڕی دەستدرێژی کارو شەڕی دەستدرێژی بۆسەرکراودا، ئەگەر بە داشکاندنو تۆڵەوەرگرتنەوە لەکۆڵ کەوت، ئەوا بیانوو نامێنێتەوە بۆ پرسینەوە لە بەرگری کار، جا پاداشتی شەڕ بەشەڕ سزای تۆڵەو سزای مەدەنی لەسەر دانامەزرێ، دوای ئەوەش لێپرسراوێتی سزادانو لێپرسراوێتی مەدەنی ڕووبەڕووی بەرگری کار نابێتەوە.

ئەو بناغەیەش لە چەند ڕوویەکەوە وتو وێژ هەڵدەگرێت لەوانە:

١- (المقاصە= داشکاندن) پێویستی بە یەکسانی هەردوولا هەیە، ئەو یەکسانی یەش لە بەرگری شەرعی دا نایەتەدی، لەکاتێکدا کە شەڕی دەستدرێژی کار تەنها هەڕەشەیەکە بە مەترسی دەمودەستی، شەڕی دەستدرێژی بۆسەر کراو لەوانەیە کوشتن بێت.

٢- ئەو ڕاو بۆچونە بەرگری شەرعیو مافی سزادانی تێکەڵ کردووە، یەکەمیان سزادان نیە بەڵکو هۆیەکە بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو مەترسیەی کە دەورەی داوە.

٣- ئەگەر وتەكە ڕاست بێت كەوا بەرگری شەرعی وەڵامدانەوەی شەڕ بەشەڕە، ئەوا نەدەبوو دەسەڵاتی گشتی رێگە بدات بە سزادانی دەستدرێژیكار لەسەر تاوانی دەستدرێژییەكەی لەدوای بەرپەرچدانەوەی بە بەرگری كردن، ئەگەر بەرگری كردنەكە نەبێتە هۆی تیاچونی جەستەی بەتەواوی، لەبەر ئەوە ناشێت كەسێك لەسەر یەك تاوان دووجار سزا بدرێت، لەكاتێكدا كە دەستدرێژی كار لە ژیان دا مابێت لە پاش دەستدرێژی یەكەی و بەرگری لێكردنەكەی، ئەوا ڕەوانەی دادگا دەكرێت بۆ پرسینەوە لێ ی و لێپێچینەوەو سزادانی.

**سێهەم: بیردۆزی بەریەك كەوتنی بەرژەوەندییەكان و سەرخستنی بەرژەوەندی بەرگریكار.**

ئەو بیردۆزە لەسەر بناغەی بیرۆكەی هاوسەنگی لەنێوانی بەرژەوەندییە بەریەك كەوتووەكان دادەمەزرێت، لەبەر ئەوەی یاسا هەروەكو پارێزگاری لە مافەكانی دەستدرێژی بۆسەركراو دەكات بە هەمان شێوەش مافەكانی دەستدرێژی كار دەپارێزێ، جگە لەوە دەستدرێژی كار خۆی پاراستنی مافەكانی خۆی فەوتاندوە بەوەی دەست پێشخەر بووە لە دەستدرێژی... لەسەر ئەو بناغەیە یاسا رێدەدا بەرژەوەندی یەكی كەم بەهاتر (بەرژەوەندی دەستدرێژی كار) بكرێتە قوربانی لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندی بەهادارتر (بەرژەوەندی دەستدرێژی بۆ سەركراو).

ئەم بناغەیەش لە چەند رووەوە ڕەخنەی لێ گیراوە:

١- بنەما لە یاسادا بریتی یە لە پاراستنی هەموو مافەكان بە چاوپۆشی لە پلەی گرنگێتی، لەرووی پارێزگاری یاسایی یەوە پلەپلەیی بۆ گرنگی نیە.

٢- ئەگەر ڕاستە كەدەستدرێژی كار مافی پاراستن لەدەست دەدات وەكو ئەو مافەی دەستدرێژی كردۆتە سەر، ئەوا ئەنجامە لوجیكیەكەی ئەوەیە كە دز پاراستنی ماڵی خۆی لەدەست دەدات لەبەر دەستدرێژی كردنی بۆ سەر ماڵی كەسی تر، هەروەها مافی پاراستنی ئابرووی خۆی لەدەست دەدات لەبەر ئەوەی

دەستدرێژی کردۆتە سەر ئابڕووی کەسانی تر و بەو شێوەیە، ئەوەش کارێکە لە تەرازوی شەرعو ژێری یاسادا جێگەی نابێتەوە.

٣- ئەو هۆکارە بۆ بەهانەی بەرگری شەرعیو دانانی لە هۆکارەکانی ڕێپێدانو دوای ئەوەش کەوتنی دەستەبەرکردنی سزایی و دەستەبەرکردنی مەدەنی، ئەگەر بۆ دەستدرێژی کارە خاوەن شایستەییەکان وابێت، ئەوا نابێتە بەهانەی بەرگری شەرعی لەدژی کەسە نەشیاوەکان، لەبارودۆخی دەستدرێژی کردنیاندا بۆ سەر مافەکانی کەسانی تر، لەبەر ئەوەی ناکرێت بوترێت کە ئەوان بە ویستی خۆیان مافی خەڵکیان فەوتاندووە، بۆیە مافەکانیان کە یاسا پاراستوویەتی فەوتاندوویانە.

**چوارەهەم: بیردۆزی سەرخستنی یاسا**

پشتیوانانی ئەم بیردۆزە پاساوی ڕەوایەتی بەرگری شەرعی دەهێننەوەو دایدەنێن بەهۆیەك لە هۆکارەکانی ڕێپێدان، بەوەی کە دەستدرێژی تاوانکاری نکوڵی کردنە لە حوکمی یاساو بەرپەرچی دانەوەی ئەو نکوڵی کردنەو نکوڵی کردنی نکوڵی کردن سەلماندنە، دوای ئەوەش بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی بە دەستدرێژی پشتگیری یە لە یاساو سەرخستنێتی.

لەو ڕەخنانەی کە دەتوانرێت ئاراستەی ئەو بیردۆزە بکرێت ئەوەیە کە ئەگەر ئەو فیکرەیە وەرگیرا ئەوا دەشێ هەموو کەسێك نوێنەرایەتی دەسەڵاتی گشتی بکات، مادام ڕەفتارەکەی یاسا سەردەخاتو پشتگیری دەکات، ئەوەش ناپەسەندو نەویستراوە لەبەر ئەوەی بەرگری لە تاك و لە کۆمەڵگە لە دیاردەکانی سەروەری دەوڵەتە، بەڵام خۆتێهەڵقورتاندن بەبێ بەهانەی یاسایی دەستدرێژی یە بۆ سەر ئەو سەروەری یە.

**پێنجەم: فیکرەی گەڕانەوە بۆ بنەما:**

ناوەڕۆکەکەی بریتیە لەوەی کە هەر تاکێك بەرگری لەخۆی بکات، هەروەکو لەپێش دامەزراندنی دەوڵەتدا وابوو، لەپاش دامەزراندنی دەوڵەت مافی بەرگری لە

كەسەكەوە گوێزرایەوە بۆ ئەو كۆمەڵگەیەی كە دەوڵەت نوێنەرایەتی دەكات لەبەر ئەوەی كۆمەڵگەكە (یاخود دەوڵەتەكە) بەتواناترە بۆ ئەو بەرگری كردنەو كردەوەكەشی دوورترە لە پشێوی، بەڵام تاك نزیكترە لە ڕوودانی پشێویو تەشەنەكردنی نەشیاو، بەڵام ئەگەر دەسەڵاتی گشتی كە نوێنەرایەتی كۆمەڵگە دەكات نەیتوانی بەهانای تاكێك بێت كە توشی مەترسی دەمودەستی بووە لەكاتی دەستدرێژی كردنەكەدا، ئەوا لەسەری پێویستە مافە بنەڕەتیەكەی بۆخۆی بگێڕێتەوە لە پاراستنی خۆی یان ئابڕووی یاخود سامانو داراییەكەی، لەبەر ئەوەی كۆمەڵگەكەی توانای پارێزگاری لێكردنی نیە یاخود دیار نیە. بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو بیرو بۆچوونە چەند تێبینییەك هەیە، لەوانە:

١- ئەو بیرۆكە تا ڕادەیەكی زۆر كاریگەرە بە بیردۆزی گرێبەستی كۆمەڵایەتی جان جاك ڕۆسۆ و پەیڕەوانی، لە دەسبەرداربوونی تاكەكان لە مافەكانیان بۆ كۆمەڵگە بەرامبەر پاراستنی كۆمەڵگە بۆیان. ئەو فیكرەیەش ئەندێشەییەو لە چنراوی خەیاڵ نایەتە دەرەوەو ڕاستی یەكی بەرجەستەی نیە لە مێژووی مرۆڤایەتی دا، لەبەر ئەوەی وێنەی ئەو گرێبەستە لە سەردەمێك دا پێشبینی ناكرێت كە هۆكارەكانی گواستنەوە لەنێوانی خێزانە ئادەمیزادییە لێك دوورەكاندا نەبووە، كە هەندێكیان شوێنی هەندێكیان نەزانیوە.

٢- لەو بیرۆكەیەدا تێكەڵییەك هەیە لەنێوانی بەرگری و لەنێوانی سزادان دا لەبەر ئەوەی تاك كاتێ كە بەرگری لەخۆی دەكرد لەپێش دەوڵەت دا، بەرگری كردنەكەی لەسەر بناغەی سزادانی دەستدرێژی كار بووە.

٣- ئەگەر وامان دانا ئەو فیكرەیە قبوڵكرا بۆ بەهانە هێنانەوە بۆ بەرگری كردنی كەسەكە لەمافی خۆی ئەوە ناگونجێ ببێتە بەهانە بۆ بەرگری كردن لە مافی كەسانی تر، لەكاتێكدا كە بەرگری كردنی شەرعی گشتی گشتگیرە بۆ بەرگری كردن لە مافەكانی بەرگری كارو مافەكانی كەسانی تر، ئەگەریش ئەو كەسەی تر هیچ پەیوەندی نەبێ پێوەی.

**شەشەم: فیکرەی پاڵنەری ڕێزدار**

ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە کە دەستدرێژکار بە دەستدرێژی کردنە سەر بەرژەوەندی کەسانی تر، پەردە لەسەر مەترسی یەکەی بۆ سەر کۆمەڵگە دەبات، ئەو بەرگریکارەی دەستدرێژی کراوەتەسەر کە مەترسیی دەستدرێژکارەکە بەرپەرچ دەداتەوە، کارێکە خزمەت بە بەرژەوەندی کۆمەڵگە دەکاتو مەترسی دەستدرێژکاری لێ دوور دەخاتەوە، جا کارەکەی لە رووی دادوەری کۆمەڵایەتیەو ڕیشەکێش کردنی ڕەگەکانی ئەو مەترسی یە لەبەرژەوەندی کۆمەڵگەکەیە، ئەوەی بەرگری کار پێی هەڵدەستێت هەڵقوڵاوی ئەو واقیعەیە، بۆیە بە هۆیەکی ڕێپێدان دادەنرێت و لێپرسراوێتی بە هەموو جۆرەکانیەوە لەسەر لادەچێت.

تێبینی لەسەر ئەو بیرۆکەیە ئەوەیە بارودۆخێك ناگرێتەوە کە هەریەك لە دەستدرێژی کارو دەستدرێژی بۆسەرکراو شەڕانی و مەترسی دار بن بۆسەر کۆمەڵگە، جا مانەوەی یەکێکیان و لەناوبردنی ئەوی تریان لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەدا نی یە.

**حەوتەم: پاراستنی مەبەستەکانی یاسادانەر و بەرژەوەندییەکانی خەڵکی**

ئەو بناغەیە بۆ بەرگری شەرعی ئەوەیە کە شەریعەتی ئیسلامی هەر لەسەرەتایەوە بڕیاری لەسەر داوە، لەبەر ئەوەی مەبەستەکانی شەرعو قانون بریتی یە لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەو تاکەکان، قورئانی پیرۆز دەقی لەسەر ئەو ڕاستی یە هێناوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ) ئاشکراشە ئەو دارشتنە وتەیی یە (النفی بعد النفی) (نکوڵی کردن لە پاش نکوڵی کردن) لە تەرازووی زانستی ڕەوانێژی دا بۆ قەتیسکردنە، جا خوای پەروەردگار ئامانجی پەیامەکەی پێغەمبەر ﷺ قەتیسدەکات لە هێنانەدی بەرژەوەندیەکانی خێزانی ئادەمیزادی، لەبەر ئەوەی (الرحمە) بەمانانی بەرژەوەندی ئادەمیزادی یە، ئیتر ئەو بەرژەوەندیە ئەرێنی بێ (سودێکی هێنراو بێت) یاخود نەرێنی بێ (زیانێکی دوورخراوە) ئیتر ماددی بێت یاخود مەعنەوی، دنیایی بێت یاخود قیامەتی.

لەسەر ئەو بناغەیە بەرگری لە بەرژەوەندی ڕەوا ئەركێكە بۆ پاراستنی، ئیتر ئەو بەرگری كردنە لەلایەن دەسەڵاتی گشتی بێت یاخود لەلایەن تاكەكان بێت، لەبەر ئەوەی هەمووان لێپرسراون لەو پارێزگاری كردنە، هەروەكو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه)[1].

خۆ ئەگەر بەرگری شەرعی لە هەموو ئادەمیزادێك داڕنرا، ئەوا دەكەوێتە بەردەم مەترسی دەمودەستییەوە، ئەوەش دەبێتە هۆی هاندانی خراپەكاران لەسەرزەوی دا بۆ ڕۆچوون لە دەستدرێژی كردنە سەر گیانو ئابڕو و سامانو دارایی بێ تاوانان، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتدار بە تەنیا توانای ئەوەی نیە خراپەكاری نەهێڵێ، لەسەر ئەو بناغەیە نە لەبواری تاوان سزایی و نە لەبواری مەدەنیدا لێپرسینەوە لەو كەسانە ناكرێت كە هاوبەشی دەكەن لە دابینكردنی سەقامگیریو دڵنیایی و دوورخستنەوەی تارمایی ئاژاوەگێڕیو خراپە كردن لەسەر تاك و كۆمەڵگە.

## سروشتی بەرگری شەرعی و شوێنەوارەكەی.

بەرگری كردنی  شەرعی هۆیەكە خاوەن سروشتی بابەتی یە لەدوو ڕووەوە:

یەكیان لەلایەنی كەسێتیەوە كە لەبنەڕەت دا توخمێك لە توخمەكانی كەسێتی بەرگری كار لەخۆی ناگرێت.

دوهەم: لەڕووی شوێنەوارییەوە دەكەوێتە سەر كرداری بەكارهاتوو لە لابردنی مەترسی دەستدرێژی كار نەك بۆ كەسی بەرگری كار.

بەڵام كیانە بابەتیەكەی لێكدانەوەكەی وەهایە كە هۆكاربوونەكەی بۆ ڕێپێدان دابین دەكات، وەكو هەموو هۆكارێكی ڕێپێدان، دەگەڕێتەوە بۆ بوونی بنەمای یاسایی، كە ڕەهایی دەقەكانی بەتاوان دانان سنوردار دەكاتو گشتی یەكانی تایبەت دەكات، جا پەردە لادان لەسەر هۆكاری ڕێپێدان، جا بەرگری شەرعی بێت یاخود شتی تر، وەكو ئەنجامدانی ئەركو بەكارهێنانی مافو شتی تر، بەراوردێك دەكرێت

[1] الهيثمي/ مجمع الزوائد ٥/٢١٠ روي بإسنادين واحد اسنادي الأوسط رجاله رجال صحيح.

لەنێوانی ڕێسای بەتاواندانانو ڕێسای ڕێپێدانو، سازاندن لەنێوانیان دا دەکرێت بە پابەندکردن یاخود تایبەتمەندکردنی یەکێکیان بۆ ڕەهاکردن یاخود گشتگیری ئەوی تر، بەبێ ئەوەی ئەوە داوای توێژینەوە لە باری دەروونی تاوانبار بکات، مەگەر لەبارودۆخە ناوەزەکان دا وەکو نیێتێکی چاکی تێپەڕێنەر لە سنوورەکانی بەرگری و خراپی نیێتو مەبەستی.

بەڵام سروشتی بابەتی بۆ شوێنەوارەکانی بەرگری شەرعی، مەبەست لێی پەیوەندی ئەو شوێنەوارەیە بە سازاندنی یاسایی بۆ کارەکە، بەچاوپۆشی لە شیاوی دەستدرێژی کارو دەستدرێژی بۆ سەرکراو.[1]

لە گرنگترین ئەو شوێنەوارانەی لەسەر سروشتی بابەتیی بەرگری شەرعی وەستاوە ئەمانەن:

١- کاریگەری هۆکاری ڕێپێدان هەموو کەسێك دەگرێتەوە کە هاوبەشی لە بەرگری یەکە کردبێت، جا هەرکاتێ توخمەکانی بەرگری شەرعی هەبوون، ئەوا کارەکە دەبێتە کارێکی ڕەوای ڕێپێدراو، هەموو ئەو کەسانە سوودی لێ دەبینن کە هاوبەشی تیایدا دەکەن، ئیتر جیاوازیەك لەنێوانی بکەرو هاوبەش دا نامێنێ، جیاوازیش نامێنێ لەنێوانی ئەو کەسەی کە بەرگری لە خۆی یاخود لە ئابرووی یاخود لە ماڵو سامانی دەکاتو لەنێوان ئەو کەسەدا کە بەرگری لە کەسێکی تر یاخود لە ئابڕوی یاخود لە دارایی یەکەی دەکات.

هەرکەسێکیش کەسێکی تر هان بدات لەسەر بەرگری کردن یاخود هاوکاری بکات یاخود ئاسانکاری پێشکەش بکات بۆ بەرگری شەرعی، سوود لە ڕێپێدان وەردەگرێت. فەلسەفەکەی ئەمەش ئەوەیە، کاری ڕەواو ڕێپێدراو نابێت بکرێتە دەبێتە جێگەیەك بۆ هاوبەشیی سزادانی، ئیتر ئەگەر ئەو هاوبەشە بکەرەکە بێت یاخود هاوبەش بێت.

---

[1] د. محمود نجیب حسن، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١١٢، المبادیء العامة في قانون العقوبات، د.علي حسین خلف و د.سلطان الشاوي، لاپەڕە ٢٤٥.

ئەوەی شایەنی باسە ئەو ڕێسایە تایبەتە بە باروئۆخی بەرگری شـەرعی یـەوەو ڕەها نیـە، لـە هۆكارەكـانی تـری ڕێپێـدان دا جێبـەجێ ناكرێـت لەبـەر ئـەوەی هۆكارەكانی ڕێپێدان دوو جۆرن:

هۆكارە ڕەهاكان، وەكو لە بەرگری شەرعی تایبەتو بەرگری شەرعی گشتی دا هەیەو، هۆكارە ڕێژەییەكان هەروەكو لە ئەنجامدانی ئەركی سەرشاندا سەبارەت بە لێپرسراوان لە دەوڵەت یان بەكارهێنانی ماف سەبارەت بە ئەدەبدادان لەلایەن هاوسەرانو باوكانو بێجگە لەوانیش، لەوانەی کـە دەسـەڵاتی ئـەدەب دادانیـان هەیە.

جا ئەو جۆرە ڕێژەییە تیایدا پاراستنی توخمی كەسێتی تیایدا ڕەچاوكراوە بـۆ بكەر، جا مێرد بەتەنیا ئـەدەبی ژنەكـەی دادەدات، هـەروەها بـاوكو مامۆسـتاو فەرمانبەرو پزیشكو وەرزشەوان لە یاری یە وەرزشـیەكانو شـتی تـریش دا لـە هۆكارەكانی ڕێپێدانی ڕێژەیی.

سوود لە هۆكاری ڕێپێدان وەرناگیرێ ئەگـەر ئـەنجام دانـی ئـەركێك بێت،كـەس پێی هەڵناسێت مەگەر كەسێك كە خـاوەنی پلەیـەكی دیـاریكراو بێـت، یـاخود سیفەتێكی دیاریكراوی هەبێت، وەكو لە بەكارهێنانی دەسەڵاتی گشـتی، كـەس سوودی لێ نابینێ مەگەر یەكێك كارمەندی گشـتی بێـت، وە لـەكارە پزیشـكیو نەشتەرگەریەكان دا، سوود لە هۆكارەكانی ڕێپێدان وەرنـاگرێ مەگـەر خـاوەنی سیفەتێكی كاری پزیشكی بێت یـاخود لـە هاوكـارانی بێـت وەكـو یاریـدەدەری پزیشكیو پەرستارو نەخۆشەوانو بەنج كەرو هاوشێوەیان بێت.

٢– لە شوێنەوارەكانی بابەتیەكانی بـەرگری شـەرعی لـە بـواری هۆكـاری یـەوە بـۆ ڕێپێدان، ئەوەیە ئاگادارنەبوون لەواقیع كاریگەریی لەسەر ڕاستی نابێـت لەسـەر گۆڕانی كاری ناڕەوا بۆ ڕەوا یاخود ئامانجی ناڕەوا[1] بۆ ڕەوا.

---

[1] د. محمود نجیب حسنی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١١٣.

جا هەرکەسێ مەترسی یەکی لادا لەسەر خۆی یاخود لەسەر ئابرووی یاخود ماڵو سامانی، یاخود لەسەر کەسێکی ترو ئابرووی یان ماڵو سامانیو، نەشیزانی کە ئەو وا لەبارودۆخی بەرگری شەرعی دا، ئەو نەزانینو بۆچوونە هەڵەیە هیچ کاریگەری نیە لەسەر ڕەوایەتی کارەکەی، مادام مەرجە شەرعیو یاساییەکان تیایدا هەبێ، هەروەها پێچەوانەکەی ئەگەر هەستا بەکارێك لە دژی کەسێكو وای دەزانی کە وا لە بارودۆخی بەرگری شەرعی داو بۆچوونەکەی هەڵە بوو، ئەوە کاریگەری لەسەر واقیعەکە نابێت کە بریتییە لەوەی ئەو لە بارودۆخی بەرگری شەرعی دا نی یە، کارەکەی بە ڕێپێدراو دانانرێتو بۆچوونی هەڵە کارە نارەواکەی ناگۆڕێت بۆ کاری ڕەوا.

٢- هەڵە لە توخمەکانی بەرگری شەرعی دا واقیع ناگۆڕێت، خۆ ئەگەر بەرگریکار گومانی وابێت کەوا توخمێك لە توخمەکانی بەرگری کردن بوونی نیە، لە کاتێکدا لە ڕاستی دا هەبووە، ئەو هەڵەیەی تێی کەوتوە کاریگەری نی یە.

هەروەها پێچەوانەکەی ئەگەر گومانی وابوو کە هەموو توخمەکانی بەرگری شەرعی هەن وە گومانەکەشی هەڵەبوو، ئەو گومانە ڕەچاو ناکرێت، بەڵکو کار بە واقعەکە دەکرێت، جا بەرگری کارەکە لە بارودۆخی بەرگری شەرعی دانانرێت.

لەسەر ئەو ڕێسا شەرعیو یاسای یەی کە دەقی لەسەر هاتووە لە مادەی (٧٢) لە گۆڤاری (الأحكام العدليه)دا (لا عبرة بالظن البين خطؤه) گومانی هەڵەی ڕون ئیشی پێ ناکرێت.

ئەو ڕێسایە لە مەسەلە تاوانکاریو مەدەنیەکان دا وەکو یەك جێبەجێ دەکرێن، لەو بابەتە مەدەنیانەی لەسەر ئەو ڕێسایە دامەزراوە ئەوەیە، ئەگەر کەفیل قەرزەکەی دایەوەو ئەسڵەکەش قەرزەکەی دابویەوە یان قەرزدەرەکە ئازادی کردبوو، بەڵام نەیزانبوو، بۆی هەیە بگەڕێتەوە لای خاوەن قەرز بۆ ئەوەی داویەتی وەریبگرێتەوە.

هەندێ لە یاساكان وەكو یاسای سزادانی عێراقی (م/٤٢و م/٤٦)و كوێتی (م/٣٤و م٣٨) كار بە مەترسی وەهمی دەكات لە بەرگری شەرعی دا، ئەگەر لەسەر هۆكاری مەعقول و بەنیازپاكی بیناكرابوو لە ئەنجام دانی ئەرك دا.

## هەڵوێستی یاساكانی سزادانی عەرەبی لە بەرگری شەرعی دا:

یاساكانی سزادان لەسەر چارەسەركردنی توخمەكانی بەرگری شەرعیو بڕیارەكانی بەیەك شێواز ڕێك نەكەوتون، وەك ڕێك نەكەوتنیان لە یاسادانانەكانی تر، بەڵكو لە هەندێك خاڵدا یەك دەگرنەوەو جیاوازن لە خاڵەكانی تردا، سەرەڕای بوونی هەندێك كەمو كوڕیو ناتەواوی لە هەندێكیاندا، لە ڕووەكانی ڕێك كەوتنەوە: پێناسەكردنی بەرگری شەرعی بەوەی بەكارهێنانی هێزی پێویستە بۆ بەرگرتن لە مەترسی دەمودەستی ناڕەوا كە هەڕەشەی ئازاردان دەكات، كە مافێكە یاسا دەیپارێزێ لەوانە: بەرگری شەرعی لە هۆكارەكانی ڕێپێدانە ئەگەر پایەو مەرجەكانی هاتنەدی لەگەڵ بوونی جیاوازیش لە هەندێ لە وردەكاریدا.

لەوانە: پایەكانی بەرگری شەرعی دوانن: مەترسیو ئەو كردارەی كە بەرپەچی ئەو مەترسی یە دەداتەوە، هەریەكەش لەوانە مەرجی خۆیان هەیە، گرنگەكانیان ئەمانەن:

## مەرجەكانی مەترسی:

**مەرجی یەكەم**: بوونی مەترسی بە ڕوودانی دەستدرێژی ناڕەوا، هەریەكە لە یاسای سزادانی لوبنانی[1] (م/١٨٤)و سووری (م/١٨٣)[2]و ئەردەنی (م/٦٠)[3] دەستەواژەی (تعرج غير محق= دەستدرێژی ناڕەوا) لە جیاتی مەترسی بەكارهێناوە، یاسای

---

[1] بەمەرسومی (فەرمانی باڵای ژمارە (٣٤٠) لە ١/ئازار/١٩٤٣ دەرچووە.

[2] بەمەرسومی (فەرمانی باڵای ژمارە (١٤٩) لە ٢٢/حزيران/١٩٤٩ دەرچووە.

[3] ژمارە (١٦)ی ساڵی ١٩٦٠.

بەحرینی (م/٤٩)[١]: (القوه أو العنف غير المشروعين= هێز یاخود توندوتیـژی نـاڕەوا) بـەکارهێناوه، قەتـەری[٢] (م/٣١)و تونسـی (بەشـی/٣٩) مـەغریبی (بەشـی/١٢٤) دەستەواژەی (الصـائل= دەسـتدرێژیکار) بـەکارهێناوه، کـه دەسـتەواژەی زانایـانی شەریعەته، عێراقـی لـه (م/٤٢)[٣] و لیبـی (م/٧)[٤] و میصـری (م/٢٤٦)[٥] دەسـتەواژەی (الجريمه=[٦] تاوان)ی بەکارهێناوه.

**مەرجی دووەم:** مەترسی یەکە هەڕەشە بکات بە ئازاردانی بەرژەوەندییەك کەیاسا بیپارێزێ له (کەسێك یاخود ئابڕوویێك یاخود ماڵو دارایی یەك)، زۆریەیان بەڕاشـکاوی باسی ئابڕووی نەکردووه لەسەر ئـەو بناغەیـەی کـه لـەناو تێگەیشـتنی (کەسـەکە)و جێگەی دەبێتەوه.

لەو یاسایانەی که بەڕاشکاوی باسی کردووه، یاسای سزادانی ئیماراتی یـەکگرتوو (م/١٣-١٤)و یاسای کـوێتی (م/٣٤)، ئـەم یاسـایانه جیاوازییـان نـەکردووه لـەنێوانی ئەوەی ئەو بەرژەوەندییانه که توشی مەترسی دەبن، سەر به کەسی بەرگریکارکەیـه یاخود هی کەسانی تره، بێجگە له یاسای تونسی که لەبەشـی (٣٩)دا دەقـی لەسـەر هاتووه لەسەر دیاری کردنی ئەو کەسی تره که دەبێـت لـه نزیکـەکانی بـەرگری کـار بێت، ئەوانەش بریتین له چینی (بنەڕەتەکانو لقـەکانو برایـانو خوشـکانو مێـردو ژن).

بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی که توشی مەترسی یەکە بوو لەوانە نەبوو، ئەوا بۆ دادوەر هەیە که (اجتهاد= هـەوڵ دان)ی خـۆی هـەبێت بـۆ مەزەنـدەکردنی بەرپرسـیارێتی.

---

[١] له ١٧/مایو/١٩٥٥ دەرچووه، هەموارکردنەکەشی له ١٨/یونیه/١٩٦٩ دەرچووه.

[٢] به یاسای ژماره (١٤)ی ساڵی ١٩٧٠ دەرچووه.

[٣] ژماره (١١١)ی ساڵی/١٩٦٩.

[٤] به مەرسومی (فەرمانی باڵا)و ٢٨/نوفمبر/١٩٦٢ دەرچووه.

[٥] ژماره/٥٨ی ساڵی/١٩٧٣ المعدول.

[٦] واته ئەگەر تەولو بوو دەبێته تاوان، مەبەست له وشـەی (الجريمـه= تـاوان) تـەولوکردنی ڕوودانـی دەستدرێژی کردنه.

هەندێکیش[1] وای دەبینن کە مەبەست لەو دەقە ئەوەیە کە بۆ دادوەر هەیە بەرگری لەبەرژەوەندی کەسانی تر بە بارودۆخی سوککراو دابنێ.

**مەرجی سێهەم:** دەبێ مەترسی یەکە دەمودەست بێت، واتە هەرئێستە بێت: لەپێشتردا باسمان کرد کە مەترسی بە دەمودەست دادەنرێ، لە یەکێك لەو دوو بارودۆخەدا:

یەکەمیان: مەترسی یەکە خەریك بێ ڕووبداتو هێشتا ڕووی نەدابێ.

دوهەم: دەستی پێ کردبێو هێشتا تەواو نەبووبێ.

سوود لەو مەرجە وەردەگرێ لە زیاتر لە یاسایەکی سزایی عەرەبی بەڕاشکاوی یاخود لەناوەوەدا، لەو یاسایانەی کە بەڕاشکاوی ئاماژەی بۆ دەکەن یاسای عێراقی (م/٤٢)و سوری (م/١٨٣)و ئەردەنی (م/٦)و لوبنانی (م/١٨٤)و جەزائیری (م/٣٩) لەژێر دەستەواژەی (خگر الحال= مەترسی دەمو دەست کە خەریکە ڕوودەدات).

**مەرجی چوارەم:** نەتوانینی پەنابردنە بەر دەسەڵاتی گشتی بۆ بەرپەرچدانەوەی مەترسی یەکە، ئەو مەرجەش زیاتر لە یاسایەکی عەرەبی بەڕاشکاوی یان ناڕاشکاوی باسیدەکات، لەو یاسایانەی بەڕاشکاوی ئاماژەی بۆ دەکات، یاسای عێراقی (م/٤٢)و میسری (م/٢٤٧)و لیبی (م/٧٠)و سودانی (م/٥٩)و قەتەری (م/٢٧).

شایەنی باسە هەندێ لە یاساکانی عەرەبی مەرجی پێنجەمیان[2] بۆ مەترسی داناوە تا ببێتە بەرگری کردن لە هۆیەکانی ڕێپێدان بێت، کە ئەوەیە دەستدرێژی بۆسەرکراو هۆکاری جوڵاندن بۆ دەستدرێژی کردن نەبووبێت، وەکو یاسای ئەردەنی (م/٦٠)و سوری (م/٢٩)و لوبنانی (م/١٨٤)و بەحرەینی (م٢٩)، بەڵام ئەو مەرجە ڕەخنەی لێ

---

[1] بڕوانە تعليقات محمد طاهر السنوسی علی المجلة الجنائية التونسية (چاپی/١٩٦٤ تونس لاپەڕە/٣٧ نقلاً عن یونس ألیاس مجموعة قوانين العقوبات العربية چاپی/١٩٧٣ لاپەڕە/٤١.

[2] بڕوانە: د.محمود مصطفی– أصول قانون العقوبات، لاپەڕە/٥٤ نقلا عن د.یوسف الیاس، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە/٣٩.

گیراوە بەوەی لەلایەنی کرداریەوە سەر بۆ چەند ئەنجامێك دەكێشێت كە ناتوانرێت پێی بگەینە ئەنجام. لەوانە:

نەتوانینی بەرپەرچدانەوەی زیادەڕەویی بەرگریكار لەسنوری بەرگری شەرعی، ئەگەر لەو زیادەڕەویە مەترسی ڕوودانی مردنی تیابێ، لەبەر ئەوەی ئەگەر دەستدرێژی نەكردایە ئەوا ئەو زیادەڕەویە ڕووی نەدەدا.[1] كە دەبێ بزانین بەرگری كردن لە دژی ئەو كەسەی سنوورەكان دەبەزێنێ دروستە، هەرچەندە بەرگری كار دەست پێشخەر بووبێت لە دەستدرێژی كردنەكەدا.

یاسادانەری عێراقی لەگەڵ ئەوەی بەڕاشكاوی دەقی لەسەر ئەو مەرجە دانەڕشتوە، بەڵام لە (م/٤٠٩)[2]دا هاتووە كە نابێت ڕوودانی مردن بەكاربهێنرێت بۆ مافی بەرگری شەرعی لە دژی ئەو كەسەی كە لەو بیانووە سوودمەند دەبێت (عذر مفاجأه الزوجه أو إحدی محارمه متلبسه بجریمه الزنا= بیانووی كتو پڕی بینینی ژن یاخود یەكێك لە مەحرەمەكانی لەكاتی تاوانی زینا كردن دا).

هەندێ كەس[3] ڕەخنە لە یاسادانەری عێراقی دەگرێت لە بەكارهێنانی دەستەواژەی (حق= ماف) لە (حق الدفاع الشرعی= مافی بەرگری شەرعی).

دەڵێن: كە بەرگری شەرعی ماف نیە، لەبەر ئەوەی ئەو بۆچوونە دەبێتە هۆی ئەوەی بوترێت پابەندییەكی بەرامبەر لەلایەن دەستدرێژكارەوە هەیە بە لەئەستۆگرتنی بەرگری كردنو ئەو بەرپرس دەبێت لە قەرەبووكردنەوە، ئەگەر كۆسپی خستە بەردەم بەرگری كار لە بەكارهێنانی مافی خۆی لەبەرگری كردن.

---

[1] بڕوانە: د.محمود مصطفی– أصول قانون العقوبات، لاپەڕە/٥٤ نقلاً د.یوسف الیاس المرجع السابق، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە/٣٩.

[2] تایبەتە بە كوشتنی خێزان (ژن) یاخود یەكێك لە مەحرەمەكانو هاوبەشەكەی لە كاتی تاوان دا بە زینا.

[3] د. محمود مصطفی ـ القسم العام ص٢٠٣..

ئەو ڕەخنەیە ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگیرێت كە ئەو گومانە لەسەر ئەوە دروست كراوە كە مەبەست لە وتەی (حق= ماف) لە مافی بەرگری شەرعی دا، مافی كەسی دارایی یە كە بەرامبەر بۆ پابەندبوونی دارایی، ئەو بانگەشەیەش ناڕەوایە، لەبەر ئەوەی مەبەست لە (حق) لە وێنەی ئەو پایەدا بریتیە لە دروستی و پلەو پایەی شەرعی یاخود (یاسایی)، كە لە توانای دا هەیە خاوەنەكەی سوودی لێ ببینێت.

**مەرجەكانی ئەو كارەی كە بەهۆیەوە بەرپەرچی مەترسی دەدرێتەوە:**

بە ڕاشكاوی یاخود ناڕاشكاوی لەزۆربەی یاساكانی سزادانی عەرەبی دا پێویستی دەكات دوو مەرج لەكاری بەرگری شەرعی دا هەبێت.

**مەرجی یەكەم:** دەبێ ئەو كارە پێویست بێت، واتە: تاكە هۆكاربێت بۆ بەرپەرچ دانەوەی مەترسی یەكە:

ئەگەر دەتوانرا لەو مەترسی یە دەرباز بێ كە هەڕەشە دەكات لەبەرژەوەندیەك لە بەرژەوەندیەكانی بەرگری كار یاخود كەسانی تر، لە مافە كەسی یاخود ئابرووی یاخود دارایی یەكان، كە یاسا پارێزگاری لێ دەكات، لە ڕێگای كارێكەوە كە بەتاوان نەژمێردرێت، ئەوە ڕێی پێ نادرێت لە بەرگری كردن دا كارێك ئەنجام بدات كە یاسا بە تاوان دای بنێت.[1]

لەو یاسایانەی كە ئاماژە بەو مەرجە دەكەن، یاسای عێراقی (م/٤٢-٣)و میسری (م/٢٣٦)و سوری (م/١٨٣)و لوبنانی (م/١٨٤)و ئەردەنی (م/٦٠)و جەزائیری (م/٣٩)و تونسی[2] (بەشی/٣٩)و مەغریبی (بەشی/١٢٤)، بەڵام لە یاسای لیبیاییدا (م/٧٠) دەق هاتووە لەسەر ئەوەی كە بەرگری شەرعی ڕێگە دەدات كەسێك بۆ ئەنجامدانی هەموو كارێك كە پێویست بێت بۆ بەرپەرچ دانەوەی مەترسی تاوانی دەستدرێژی كردن.

---

[1] د. محمود نجیب حسنی، القسم العام، لاپەڕە/٢٢١.

[2] گۆڤاری الجنائیة التونسیة لسنة/ ١٩١٣ المعدلة.

دەربڕینی ئەو مەرجە لە یاسای عێراقی یاخود تونسی ڕۆشن ترە وەك لە دەربڕینی لە یاسای سزادانەکانی تری عەرەبی، لەکاتێکدا یەکەم دەقی هەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێت لەبەردەمی بەرگری کاردا هۆکاری تر نەبێت بۆ بەرپەرچ دانەوەی مەترسی یەکە، دوهەم لەسەر پێویستی ئەوەی کە دەبێ بەرگری کار بەشێوەیەکی تر نەتوانێ لە مەترسی یەکە ڕزگاری بێت.

**مەرجی دوهەم:** دەبێ کاری بەرپەرچ دانەوەکە بگونجێ لەگەڵ مەترسی یەکەدا.

زۆرترینی یاسادانانە عەرەبی یەکان باسیان لەو مەرجە کردووە لەگەڵ بوونی جیاوازییان دا لە دەربڕیندا: دەربڕینەکە لە یاسای ئەردەنی دا (م/٦٠)و مەغریبی (بەشی/١٢٤): (مع الخگر= لەگەڵ مەترسی دا)، وە لە یاسای میسری دا (م/٢٤٦): (أن تستعمل ف الدفاع القوه اللازمه =لەبەرگری کردن دا هێزی پێویست بەکاربێنێ) وە لەیاسای عێراقی دا (م/٤٥): (بەرگری شەرعی ڕێ نادات بە ڕوودانی زیانێك کە توندتر بێت لەوەی کە پێویستە بۆ ئەو بەرگری کردنە) وە لە یاسای بەحرەینی دا (م/٣٩): (نابێ بەرگری کار پلەیەك لەهێز بەکار بێنێت یاخود ئازارێك پێك بێنێت گەورەتر بێت لەوەی پێویستو ژیرانە بێت). لە یاسای جەزائیریشدا (م/٣٩): (دەبێ بەرگری کردنەکە شیاو بێت لەگەڵ گەورەیی دەستدرێژی کردنەکەدا). لە یاسای سودانی دا (م/٥٨)و قەتەری (م/٢٦): (نابێ بەهەر بارێك بەرگری یە شەرعی یەکە زیانێك بگەیەنێت کە زیادەڕەویکردنی تیابێت لەبڕی پێویست بۆ مەبەستی بەرگری کردن).

ئەوەی پەیوەندی هەیە بە تاوانی دەستدرێژی کردنە سەر کەسەکان، کە بەهانەی کوشتنی دەستدرێژی کارە بۆ بەرگری کردن لەخۆی و لەکەسانی تر، بە ڕاشکاوی هاتووە لە یاساکانی عێراقی (م/٤٣)و میسری (م/٢٤٦)و لیبی (م/٧٠)و جەزائیری (م/٣٩)و مەغریبی (بەشی/١٢٥)و قەتەری (م/٢٤)و کوێتی (م/٣٣)و سودانی (م/٥٦) کە دەشێ دەستدرێژی کار بکوژرێت ئەگەر هاتو مەترسی یەکە بەشێوەیەك بێت ببێتە هۆی مردن یاخود توش بوون بە برینێکی سەخت.

ئه‌وه‌ی په‌یوه‌ندی هه‌یه‌ به‌ تاوانه‌كانی ده‌ستدرێژیی ناموس، یاساكانی عێراق‌و میسرو كوێت‌و لیبیاو قه‌ته‌رو یه‌مه‌ن‌و سودان ده‌قیان داناوه‌ له‌سه‌ر دروستی كوشتنی ده‌ستدرێژی كار له‌كاتی بوونی مه‌ترسی یه‌ك كه‌ هه‌ڕه‌شه‌ بكات به‌ ئه‌نجامدانی جوتبوون له‌گه‌ڵ كه‌سێكی مێدا یاخود ئه‌نجامدانی كاری نێربازی له‌گه‌ڵی یاخود له‌گه‌ڵ كه‌سێكی نێر، به‌زۆره‌ملێ، سه‌ره‌ڕای ڕێپێدانی كوشتن له‌ دژی ده‌ستدرێژیی ڕفاندنی ئاده‌میزاد.

سه‌باره‌ت به‌ ڕێپێدانی كوشتن له‌ به‌رگری كردن له‌ سامان‌و دارایی، یاساكانی عه‌ره‌بی جیاوازییان هه‌یه‌ له‌لایه‌نی سنووری ئه‌و سامان‌و داراییه‌ی ده‌ستدرێژی له‌سه‌ره‌: له‌ یاسای عێراقی (م/٤٤)و میسری (م/٢٤٦)و لیبی (م/٧٠)و جه‌زائیری (م/٣٩)و قه‌ته‌ری (م/٢٤)و مه‌غریبی (به‌شی/١٢٥)، ڕێگه‌ دراوه‌ به‌ كوشتنی ده‌ستدرێژی كار له‌ بارودۆخه‌كانی به‌شه‌و چوونه‌ ژووره‌وه‌ له‌ ماڵێكدا كه‌ ئاماده‌كراوبێ بۆ نیشته‌جێ بوون.[١] ئه‌گه‌ریش له‌كاتی ده‌ستدرێژی كردنه‌كه‌دا كه‌سی تیا نه‌بێت، یاخود یه‌كێك له‌ هاوپێچه‌كانی‌و دزینه‌كان‌و ئاگرتێ به‌ردانی به‌ ئه‌نقه‌ست.

یاسای تونسی له‌ (م/٤٠)دا ئه‌وه‌ی بۆ زیاد كردووه‌: تێكدانی په‌رژین كراوه‌كان‌و كون كردنی دیواره‌كان، هه‌روه‌كو یاسای سودانی‌و جه‌زائیری‌و تونسی‌و مه‌غریبی، تاوانی تالان كردنیشی بۆ زیاد كردووه‌.

## زیاده‌ڕه‌وی كردن له‌ به‌رگری شه‌رعی دا

سروشتی یه‌ كه‌ زیاده‌ڕه‌وی له‌ سنووری ژیری‌و په‌سه‌نده‌كاندا كه‌ به‌رگری شه‌رعی پێویستی ده‌كات، كارێكی چاوه‌ڕوان كراوه‌، له‌ ئه‌نجامی ئه‌و بارودۆخه‌دا كه‌ به‌رگریكار له‌ زۆربه‌ی كات دا زۆرێك له‌ هاوسه‌نگی خۆی له‌ ده‌ست ده‌دات.

مه‌به‌ستیش له‌ زیاده‌ڕه‌وی كردن به‌جێ نه‌هێنانی گونجاندنه‌ له‌نێوانی كاری به‌رگری كردن له‌ ده‌ستدرێژی بۆسه‌ر كراوو ئه‌و مه‌ترسی یه‌ی كه‌ له‌ده‌ستدرێژی

---

[١] له‌ سودانی‌و قه‌ته‌ری دا ماڵ ده‌وارو كه‌شتی نیشته‌جێ بوونیش ده‌گرێته‌وه‌.

کارەوە پەیدا دەبێت، دەگونجێت ئەو زیادەڕەوی کردنە بەنێتو مەبەستێکی باش بێتو لەوانەشە بەبێ ئەو نێتو مەبەستە بێت.

زانایانی یاساکانی سزادانی عەرەبی جیاوازییان هەیە لە چارەسەرکردنی بارودۆخی زیادەڕەوی کردن لە بارەی ئاستی بەرپرسیارێتی زیادەڕەوی کارو سزادانی.

لە یاسای سزادانی لوبنانی لە (م/١٨٤و م/٢٢٨)و سوری (م/١٨٣و م/٢٢٧) دەق هاتووە لەسەر سزانەدانی زیادەڕەوی کار ئەگەر لە بەرگری کردن دا زیادەڕەوی کرد و لە هەڵچوونێکی تونددا کارەکەی ئەنجامدا بەشێوەیەك هێزی عەقڵو ویستی لەگەڵیا لەدەست دابێت.

(م/٦٠/٣) لە یاسای ئەردەنی لەدوای ڕەوانەکردنی بۆ (م/٨٩) لەهەمان یاسا دەقی لەسەر هاتووە لەسەر ئەوەی کە دەگونجێت لە سزادانی بکەرەکە خۆش ببن، وا دەردەکەوێ کە ئەو یاسایە کارەکە مل کەچ پێ دەکات بۆ دەسەڵاتی هەڵسەنگاندنی دادوەری بابەتەکە، زۆربەی یاساکانی تر دەقیان هەیە لەسەر ڕێپێدانی سوککردنی سزادان بە مەبەستی سزادانی (کەتن= تاوانی بچوك) لە بارودۆخێکدا کە کاری بەرگری کردن بە تاوانی گەورە(جنایە) دابنرێت، هەروەکو لە یاسای عێراقی (م/٤٥)[1] و میسری (م/٢٥١)و کوێتی (م/٣٦)و قەتەری (م/٣٢)[2]دا هەیە.

وە لە (م/٣٠) یەمەنی[3] هاتووە کە ئەگەر کەسێك بەهۆی کەمتەرخەمی یەوە زیادەڕەوی کرد لە سنوورەکانی ڕێپێدانو ناچاری یاخود بەرگری شەرعی، لەسەر ئەو زیادەڕەوی کردنە سزا دەدرێت، ئەگەر یاساکە بە تاوان دایناو بەو باسەی کە تاوانێکی بە ئەنقەست نەبووە.

---

[1] (م/٤٥) یاسای عێراقی دەقی هەیە لەسەر ئەوەی (بۆ دادگا هەیە لە بارودۆخی زیادەڕەوی کردن دا بڕیار بدات بە سزادانی تاوانی بچوك لەجیاتی بەسزادانی تاوانی گەورە، وە بڕیار بدات بە سزادانی سەرپێچی کردنی لە جیاتی سزادانی تاوانی بچوك= کەتن).

[2] ئەو یاسایە دەقی هەیە لەسەر ئەوەی کە بۆ دادوەر هەیە کە دلیینێ بەکاتی سووکەڵەکرلو.

[3] ژمارە/١٢یساڵی/ ١٩٩٤.

وە (م/٥٨)ی یاسای سودانی لەسەر ئەوەیە كە: مافی بەرگری شەرعی لەهەر بارێك بێت لە گەیاندنی زەرەر بەدوور نییە بەوەی كە لەڕادەی پێویست تێپەڕێ بۆ مەبەستی بەرگری كردن.

**تێبینی یەكان لەسەر یاساكانی سزادانی عەرەبی لە بابەتی بەرگری شەرعی دا**

دەگونجێت ئەم تێبینیانە بهێنرێن لەسەر ئەو یاسایانە:

١- یاسای سزادانی كارپێكراوی عەمانی (ماددەكانی (١٠١-١٠٣)) تەنها چارەسەری بەربەستەكانی بەرپرسیارێتی تاوانكاری كردووە بەبێ ڕووكردنە هۆكارەكانی ڕێپێدان، بێجگە لەوەش لەنێوانی بەربەستەكانی سزادان و بەربەستەكانی بەرپرسیارێتی تاوانكاری تێكەڵی كردووە، ئەوەش كەم و كورتی یەكی یاسادانانەو پێویستە پێی بزانرێت.

٢- یاسی كارپێكراوی تونسی، بەشەكانی (٣٩-٤٠) ڕێپێدانی بەرگری شەرعی لە بەرژەوەندیەكانی كەسانی تری براندۆتەوە لە بنچینەكان و لقەكان و برا و خوشك و ژن و مێردی بەرگری كاردا، كەچی یاساكان بە پێچەوانەی ئەم پابەندبوونەوە ڕێكەوتوون و ڕێگەیان داوە بەڵكو پێویستیان كردووە لەسەر ئادەمیزاد كە بەرگری لە مافەكانی كەسانر تر بكات هەروەكو بەرگری لە مافەكانی خۆی دەكات بەرەهایی.

٣- لە یاسای كارپێكراوی یەمەنی (م/٢٧-٣٠)دا دژیەكی هەیە لەنێوانی (م/٢٧)و (م/٢٨)، لەبەر ئەوەی یەكەم دەق هاتووە لەسەر ڕێپێدانی بەرگری كردن لە مافەكانی كەسانی تر بەرەهایی، لە كاتێكدا دووهەم بەرگری كردنی لەكەسانی تر بە نزیكی و هاوسەرێكی یەوە پەیوەست كردووە[1].

---

[1] (م/٢٧) دەقی هێناوە لەسەر ئەوەی (باروئۆخە بەرگری شەرعی دەست بەكاردەبێت ئەگەر بەرگری كار مەترسی یەكی دەست بەجێی لەتاوان بینی لەسەر خۆی یاخود لەسەر ئابڕوی یاخود لەسەر كەسێكی تر یاخود ئابڕوی كەسێكی تر)، (م/٢٨) دەقی هەیە لەسەر ئەوەی ←

٤- یاسای کارپێکراوی لوبنانی[1] لە (م/٢٢٧-٢٢٩)دا لەژێر ناونیشانی (القوه القاهره= هێزی زاڵ) تێکەڵی کردووە لەنێوان بەربەرستی بەرپرسیارێتی تاوانکاری و هۆکارەکانی ڕێپێدان، هەموو ئەوانەی بەربەستی تاوانکارین بە هۆکار بۆ ڕێپێدانی داناوە، لەگەڵ ئەوەی بەربەستەکان بەرەهایی گشتگیرترن‌و هۆکارەکانیش بەرەهایی تایبەتترن، گشتیش بوونی تایبەت پێویست ناکات، بەبێ پێچەوانەکەی.

لەوەش زیاتر دەستەواژەی (لا عقاب= سزادان نیە)ی بەکار هێناوە لەبری (لا جریمە= تاوان نیە) لە کاتێکدا نکوڵی کردنی سزادان نکوڵی کردن نیە لە تاوان، (عدیم الاهلیه= کەسی نەشیاو) ئەگەر تاوانێکی ئەنجامدا لەسەری سزا نادرێت لەگەڵ ئەوەشدا کە پێی هەستاوە.

٥- یاسای ئەردەنی (م/٨٨-٩٠) لە ژێر ناونیشانی (القوه القاهره= هێزی زاڵ) ئەویش بەربەستەکانی بەرپرسیارێتی تاوانکاری‌و هۆکارەکانی ڕێپێدانی تێکەڵ کردوە، جا ئەوەی کە لەبەربەستەکانی لێپرسراوێتیَ تاوانکاری یە بەهۆیەك بۆ ڕێپێدانی داناوە وەك زۆر لێ کردن‌و ناچاری کە هەردوکیان لە بەربستەکانن، لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆکارەکانی ڕێپێدان ژماردونی.

٦- یاسای کارپێ کراوی سودانی (م/٤٥-٥٤) کەوتۆتە ناو چەند هەڵەی گەورەوە لەوانە: هەندێ کاریان داناوە بە هۆکارەکانی ڕێپێدان بەڵام ئەوەندە دوورن لێوەی

---

(بەرگری کردنی شەرعی ڕێگە نادات بە کوشتنی بە ئەنقەست مەگەر مەبەستی پێ‌ی بەرپەچ دانەوەی یەکێك لەم کارانە بێ:

١- کوشتن‌و برینێکی سەخت، ئەگەر برینەکە لەسەر بەرگری کار خۆی یاخود کەسێکی نزیکی بێ.

٢- دەست کردن بە زینا کردن یاخود نێربازی بەزەبری هێز لەسەر بەرگری کار یاخود هاوسەرەکەی یاخود مەحرەمەکەی.

٣- ڕفاندنی بەرگری کار یاخود هاوسەرەکەی یاخود کوڕەکەی یاخود یەکێك لە مەحرەمەکانی هاوسەرەکەی یاخود مەحرەمێکی.

[1] بە فەرمانی باڵای ژمارە/٣٤٠ لە ١/ئازار/١٩٤٣دا دەرچووە.

وەكو نووری ئاسمان لەزەوی یەوە، وەكو نەبوونی نییەت و مەبەستی تاوان كاری (م/٤٨)و بچوكی (م/٤٩)و شێتی و سەرخۆشی (م/٥٠)و ڕەزامەندی تاوان لەسەركراو (م/٥١)و زۆر لێ كردن (م/٥٢).

٧- یاسای سودانی[1] (م/٢٢٦-٢٢٨) باس لە زاراوەی (بەرگری شەرعی) ناكات، بەڵكو لەژێر ناونیشانی (القوة القاهرة= هێزی زاڵ)دا چارەسەری بابەتەكەی كردووە، پاشان دابەشی كردووە بۆ هێزی سەركەوتو و زۆر لێ كردن و بارودۆخی ناچاری، لەگەڵ ئەوەدا هەریەكە لەوانە لە هۆكارەكانی ڕێپێدان نین.

٨- یاسای سوری (م/١٨٣)و لوبنانی (م/١٨٤)و ئەردەنی (م/٦٠)و بەحرەینی (م/١٢٩) ئەوەیان كردۆتە مەرج نابێت دەستدرێژی لەسەركرلو هۆكارێك بێت بۆ دەستدرێژی كردنی دەستدرێژی كار، لەپێش تردا ڕوونكردنەوەی ئەوەو ئەو تێبینیانەی كە دەگەڕێنەوە سەری هاتووە.

٩- یاسای سزادانەكانی مەغریبی[2] (بەشی ١٢٤-١٢٥) چارەسەری بەرگری شەرعی كردووە لەژێر ناونیشانی هۆكارە بەهانەكان(الاسباب المبررة) كە تاوانەكان دەسڕنەوە، لەسەر ئەو یاسایە ئەوە تێبینی دەكرێ كە لە (بەشی/١٢٤)دا ناچاری لە هۆكارەكانی ڕێپێدان دانرلوە لەگەڵ ئەوەشدا لە بەربەستەكانی بەرپرسیارێتی تاوان كاری یە، وە لە (بەشی/١٢٥)دا بەرگری كردن لە كەس و بەرگری كردن لە دارایی تێكەڵ كردووە.

١٠-یاسای كارپێ كرلوی سزادانی قەتەری[3] (م/ ٢٣-٣٣) لەژێر ناونیشانی (بەرگری شەرعی) دادەنرێت بەوردترین و گشتگیرترین و ڕۆشن ترینی یاسا لەنێوان یاساكانی سزادانی عەرەبی دا لە چارەسەركردنی توخمەكانی بەرگری شەرعی و پایەكانی و لە تایبەتیەكانی ئەم یاسایە:

---

[1] بە فەرمانی باڵای ژمارە/١٤٩ لە ٢٢/حزیران/١٩٤٩دا دارچووە.

[2] ژمارە/٤٠٣-٥٩ لە ڕۆژی/٢٦ نۆڤەمبەر/١٩٦٢.

[3] بە یاسای ژمارە/١٤ لە ساڵی/١٩٧٠دا دەرچووە.

أ- بە ڕاشكاوی دەڵێت: بەرگری كردن لە ئابڕوو لە هۆكارەكانی ڕێپێدانە بە ڕەهایی.

ب- بۆ ماڵی تیادا نیشتەجێ بوو لە بەرگری شەرعی دا ئەمانە زیادكراوە: چادر، میوانخانە، بیری نەوتو هەموو داهاتێك لە داهاتەكانی سامانی گشتی.

بەو هۆیەوە كۆكردنەوەی كردوە لەنێوانی بەرگری شەرعی تایبەتو بەرگری شەرعی گشتی.

بەم بڕە كۆتایی بە توخمەكانو پایەكانی بەرگری شەرعی تایبەتی دێنن، تا باسی لێكۆڵینەوە لەسەر بەرگری شەرعی گشتی بكەین.

ئەوەی شایەنی باسە ئەو دەستەواژەیە (الدفاع الشرعي العام= بەرگری شەرعی گشتی) بەو دەربڕینە نە لە فیقهی ئیسلامیدا و نە لە یاسادا نەمبینیوە، بەڵام لە هەریەكەیاندا جێبەجێكردنی زانستیو كرداری زۆرهەن.

بەرگری شەرعی گشتی یان ناوخۆییە لە سنووری ناوچەی هەر وڵاتێكدایە، ئەمەش لە فیقهی ئیسلامیو ئەو یاسایانەی پێوەی كاریگەرن بەزاراوەی (الحسبە) ناوی لێ نراوە واتە: فەرمان كردن بە چاكەو قەدەغەكردنی خراپە.

یاخود دەرەكییە لەو لایەنەوە كە زۆربەی جار سەرچاوەی مەترسی لە دەرەوەی سنوورەكانەوە دێن، لە زاراوەی شەریعەتی ئیسلامدا زاراوەی (جیهاد)ی بۆ بەكاردێ.

وە لەیاسادا زاراوەی (الدفاع[1]= بەرگری) بەكاردەهێنرێت. پێوەری جیاوازی لەنێوانی بەرگری شەرعی تایبەتو بەرگری شەرعی گشتی (بەهەردوو بەشەكەیەوە) دووكاری بابەتیانەن:

---

[1] ماددەی/٥١ دەقی لەسەرە لە بەڵگە نامەی نەتەوە یەككگرتووەكاندا [illegible]سەر ئەوەی لەو بەڵگەنامەیەدا ئەوە نیە كە لاواز بكرێت یاخود كەم بینێ مافی سروش[illegible]ی بۆ دەوڵەتەكان بە تەنها یاخود كۆمەڵەكان لە بەرگری كردن لەخۆیان، ئەگەر هێزێكی چەكدا دەستدرێژی كردە سەر یەكێك لە ئەندامەكانی (وڵاتە یەككگرتووەكان).

یەكەمیان: سەرچاوەی مەترسی یەكە لە تایبەتی دا هەمیشە ناوخۆییەو لە گشتیش دا دەگونجێ ناوخۆیی بێ دەشگونجێ دەرەكی بێت.

دوهەم: ئەوەی كەوتۆتە بەر مەترسی یەوە مافی تایبەتە لە لەبەرگری شەرعی تایبەتی دا، هەروەكو لەپێشدا تێپەڕی، مافی گشتی یە لەبەرگری شەرعی گشتی دا، ئیتر ئەگەر ناوخۆیی بێت یاخود دەرەكی بێت، بۆیە لێكۆڵینەوە لەسەر بەرگری شەرعی گشتی بەرهەدوو بەشەكەیەوە دەكەین لەدووبەشی داهاتوودا.

بەرگری شەرعی گشتی ناوخۆیی یاخود هەرێمی لە هەر وڵاتێك یاخود ناوچەیەكی دیاری كراو لەرووی جوگرافی یاخود كارگێڕی یاخود ڕامیاری یەوە، لە فیقهی ئیسلامی دا پێی دەوترێت (الحسبه) كە بریتیە لە فەرمان كردن بە چاكە ئەگەر واز لێ هێنانی دەركەوت، وە قەدەغەكردنی خراپە ئەگەر كردنی دەركەوت.

(الحسبه) لە زمان دا هەستانە بە كارێك كە سوودی گشتی تیادا بێت لەبەر خوای پەروەردگار لەبەر ئارەزو و حەزكردن لە كرێو پاداشتەكەی.

ئیبن منظوری ئەنصاری[1] دەڵێ: (الحسبة) سەرچاوەی ئەژمار كردنی كرێیە لەسەر خوای پەروەردگار، دەڵێی وەك ئەژماركردن (الحسبة) ئەنجامم دا، ئەژماركردن(الاحتساب) داواكردنی كرێیە، ناوی (الحِسبة) بە (دانانی ژێرە) بریتیە لە كرێ.

لە زاراوەی شەرعیش دا: فەرمان كردنە بە چاكە ئەگەر وازهێنانی دەركەوتو بڵاوبوو، وە قەدەغەكردنی خراپەیە ئەگەر نەكردنی دەركەوتو ئاشكرابوو.[2]

لێكۆڵینەوە لەسەر ئەو بەشە لەبەرگری شەرعی گشتی ناوخۆیی دابەش دەكەین بۆ سێ باس

یەكەم بۆ سەرچاوەكانیو چۆنیەتی

دوهەم بۆ توخمەكانیو بناغەكەی.

سێهەم بۆ بەراورد لەنێوانی و لەنێوان زاراوە پەیوەندی دارەكان.

---

[1] لسان العرب لأبن منظور (جمال محمد بن مكرم الأنصاري) (٦٣٠-٧١١) الدار المصرية للتأليف والترجمة فصل الحاء حرف الباء ١/٣٠٥.

[2] ئیبن خلدون لە پێشەكیەكەیدا لە لاپەڕە/٢٥٢دا دەڵێ: الحسبة: ئەركێكی دینی یە لە (باب= دەروازە)ی فەرمان كردن بەچاكەو قەدەغەكردنی خراپە.

# جێباسی یەکەم:
# سەرچاوەکانی بەرگری شەرعی گشتی ناوخۆیی (الحسبة)و چۆنیەتیەکەی

سەرچاوە شەرعی یەکانی لە شەریعەتی ئیسلامیدا بریتی یە لـە قورئـانی پـیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر و ئیجماع و ژیری ساغ.

**یەکەم: قورئانی پیرۆز:**

أ- قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتێکدا بەڕاشکاوی فەرمانی پێ کردووە، لەوانە (وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)[١].

داڕشتنی (لتكن) فەرمانەو هەموو فەرمانێکیش لە واجب بووندا حەقیقەتەو بۆ لـە پێویست بوون بەکاردەهێنرێت، ئەگەر بەلگەیـەك لەسـەر پێچـەوانەی ئـەوە نـەبێت، پێویست بوونەکـە لـەو ئایەتـەدا نمونەیەکـە بـۆ خـاوەن مـافێتی (الحسـبە)و بـەپێی پێویست لە (الحسبە)ی خۆبەخشی، جا ئەگەر هەندێ کەس لـە تاکـەکانی کۆمەڵگـە پێی هەسـتان ئـەوا بەرپرسـیارێتی یەکـە لەسـەر هـەمووی لادەچـێ، ئەگـەر وانـەبێ هەمووان گوناهبار دەبن.

وەپیتـی (مـن) لـە (مـنکم)دا بـۆ ڕوونکردنەوەیـە بـە پێچـەوانەی هەنـدێ لـە موفەسیرەکانەوە کە وای بۆچوون بۆ بەش کردنە لەسەر ئـەو بناغەیـەی کـە هـەموو

[١] سوورەتی ئالی عیمران/١٠٤.

ئادەمیزانێك شیاو نی یە بۆ ئەوەی فـەرمانكردن بـە چـاكەو قەدەغـەكردنی خراپـە، بەڵام مەرجی ئەو شیاوی یە لە سروشتی كارەكەوە دەردەكەوێت.

وای دەبینم چۆنیەتیەكە بە ڕوونكردنەوەیی تەواوترە لەبەر ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئـەوەی كـە فـەرمانكارو قەدەغـەكار لەهـەموو كۆمەڵگایەكدا دەبـێ لـە كۆمەڵگەكـە خۆیەوە بێت بۆ لەبەرچاوگرتنی سەروەری یەكەی.

بۆ نمونە لەكاتی ئێستادا دەوڵەتی عێراق لەلایەن وڵاتی ئەمریكاوە[1] داگیر كـراوە. جـا پێویسـتە فـەرمان بـە چـاوێری كردنـی ڕژێمـی دیمـوكراتی و قەدەغـەی تـرس و تۆقاندن و كاول كاری و زیادەڕەوی كردنە سەر ژیانی بێ تاوانـان، لـە عێراقـی یـەكان خۆیان بێت نەك لەلایەن ئەمریكی یەكانەوە.

مەبەستیش لە (الأمە) بریتیە لە كۆمەڵ و نەوە.

لەو ئایەتەدا خوای پەروەردگار سەكەوتن و سەرفرازی ئادەمیزادی لەهەردوو ژیانی دونیاو قیامەتی بەستۆتەوە بە هەستان بەو بەرپرسیارێتی یە لەبەر گرنگی یەكەی لە پاراستنی مافەكانی تاك و كۆمەڵگەدا، لەكاتێكدا جێبەجێكردنی سیستەمی (الحسـبە) بە بەشێكی گرنگ ئەژمار دەكرێ لە پێویستیەكانی دڵنیایی بەختەوەری ئادەمیزاد لە هەموو كات و شـوێنیكدا، لـەبواری هێمنـی و سـەقامگیری و پاراسـتنی گیـان و ئـابڕوو سامان و داراییەوەو پاراستنی هەموو مافە ماددی و مەعنەوییـەكانی ئـادەمیزادە، كـە لەوانەیـە دوچـاری مەترسـی دەسـتدرێژی ئـەو كەسـانەی بێتـەوە كـە سـەركێش و خراپەكارن لە زەوی دا.

ئەوەی شایەنی باسە دەستەواژەی (منكر) لە (المعصیة) گشتگیرترەو فراوانترە، هەموو (معصیە)یەك مونكەرە، نەك پێچـەوانە گشـتی یەكـەی، لەبـەر ئـەوەی كـارە ناڕەوا ئەنجامدراوەكان لەلایەن شێتێك یاخود لە كەم عەقڵێكەوە یاخود لە منداڵێكەوە

---

[1] لەدوای ڕوخانی ڕژێمی بەعس لەسەروشـیەوە سـەدام حسـەین لـەڕۆژی ٢٠٠٣/٤/٩دا، عێراق وای لێ هات بووە داگیركراو لەلایەن دەوڵەتی ئەمریكاوە، وە دلوا لەخوای پەروەردگار دەكەین كە گـەلی عێراقی ڕزگار بكات لەو داگیركردنە حوای گەورە بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە.

کە جیاکاری نەزانێ، ئەوانەش کە بڕیاری ئەمانە دەیانگرێتەوە، لە مونکەرەکانن نەك (المعاصي= سەرپێچی یەکان)، لەبەر ئەوەی کردارێك بە سەرپێچی دانانرێت ئەگەر بکەرەکەی سەرپێچی کار نەبێت، بکەریش بەسەرپێچی کار دانانرێت واتە بەرپرسیاری تاوان کاری، ئەگەر موکەلەف نەبێت، موکەلەف کەسێکە پێگەیشتو و ژیر بێتو بە ئارەزووی خۆی کارەکە بکاتو زانابێ بە ناڕەوایەتی کارەکەو توانای ئەوەی هەبێ کە ئەو کارە نەکات.

ب- فەرموودەی خوای پەروەردگار (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ)[1].

بنچینەی (کنتم) بەمانای (الصيرورة[2]= ئەنجامەکەی) دێت واتە: بوونە چاکترینی نەتەوە بەهۆی ئەوەوە کە فەرمانتان کردووە بە چاکەو قەدەغەی خراپەتان کردووە، چاکیی نامێنێت بە نەمانی هۆکارەکەی، جا هەر نەتەوەیەك وازی هێنا لە فەرمان کردن بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە ئەوەی لە سیفەتی چاکەکاری دادەماڵرێ، لەسەر ئەوەی حوکم و بڕیاردان لەگەڵ هۆکارەکەیدا دەسوڕێتەوە بە بوونو نەبوون.

ج- فەرموودەی خوای پەروەردگار (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)[3].

(الأولياء) کۆی (الولي)یە، بریتی یە لە هەموو ئەو کەسانەی کە کاروباری ژیانی کەسانی تر دەگرنە دەست، هەرکەسەو لەبواری تایبەتمەندیو پلەو پایەی خۆی لە کۆمەڵگەدا، بە بەڵگەی پاساوی ئەوەی کە ئەو کەسەیە کاری فەرمان بە چاکەو

---

[1] سوورەتی ئالی عیمران/١١٠.

[2] بە پێچەوانەی هەندێ لەو موفەسیرانەی کە چوون بۆ ئەوەی کە بەمانای (وجدتم) لەسەر ئەو بناغەیەی کە فعلەکە (تام) بووەو لە (الأفعال الناقصة) نەبووە یاخود (تام) بووە مانای (کنتم في علم الله) یاخود لە نەتەوەکانی پێشوو دا چاکترینی نەتەوەبوون، هەروەکو خاوەنی تەفسیری المنار خوا لێخۆش بوو الشیخ محمد رشید رضا ٤-٢٤ وای بۆ چووە.

[3] سوورەتی التوبة/٧١.

قه‌ده‌غه‌ی خراپه ده‌گرێته ئه‌ستۆ، لێكدانه‌وه‌ی ئه‌ولیا به هاوڕێ[1] یاخود مانایه‌كی نزیك له‌وه‌وه، له‌گه‌ڵ ئه‌ركی فه‌رمان كردن به‌چاكه‌و قه‌ده‌غه‌كردنی خراپه‌دا ناگونجێ، كه پێویستی به‌بوونی توانایه‌كی جیاواز هه‌یه بۆ ئه‌و كه‌سه‌ی فه‌رمان به چاكه‌و قه‌ده‌غه‌ی خراپه ده‌كات، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ریه‌كه له فه‌رمان و قه‌ده‌غه‌كردن پێویستییان به‌جۆرێك له به‌رزبوونه‌وه هه‌یه بۆ كه‌سی فه‌رمان كارو قه‌ده‌غه‌كار بۆ ئه‌وه‌ی فه‌رمان پێكراو فه‌رمانه‌كه جێبه‌جێ بكات‌و قسه‌بۆكراو به قه‌ده‌غه‌كردنه‌كه له قه‌ده‌غه‌كراو دوركه‌وێته‌وه، ئه‌و به‌رزبوونه‌وه‌یه‌ش ناگونجێ مه‌گه‌ر بۆكه‌سێك كه جیاكه‌ره‌وه‌یه‌كی دینی یاخود دنیایی یاخود كۆمه‌لایه‌تی یاخود ڕامیاری یاخود كارگێڕی یاخود زانستی یاخود هاوشێوه‌ی ئه‌وانه‌ی هه‌بێت، هه‌موو كه‌سێك شیاوی ئه‌وه نیه كه فه‌رمان به چاكه و قه‌ده‌غه‌ی خراپه بكات، به‌و پێیه هه‌موو به‌رپرسیارێك له ده‌وڵه‌ت دا له‌به‌رپرسه‌كانن(اولیا) سه‌باره‌ت به‌و كه‌سه‌ی له‌ژێر سه‌رپه‌رشتی و فه‌رمانی‌و به‌ڕێوه‌بردنی دا كارده‌كات له‌كاروباره كارگێڕی‌و ئیش‌و كاره‌كاندا.

له ده‌رئه‌نجامی مانای ئه‌و ئایه‌ته پیرۆزه‌دا كه باسكراوه، هه‌موو ئافره‌تێك مافی ئه‌وه‌ی هه‌یه كه هه‌موو ئه‌و ئیش‌و كارانه بگرنه ده‌ست كه پیاوان ده‌توانن بیگرنه ده‌ست، ئه‌گه‌ر شیاویی پێویست‌و توانای پێویستی هه‌بوو بۆ ئه‌و پله‌و پایه‌ی كه له ئه‌ستۆی ده‌گرێت، به‌و مه‌رجه‌ی پابه‌ندبێت به‌وه‌ی كه شه‌ریعه‌ت داوای لێ كردووه، وه‌كو خۆده‌رخستنی نه‌فامیی پێشوو وه نه‌فامیی تازه خۆی ده‌رنه‌خات، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خوای په‌روه‌ردگار ئافره‌تی له‌ریزی پیاو داناوه له‌و ئایه‌ته پیرۆزه‌دا كه ده‌فه‌رموێت: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ).

به بۆچوونی ئێمه، چاكتر وایه كه ژن دادوه‌ری بگرێته ده‌ست له كاروباری باری كه‌سێی دا، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌پیاو به‌تواناتره بۆ وه‌رگرتنی كێشه خێزانی یه‌كان‌و پسپۆڕی زیاتری هه‌یه له چاره‌سه‌ركردنی كێشه خێزانی یه‌كان و دیاری كردنی

[1] وه‌كو له زۆربه‌ی ته‌فسیره‌كانی قورئانی پیرۆزدا هاتووه.

دەردەکان لە بارودۆخی ناکۆکیو کێشەکان و چارەسەری گونجاوی بۆ بکات بەپێی شارەزاییەکەی.

هەروەکو چاکتر وایە کە پیاو کاری دادوەری تاوانکاری بگرێتە ئەستۆ نەك ئافرەت، لەبەر ئەوەی دادوەری تاوانکاری بێجگە لە پابەندبوونەکەی بە لەبەرچاوگرتنی دادپەروەری لە بڕیارە دادوەریەکان دا، کارەکەی پێویستی بە جۆرێك لە توندوتیژیو دڵ ڕەقی هەیە، بەشێوەیەك کاریگەری نالآنەوەی تاوانکاری نەکەوێتە سەر بۆ سوکەڵە کردنی سزاکەی، ئەگەر ئەو سوکەڵە کردنە دژی دادپەروەری بێت. ئەمە لەحاڵەتێك کێشەکە لە دەسەلاتی هەڵسەنگاندنی دادوەرەکە دابێت، لەبەر ئەوەی سزا دانراوە بۆ بەرپەرچدانەوەو ڕێ گرتنو چاکسازی کردن، لەبەر ئەوە پێویستە قەبارەکەی لەبارو گونجاوبێت بۆ قەبارەی تاوانەکەو مەترسی تاوان کارەکە.

د- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ).[1]

هـ- فەرموودەی خوای پەروەردگار: (لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوْا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ (٧٨) كَانُوا لَا يَتَنَاهَوْنَ عَنْ مُنْكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ)[2].

## دووەم: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ

ئاشکرایە لە ئەرکەکانی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ جەختکردنەوەیە لەو بڕیارانەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، یاخود ڕوونکردنەوەی پوختکراوەیەك لە قورئاندا هاتووە، یاخود باس کردنی ئەو بڕیارەی قورئانی پیرۆز لێ ی بێ دەنگ بووە بەڕاشکاوی، ئەو

---

[1] سوورەتی الحج/٤١.

[2] سوورەتی المائدة/٧٨- ٧٩.

سێ ئەركەش مەبەستە لە فەرموودەی خوای پەروەردگار كە دەفەرموێت: (بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ)[1].

بەو پێی یە ئەو فەرموودانەی كە دەیانخەینەڕوو لەبارەی ڕەوایەتی بەرگری شەرعی گشتی ناوخۆیی (الحسبە)، هەموویان جەختكەرەوەن بۆ ئەوانەی لە قورئانی پیرۆزدا لەوبارەیەوە هاتوون لەو ئایەتانەی باسمان كرد و هی تریش. لەو فەرموودانە:

أ- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (من رأى منكم منكراً فليغيره بيده فإن لم يستطع فبلسانه، وإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الإيمان).[2]

مەبەست لە (منكر) لەو فەرموودەیەدا بریتی یە لەوازهێنان لە واجب یاخود كردنی حەرام كرو، لەو فەرموودە پیرۆزەدا پلەكانی بەرپرسیارێتی ئادەمیزاد لەسەر فەرمان بە چاكەو قەدەغەكردنی خراپە وەردەگیرێت، بناغەی ئەو پلانەش جیاوازیی كەسە بەرپرسەكانە لە فەرمان بەچاكە لەروی پلەو پایەو هێزو شیاوی یەوە، و جیاوازیی ئەو كەسانەی وازیان لە چاكەكان هێناوەو هەستاون بە ئەنجامدانی خراپەكان لەو ڕوانەوە كە باس كران، وە جیاوازیی كاتو شوێن، هەروەها جیاوازی شێوازەكانو ڕێگاكانی سەرپێچی كردن لە ئەنجامی بەرەو پێشەوە چوونەكانی ژیان.

بەپێی ئەوە ئادەمیزاد بۆی نیە بچێتە ناو كاری فەرمان كردن بەچاكەو قەدەغەكردنی خراپەوە، ئەگەر لەپێشدا هەستی كرد كە ئەو خۆتێ هەڵقورتاندنە ئەنجامێكی خراپی لێ دەكەوێتەوەو دەرئەنجامی نالەباری لێ پەیدا دەبێت، بەشێوەیەك خراپی خۆتێ هەڵقورتاندنەكە زیاترە لە بەرژەوەندیو سوودەكانی.

لەوێنەی ئەو باروئۆخانە لە بەدڵ پێ ناخۆش بوون كورت دەكرێتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە لاوازترینی باوەڕ باسی كردووە، بەڵام لەهەمان كات دا

---

[1] سوورەتی النحل/٤٤.

[2] رواه الجماعة الا البخاري، اخرجه مسلم في الايمان حديث (٧٨) ، والترمذي في الفتن باب(١١)، والنسائي في الايمان باب(١٧)، واحمد في مسنده٢/٢٠ و٤٩.

پێویستە ئاگاداری دەسەڵاتی گشتی بکرێتەوە بەو خراپەیەی بڵاوبۆتەوە بۆ ئەوەی هەستن بە چارەسەرکردنی.

ئەو پلەپلەیەش مانای ئەوە نیە کەسی بێدەنگ لە قەدەغە کراو کە خۆی تێ هەڵنەقورتاندوە باوەڕی لاوازە، لەبەر ئەوەی ناچارە بۆ هەڵبژاردنی بێ دەنگی بەهۆی بارودۆخی حاڵەتەکەوە، بەڵکو مەبەستی لاوازی باوەڕی کۆمەڵگەیەکە خراپەکاری تیایدا زاڵ بێت لە ئەنجامی یارمەتی نەدانی یەکتر لەبەرپەرچدانەوەی لەپێش ڕودانی و لابردنی لەدوای ڕوودانی.

ب- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه ، الْإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِه وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَمَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا ، وَالْخَادِمُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِه وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه، وَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه.)[1].

ت-هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنْ الْمُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلَا يُسْتَجَابُ لَكُمْ)[2] لە گێڕانەوەیەکی تردا: (لتأمرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر وليسلطن الله عليكم شراركم ثم يدعو خياركم فلا يستجاب لهم)[3].

پ-لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ عَلَى الطُّرُقَاتِ فَقَالُوا مَا لَنَا بُدٌّ إِنَّمَا هِيَ مَجَالِسُنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا قَالَ فَإِذَا أَبَيْتُمْ إِلَّا الْمَجَالِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهَا قَالُوا وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ قَالَ غَضُّ الْبَصَرِ وَكَفُّ الْأَذَى وَرَدُّ السَّلَامِ وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ وَنَهْيٌ عَنْ الْمُنْكَرِ).[4]

---

[1] الحديث متفق عليه: أخرجه البخاري ١/٣٠٤ ومسلم/ ٣/١٤٥٩.

[2] أخرجه الترمذي من رواية حذيفة.

[3] الأوسط، بەرگی/٢، لاپەڕە/٩٩، ژمارە/١٣٧٩.

[4] متفق عليه صحيح مسلم.

سه‌دان فه‌رمووده‌ی تره‌ن ئه‌وه‌ دوپاتی ئه‌وه‌ ده‌كه‌نه‌وه‌ كه‌ له‌ قورئـانی پـیرۆزدا هاتووه‌ له‌ فه‌رمان كردن به‌وه‌ی هه‌موو خاوه‌ن توانایه‌ك هه‌ستێت به‌ فه‌رمان به‌ چاكه‌و قه‌ده‌غه‌كردنی خراپه‌، هه‌ریه‌كه‌ له‌ سنووری توانای خۆی دا، وه‌ ڕێنوماییمان ده‌كـات بۆ ئاستی گرنگیی شوێنكه‌وتنی ئه‌و ئه‌ركه‌ بۆ پاراستنی مافه‌كانی تاكه‌كانی كۆمه‌ڵگه‌ له‌ ژیان به‌سه‌ربردنیان به‌هێمنیو ئاشتیو سه‌قامگیریو دڵنیاییو، به‌ره‌ه‌ڵستی كردنی هه‌موو ئه‌و كه‌سانه‌ی ده‌یانه‌وێت توندوتیژی له‌ دژی بیّ تاوانان ئه‌نجام بده‌ن و خراپه‌ بڵاو بكه‌نه‌وه‌و واز له‌ چاكه‌كردن بێننو خراپه‌ ئه‌نجام بده‌ن.

## سێهه‌م: الإجماع= كۆڕا

سه‌رچاوه‌یه‌كی جه‌ختكردنه‌وه‌یه‌ بۆ ئه‌وه‌ی له‌ قورئانی پیرۆزو سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هاتووه‌ له‌بڕیاری فه‌رمان به‌چاكه‌و قه‌ده‌غه‌كردنی خراپه‌دا، و ئاشكرایه‌ كه‌ زانایانی شه‌ریعه‌تی ئیسلامی له‌ هه‌موو سه‌ده‌یه‌كدا كۆڕان له‌سه‌ر پێویست بوونی كاركردن به‌و بڕیارانه‌ی كه‌ ده‌قی جێگیری قوئانو سوننه‌تیان له‌سه‌ر هاتووه‌، جا بڕیاری جێگیر به‌كۆڕا له‌و بارودۆخه‌دا (الإجماع= كۆڕا) سه‌رچاوه‌ نیه‌ بۆی، ئه‌گه‌ر به‌ده‌ق جێگیر بوو، به‌ڵكو جه‌ختكه‌ره‌وه‌یه‌ بۆی، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌و بڕیاره‌ی كه‌ به‌ئاسایی له‌سه‌ری كۆڕان، ده‌بێته‌ بڕیارێكی ئیجتیهادی، (كۆششو بۆچوون). ئیجتیهادكردنیش شیاو نیه‌ له‌ ده‌قدا.

## چواره‌م: ژیریی

ژیریی ساغ بڕیاری پێویستی په‌یڕه‌وكردنی بڕیاره‌كانی قورئانی پیرۆزو سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌دات، له‌به‌ر چاكیی هه‌موو ئه‌وانه‌ی كه‌ قورئانی پیرۆز یاخود سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمانی پێكردووه‌و ناشیرینیو خراپی هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی كه‌ له‌و دوو سه‌رچاوه‌ سه‌ره‌كی یه‌دا ڕێگریی لیّ كراوه‌، چاكیو ناشیرینی به‌پیّی بیركردنه‌وه‌ی ژیرانه‌ له‌سه‌ر سوودی ئه‌وه‌ وه‌ستاوه‌ كه‌ له‌خۆیدا چاكه‌ یاخود بۆ بێجگه‌ له‌خۆی چاكه‌، خراپیو ناشیرینیش ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌ خۆی دا زیانی بۆخۆی

هەیەو یاخود بۆ بێجگە لەخۆی، هێنانی سوود و زیان دوورخستنەوە، لە مەبەستو ئامانجەکانی شەریعەتی ئیسلامی یەو لەبەرژەوەندییەکانی خێزانی مرۆڤایەتی یە.

جا فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە لە گرنگترینی بەرپرسیارێتی یەکانی هەموو تاکێکە لەبەرامبەر کۆمەڵگەکەیدا، خۆ ئەگەر ئەو کارە مەترسیدارە پشت گوێ خرا ئەوا خراپەکاریو ئاژاوەو ناپەسەندی یەکان بڵاو دەبێتەوەو تەشەنە دەکات، جا ئەگەر فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە جێ بەجێ کرا ئەوا چاکیو هێمنیو سەقامگیریو دڵنیاییو ئارامی دەروونی بۆ هەموو تاکێك بڵاو دەبێتەوەو خراپەکاری لەناودەچێ.

کارێکە بەڵگە نەویستە لە گرنگترینی ئامانجەکانی شەریعەتی ئیسلامی بریتی یە لە گونجاندنو پێکەوە سازاندن لەنێوانی تاکەکانی هەموو کۆمەڵگەیەکدا لە هەموو بوارەکان دا.

# جێباسی دووهەم:
# توخمەکانی (الحسبة)

توخمەکانی هەموو شتێك ئەوەیە کە ئەو شتەی لەسەر وەستاوە، لەبیرو هۆش داو لەدەرەوەی بیرو هۆشیش، ئەگەر توخمەکە بەشێك بوو لەوەی لەسەری وەستابوو، پێی دەوترێت پایە (الركن) ئەگینا پێی دەوترێت مەرج (شرط)، بەو پێیە توخمەکانی (الحسبە) یان لە پایەکان یاخود لە مەرجەکان دەبێت.

## پایەکانی (الحسبة)

ئەو (الحسبە)یەی کە بریتیە لە رژێمی فەرمان کردن بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە پێویستی بەچوار پایە دەکات کە ئەمانەن:

١- المحتسب: ئەو کەسەیە کە ئەرکی فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە دەگرێتە ئەستۆ.

٢- المحتسب علیە: ئەو کەسەیە کە واز لەچاکە دێنێ یاخود خراپە دەکات.

٣- المحتسب فیە: بریتی یە لەو خراپەیەی کە خۆی دەبینێتەوە لە وازهێنان لە واجب کراو یاخود کردنی قەدەغەکراو.

٤- الأحتساب: بریتیە لە لێپرسینەوە لەو کەسەی هەستاوە بە ئەنجامدانی کارە قەدەغەکە یاخود وازهێنان لە واجبەکە بە ئاراستە کردنێك بۆ رێگای راست،و دانانی دەرئەنجامە خراپەکانی کارە خراپەکەی و وازهێنان لە ئەرکەکە لەسەرشانی و خستنە ئەستۆی.

بۆ هەرپایەیەکیش لەوپایانە مەرجە تایبەتییەکانی خۆی هەیە.

## مەرجەکانی (المحتسب)

ئەو کەسەی کە کاری فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە دەگرێتە ئەستۆ، پێویستە چەند مەرجێکی تیادا بێت گرنگەکانی ئەمانەن:

١- پێویستە زانا بێت بە پێوەرەکانی جیاکردنەوە لەنێوانی چاکەو خراپە، شەڕوخێر، پیاوچاك، پیاوخراپ، ڕاستو چەوتدا، لەبەر ئەوەی فەرمان کردن بەشتێك یاخود قەدەغەکردنی لێی پێویستە لەدوای بوونی زانینی ڕاستیەکەیو سروشتیو چۆنیەتیەکەی بێت، ئەگینا دەبێتە گومڕاو گومڕاکار.

٢- دەبێ خاوەنی شیاوی لێپرسراوی بێت بەوەی پێگەیشتو و ژیرو موسڵمان بێ لەکارە دینییەکان داو دادپەروەربێتو بۆ بۆچوون و کۆشش کردن شیاوبێت لەوەدا کە (الاجتهاد= بۆ چوونو کۆشش کردن)ی پێویستە.

٣- دەبێ خۆی هەستێ بە ئەنجامدانی چاکەکەو خراپەکە نەکات، بەواتایەکی تر ئەوەی کە بەخەڵکی دەڵێ لە شوێن کەوتنی چاکەو دوورکەوتنەوە لەخراپە، لەپێشدا لەخۆی دا جێ بەجێی بکات، ئەگەر وانەکات ئەوا دەبێتە ئەو کەسەی کە خوای پەروەردگار لەبارەیەوە دەفەرموێت (أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ وَأَنْتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ).[1]

جا لەسەر هەموو ئامۆژگاریکارێکی خەڵکی پێویستە، ڕەفتاری خۆی ڕاستو ڕەوا بێت، و ڕەفتاری ڕاستیش ئەوەیە کە یەکەمجار ئامۆژگاریەکانی لەسەر خۆی جێبەجێ بکاتو دواجار لەسەر خێزانەکەی، پاشان هەوڵ بدات لەسەر کەسانی تر جێبەجێی کا، بەپێچەوانەی ئەوەوە هەوڵو ڕەنجدانەکەی لەبواری فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپەدا بەرووبومێکی نابێت، لەوتەی دانایان دا هاتووە، دەڵێ: (سێبەری شتی لار وەکو خۆی لارە).

---

[1] سوورەتی بەقەرە/٤٤.

لەگەڵ بەرپرسیارێتی یەکەی لە خزمەت خوای پەروەردگاردا، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ [1] تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ كَبُرَ مَقْتاً عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ) [2] .

٤- توانای هەبێت بەسەر هەستان بە فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپەدا، ئەو توانایەش جیاوازی هەیە بەپێی جیاوازی قەبارەی ئەو مەترسی یەی لە وازهێنان لەچاکە یاخود ئەنجامدانی قەدەغەکرلو دەکەوێتەوە، واتە توانای پێویست لەو بوارەدا رێژەییە، بەپێی جیاوازی ئەو کەسە دەگۆڕێت کە وازهێنان لە ئەرك یاخود حەرامکراوی ئەنجامدلوە، وە بەپێی جیاوازی سروشتی (المحتسب فيه= لەو خراپە کە خۆی دەبینێتەوە لە وازهێنان لەئەرکەکە یاخود کردنی قەدەغەکرلوەکە)، هەروەکو بە جیاوازی کاتو شوێنو دابو نەریتە ناوخۆیی نەریتەکانو هاوشێوەکانیان دەگۆڕێت.

## مەرجەکانی (المحتسب عليه)

(المحتسب عليه) ئەو کەسەیە کە واز لەچاکە دەهێنێ یاخود خراپە ئەنجام دەدا، ئیتر ئەوە کەسێکی مەعنەوی بێت یاخود سروشتی، نێر بێت یاخود مێ، گەورە بێت یاخود بچوك، ژیر بێت یاخود شێت، وە ئەگەر سەرچاوەی خراپەکەش ئاژەڵێك بێت، ئەوە خاوەنی ئاژەڵەکە لێی بەرپرسیارە، بۆ هەموشیان مەرج هەن وەکو ئەمانە:

١-ئەگەر کەسەکە مەعنەوی بێت وەکو دەوڵەت، ئەوا مەرجە کە سیاسەتی ناوەوەو دەرەوەی لەسەر بەرژەوەندییە باڵاکان دروست کرابێت، کە خزمەتی گەل بکات، ئەگەر ئەو سیاسەتە لە وازهێنان لە چاکە نوێنەرایەتی کرد (واتە:

---

[1] لام الجر چۆتە سەر (ما)ی پرسیاریو لابردنی ئەلفەکەیو (المقت)ی ناشیرین نەویستراو، (زواج المقت= بریتیە لەوە کە پیاوێك ژنی باوکی خۆی دەکاتە هاوسەری خۆی لەپاش باوکی، هەروەکو لەدابو نەریتی نەفامی پێش ئیسلامدا هەبوو).

[2] سورة الصف-الايتان:٢-٣.

ئەوەی کە بۆ گەل پێویستە) یاخود کارێکی خراپی زیان بەخش بوو بە بەرژەوەندی کۆمەڵگە، ئەوا لەسەر ئەو گەلە پێویستە لەدژی ئەو سیاسەتە بوەستنەوە لەڕێگای هۆکارەکانی خوێندنەوەو بینین‌و بیستنەوە، خۆ ئەگەر هەموو ئەوانە سوودیان نەبوو، پێویستە ئەو سیاسەتە بەدەست بگۆڕدرێت‌و نابێ بە لاوازترینی باوەڕ وازیهێنرێت.

ئەوەی شایەنی باسە کە قورئانی پیرۆز دەستورێکی نەمرە سروشتی سیستمی فەرمان ڕەوایی دیاری نەکردووە بەڵکو ئەوەی بەجێ هێشتووە بۆ داواکارییەکانی ژیان لە هەموو ڕۆژگارو شوێنێك دا.

بەڵام دەق لەسەر پاڵپشتە دەستووریە سەرەکیەکان بۆ سیستەمی فەرمانڕەوایی داناوە کە بریتییە لە دادپەروەری[1]و یەکسانی[2]و ڕاوێژکردن[3]و گوێڕایەڵی کردنی سیستەمی چاك،[4] وە ئاماژەی کردووە بۆ هەندێ لە سیفاتەکانی سەرکردە لەم ئایەتە پیرۆزەی قورئاندا کە دەفەرموێت: (فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ)[5].

---

[1] لەو ئایەتە پیرۆزانەی کە فەرمان دەکەن بە دادپەروەری فەرموودەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت(إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى) سوورەتی النحل/٩٠.

[2] وە لەو ئایەتانەی کە بەڵگەن لەسەر یەکسانی فەرموودەی خوای پەروەردگارە: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ) سوورەتی الحجرات١٣.

[3] وە لەو ئایەتانەی کە فەرمان دەکەن بەڕاوێژکردن، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) سوورەتی ئالی عیمران\١٥٩، (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ) سوورەتی الشورى/٣٨.

[4] لەو ئایەتانەی فەرمان دەکەن بە مل کەچ کردن بۆ ڕژێمی چاك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ) سوورەتی النساء/٥٩ وە مەبەست لە (ولی الامر) ئەو ڕژێمەیە کە نوێنەرایەتی دەکاو سەرکردایەتی دەکات بەبێ کەسەکەی.

[5] سوورەتی/ئالی عیمران/ ١٥٩.

لەو ئایەتەوە پێویست بوونی ئەو مەرجانە دەردەهێنرێن لەسەركردەی گەل:

یەكەم: لەسەر سەركردەی گەلان پێویستە كە پەیرەوی بكات لە پێغەمبەری خوا ﷺ وە بە سیفاتە سەركردەییەكان باس بكرێت كە لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە كە خوای پەروەردگار تیایدا دەفەرموێت: (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ)[1].

دووەم: دەبێ سروشتێكی نەرمی هەبێت لەكاتی بەریەك كەوتنی دا لەگەڵ كەسانی تردا.

سێهەم: نابێ دڵ ڕەق و ستەمكاربێت.

چوارەم: دەبێ سیفەتی لێبوردنی زاڵ بێت بەسەر سیفەتی سزادان دا لەبەر ئەوەی مەبەست لە سزادان چاكسازی یە، جا ئەگەر كارەكە بە لێبوردن چاك دەبوو ئەوا پێویستە پەنا بۆ لێبوردن ببرێت لە جیاتی سزادان.

پێنجەم: پێویستە شیاوی ئیجتیهاد كردن بێت بۆ هەڵبژاردنی ئەوەی چاكترە بۆ كۆمەڵگە.

شەشەم: نابێ بە ویستی تاكە كەسی خۆی بڕیار بدات بەڵكو پێویستە لەڕێگای ڕاوێژكردنەوە بڕیاری دروست بدات.

حەوتەم: پێویستە لە هەموو ئەو شتانەدا كە دەیەوێ بۆ بەرژەوەندی گشتی بیكات پشت بەخوا ببەستێت.

هەشتەم: پشت بەستن بەخوا مانای ئەوە نیە واز لە هۆكارەكان بهێنرێت، بەڵكو پێویستە یەكەم جار ڕاستەوخۆ هۆكارەكە بگیرێتە بەر، پاشان پشت بەخوا ببەستێ، لەبەر ئەوەی ئەو جیهانەی كە ئادەمیزاد تیایدا دەژی جیهانی هۆكارەكانە نەك موعجیزەكان.

---

[1] سوورەتی الاحزاب\٢١.

٢-ئەگەر کەسێکی سروشتی یە، ئەوا لەسەری پێویستە کە شیاو بێت بۆ پابەندبوون بەوەی کە (المحتسب) دلوای لێ دەکات لە هەستان بەوەی لەسەری پێویستە لەبەرامبەر کەسانی تردا لە چاکە کردنو ئەبێ خۆشی واز لەکاری خراپەکان هەلگرێو لەسەر بەردەوام بوون لەسەری.

ئەگەر (قاصر= منداڵی پێنەگەیشتوو)بوو دەگونجێ (المحتسب علیە= ئەو کەسەی واز لەچاکە کردن دێنێو کاری خراپە دەکا) سەرپەرشتی کردنی بگرێتە ئەستۆ، جا لەماڵی (المحتسب علیە)دا کە لێپرسراوێتی لە ئەستۆ دەگرێت، منداڵەکان واز لەچاکە کردن دێننو هەڵدەستن بە کردنی خراپەکان، دایکو باوکو ئەوەش کە جێگەیان دەگرێتەوە لەکاتی نەبوونی ئەوان دا، وە لە قوتابخانەش مامۆستا.

وە لەسەر هەریەکە لە دایکو باوك یاخود مامۆستا پێویستە کە لەبەرچاوی مناڵەکان یاخود قوتابیەکان هەڵنەستن بە ئەنجام دانی خراپەکاری لەبەر ئەوەی هەر لە خۆیانەوە چاویان لێ دەکەن، هەروەکو لەوازهێنانی چاکەدا چاویان لێ دەکەن، ئەوان ڕابەرو پێشەنگیانن، ئەوانەی لەژێر فەرمانیان دابن لەخۆیانەوە پەیڕەوییان لێ دەکەن، وتراوە: (ئەگەر خاوەن ماڵ بە باڵ وەشاندن دەمەدەم بکات ئەوا دانیشتوانی ماڵەکە هەموویان نەریتو خویان دەبێتە سەماکردن). وە لەسەر هەموو دایکو باوکێك پێویستە لەماڵ داو مامۆستا لە قوتابخانەدا کە ببنە چاودێرێکی ئەمینو بەسەرنج لەسەر مناڵەکان کەوان لەژێر دەسەڵاتو فەرمانیان دا، خۆ ئەگەر منداڵەکە چوو بەلای خراپەیەکا دەبێ بە هەموو ئەو ڕێگایانەی کە توانای بەسەریان دا هەیە لەدانایی و دوور لە شێوازەکانی پەروەردەی هەڵەوە قەدەغەی بکات لێی، بۆ ئەوەی لەلای ئەو منداڵە پێگەیشتووە (قاصر) پەرچەکرداری ناپەسەندو دەرئەنجامی خراپ لە داهاتوودا نەیەتە بەرهەم.

## مەرجەكانی (المحتسب فيه) (ما فيه الحسبة):

بریتی یه له هه‌موو خراپه‌یه‌ك كه ئه‌نجام دانی ده‌ركه‌وتووه‌و هه‌موو چاكه‌یه‌ك كه‌واز لێ هێنانی بڵاوبۆته‌وه، له‌گرنگترین مه‌رجه‌كانی:

١- پێویسته له ته‌رازووی شه‌رع یاخود یاسادا قه‌ده‌غه كرابێت‌و ڕێگه‌ی پێنه‌درابێت، ئیتر ئه‌و قه‌ده‌غه‌كردنه به‌ده‌قی تایبه‌تی بێت یاخود به‌ڕێسایه‌ك له‌ڕێسا گشتی یه‌كان.

٢- ئه‌و كاره به‌راستی بونی هه‌بێت‌و به‌رده‌وام بێت یاخود خه‌ریكه ڕوویدات، ئه‌گه‌ر كاره خراپه‌كه ته‌واوبوو، ئه‌وا ڕۆڵی (المحتسب) ئه‌وه‌یه كه ده‌سه‌ڵاتی گشتی لێ ئاگادار بكاته‌وه بۆ سزادانی (المحتسب عليه)، ئه‌گه‌ر خراپه‌كردنه‌كه تاوانێك بوو، یاخود بڕیاری قه‌ره‌بووكردنه‌وه‌ی به‌سه‌ردا بدات بۆ زیان لێ كه‌وتووه‌كه، ئه‌گه‌ر له بواری شارستانێتی دا كارێكی زیاندار بوو.

هه‌روه‌ها فه‌رمان به‌چاكه‌و قه‌ده‌غه‌ی خراپه سه‌باره‌ت به‌كاره داهاتوییه‌كان به‌كار ناهێنرێت مه‌گه‌ر له‌ڕێگای ئامۆژگاری و ئاراسته‌كردن‌و په‌ندی چاكه‌وه بۆ ئه‌و كه‌سه‌ی وای بۆده‌چێت كه له‌مه‌ودوا به‌ره‌و خراپه‌كاریه‌كان ده‌ڕوات.

٣- خراپه‌كردنه‌كه ئاشكرا بێت بۆ (المحتسب) به‌بێ سیخوڕی كردن جا هه‌ركه‌سێك له ماڵه‌كه‌ی خۆیدا سه‌رپێچی كردنێكی داپۆشی‌و ده‌رگای خۆی داخست، دروست نیه كه‌سێك سیخوڕی به‌سه‌ره‌وه بكات مادام زیان نه‌گه‌یه‌نێت به به‌رژه‌وه‌ندی گشتی، وه‌كو شاردنه‌وه‌ی تاوانبار یاخود شاردنه‌وه‌ی تاوان یاخود هاوشێوه‌ی ئه‌وه، جا له‌و جۆره حاڵه‌تانه‌دا دروسته بۆ ده‌سه‌ڵاتی گشتی كه فه‌رمان بكات به پشكنینی ئه‌و ماڵه‌ی كه ئه‌وه‌ی تیادا شاردراوه‌ته‌وه، كه زیان به‌به‌رژه‌وه‌ندی گشتی ده‌گه‌یه‌نێت، له‌پاش ئه‌وه‌ی كه خاوه‌ن ماڵه‌كه ئاگادار ده‌كرێت‌و مۆڵه‌ت له‌دادگا وه‌رده‌گیرێت‌و ئه‌و كه‌سانه له‌گه‌ڵ خۆیاندا ببه‌ن كه لێپرسراون له هه‌ندێ له به‌رژه‌وه‌ندییه‌كانی ناوچه‌كه وه‌كو موختاری گه‌ڕه‌ك یاخود كه‌سانی تر له كه‌سایه‌تیه‌كانی گه‌ڕه‌كه‌كه، دروست نیه‌و نابێ بچنه ماڵی

خەڵکیەوە بەبێ مۆڵەت وەرگرتنی پێش وەخت لە خاوەنەکەی، لەبەر ئەوەی شوێنی نیشتەجێ بوون ئەو شوێنەیە کە ئادەمیزاد بەشێوەی ڕاهاتن‌و بەهەمیشەیی یاخود بەکاتی تیایدا نیشتەجێ دەبن، وە شوێنی نیشتەجێ بوونی تایبەتی لە ئیسلامدا ڕێزلێگیراو و قەدەغەکراوەو بۆ پێویستی ناچاری نەبێت نابێت بچنە ژوورەوە.

نزیك نەبوونەوە لە ماڵی نێشتەجێ بوون لەڕاستی دا تەواوکردنی ئازادی کەسی یەو دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز هەیە لەسەر مافی نزیك نەبوونەوە لێی، کە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ (٢٧) فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ)[١] بەو شێوەیە خوای پەروەردگار خانووی کردۆتە شوێنی نیشتەجێ بوون کە خەڵکی بۆی دەچێ تا تیایدا نیشتەجێ ببن‌و دڵ‌و گیانیان تیایدا ئارام ببێ‌و لەئابڕوو قەدەغەکراوەکانیان دڵنیاو ئەمین بن.

قورئانی پیرۆز مۆڵەتوەرگرتن بە (الإستئناس) دەربڕیوە، ئەوە دەربڕینە مانای مۆڵەتوەرگرتن و نەرمی نواندن دێت، بەو ڕێگایە کەسی لەدەرگادەر وا لە دەرونی دانیشتووی ماڵەکە دەکات بەخۆشی و ئامادەباشییەوە پێشوازی لێ بکات.

قورئانی پیرۆز سیخوڕی کردنی بەسەر خەڵکی یەوە حەرام‌و قەدەغە کردووە مەگەر لەڕێگای بەرژەوەندی گشتی‌و بوونی مەترسی نادیارو شاراوەبێ، ئەوا پێویستە هاوکاری بکرێت لە دۆزینەوەی دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (ولا تجسسوا)[٢]. وە ئەوەی کە هێزە چەکدارەکانی عێراقی لە سوپاو پۆلیس بەهاوکاری لەگەڵ هێزەکانی هاوپەیمانان پێی هەڵدەستن لە دانەسەری کوتو

---

[١] سوورەتی النور/٢٧ –٢٨.

[٢] سوورەتی الحجرات/١٢.

پڕی ماڵەکان[1] و چوونە ژوورەوە لەدوای پیاهەڵگەڕان و شکاندنی دەرگاکان بەبێ ئاگاداری خاوەنەکەی و بەبێ وەرگرتنی مۆڵەتی پێشوەخت، ئەوە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامی و یاساکان و داب و نەریتەکانی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی و ڕاگەیاندنەکانی مافی مرۆڤە.

٤- دەبێ خراپەکە بەبێ ئیجتیهاد کردن دیاری کراو بێت، جا بڕیارێك لەنێوانی زانایانی بواری شەریعەت دا لەبواری ئیجتیهادی دا جیاوازی هەبێت، (حسبه)ی تیادا نیە. بۆ نمونە: بۆ کەسی ڕێباز حەنەفی نیە کە ڕێگریی لە کەسی ڕێباز شافیعی بکات کە لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵ دا (بسم الله) ناکات[2].

## مەرجەکانی (الإحتساب) پرسینەوە

لە گرنگترینی مەرجەکانی لێپرسینەوە لەوکەسەی کە وازی لەچاکە کردن هێناوەو بکەری خراپەکانە، ئەمانەن:

١- پێویستە (الإحتساب)ەکە بەپێی فەرمودەی خوای پەروەردگاربێت کە دەفەموێت: (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ)[3].

٢- پێویستە (الإحتساب= پرسینەوە) پلە بەپلە بێت لە ئاسانەوە بۆ گران و لە نەرمەوە بۆ توند وەك ئەم پلەبەندیانەی خوارەوە:

أ- (المحتسب) بەو شتە دەناسرێتەوە کە دەیەوێت لێپرسینەوە لەکەسانی تر بکات لەسەری، بۆ ئەوەی بۆی ڕوون ببێتەوە کە ئایا ئەو وازی لە چاکەیەك هێناوە،

---

[1] لەکاتی ڕوخاندنی ڕژێمی فەرمان ڕەوایی بەعس دا بەسەرۆکایەتی سەدام حسین لە ڕۆژی ٢٠٠٣/٤/٩دا عێراق بوو بەداگیر کراو لەلایەن هێزەکانی نەتەوە جیاوازەکان و لە پێشیانەوە هێزەکانی ئەمریکی و ئینگلزی.

[2] بڕوانە: احیاء علوم الدین الأمام الغزالي/٢/٣٢٠.

[3] سوورەتی النحل/١٢٥.

یاخود قەدەغەلێکراوێکی ئەنجام داوە، ئەو زانین‌و پێ ئاشنابوونە نابێ بەرێگا نارەواکان بێت وەکو سیخوڕی کردن‌و بەبێ بەهانە خۆهەڵقورتاندن لە کاروباری کەسانی تر یاخود لەو شێوانە.

ب– پێناسە: واتە لەسەر (المحتسب) پێویستە پێناسەی شتەکە (المحتسب علیە) بکات، بۆ ئەوەی بزانێ کەوا چاکەیەك هەیە و وازی لێ هێناوە یاخود خراپەیەك هەیە کە ئەنجامی داوە، لەبەر ئەوەی دەگونجێت ئادەمیزاد بەرەو خراپەیەك بچێت بەڵام نازانێ خراپەیە، یاخود لە نەزانینەوە یاخود هەڵەوە یاخود لەبیرچوونەوە واز لەچاکەیێك بهێنێ.

ت– پرسینەوە بە ئامۆژگاری کردن‌و پەند دادان‌و ترساندن بە خوای پەروەردگار سەبارەت بەو کەسەی خەریکی خراپەکردنە، لەگەڵ ئەوەش دا زانیاری هەیە بەوەی ئەو کارە خراپە، بەپێی ئەو ئایەتە پیرۆزەی قورئان کە خوای پەروەردگار تیایدا دەفەرموێت: (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ)[1].

پ– ئەگەر ئامۆژگاری کردن‌و پەند دادانەکە شکستی هێنا پەنا دەباتە بەر سەرزەنشت کردن‌و توندوتیژی بەوتەی ڕەق‌و وشك‌و زبر لەبەر ئەوەی کەسەکان جیاوازییان هەیە، هەندێك ئامۆژگاری‌و پەند وەردەگرێ‌و واز لەسەرپێچی کردن دەهێنێ، کەسانی واش هەن کە ڕاست نابنەوە بۆلای ڕاستی مەگەر بەهەڕەشە لێ کردن‌و سەرزەنشت کردن.

ج– گۆڕین بەدەست واتە گۆڕین لە قسەکردنەوە بۆ کردار بەپێ ی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: (مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ)[2] خۆ ئەگەر ڕێگاکانی پێشووتر سەرکەوتوو نەبوون ئەوا لەسەر (المحتسب) پێویستە

---

[1] سوورەتی النحل/١٢٥.

[2] صحیح مسلم/٤٩و هو صحیح.

کە هێزی گونجاو بەکاربێنێ، جا هەرکەسێك زەوی کەسانی تری داگیر کرد وە بەئامۆژگاری کردنو پەند دادانو ئاڕاستەکردن نەچووە دەرەوە پێویستە بەهێز ناچاری چوونە دەرەوە بکرێت.

ح- ئەگەر (المحتسب) نەیتوانی خۆی نەبەقسەو نەبەکردار کارەکە جێبەجێ بکات ئەوا پێویستە لە زووترین کاتی لەباردا دەسەڵاتی گشتی لەبابەتەکە ئاگادار بکاتەوەو هەواڵی پێ بدات.

هەرکەسێك فێڵی لە تەرازوودا کردو خراپی فرۆشت بە نرخی چاك یاخود ئەوەی بەکارهێنەران پێویستیان پێیەتی شاردەوە ئەوا پێویستە کاری پێویست لە دژی بگیرێتە بەر لەلایەنی (المحتسب) خۆیەوە، یاخود بەهۆی هۆکارەکانی دەسەڵاتی گشتی یەوە بۆ نەهێشتنی ئەو خراپەکاریانەو هاو وێنەکانیان.

ئەوەی شایەنی باسە کاری (المحتسب) لە فەرمان کردن بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپەدا کورت نابێتەوە، بەڵکو پێویستە لەسەری هەڵسێ بەلابردنو نەهێشتنی ئەو کەمو کوڕیو ناتەواویانەی لە گەڕەکەکەیدا یاخود لە لادێکەی دا هەیە وەك نمونە، وەکو ئەوەی بەردێك لەرێگای خەڵکی دا دەبینێ پێویستە لای بەرێت، یاخود چاڵێك لەرێگایەکی گشتی دا دەبینێ لەسەری پێویستە نەی هێڵێت، یاخود بۆ نمونە قوتابییەك لە کۆلێژەکەیدا دەبینێ پیسی یەك لە ڕێڕەوەکاندا یاخود لەناو باخچەکەدا فڕێ دراوە پێویستە لای بەرێت، ئەو کەسەش دەبینێ لەرۆژدا گڵۆپێك بەبێ سوود داگیرساوە ئەوا لەسەری پێویستە بیکوژێنێتەوە وە بەو شێوەیە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمویەتی (أَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهَا قَالُوا وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ قَالَ غَضُّ الْبَصَرِ وَكَفُّ الْأَذَى وَرَدُّ السَّلَامِ وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ وَنَهْيٌ عَنْ الْمُنْكَرِ).

## بناغەی الحسبة

لەو توخمانەی کەباس کران ئەوە بەرهەم دەهێنین کە بناغەی ڕەوایەتی (الحسبە) بریتیە لە پاراستنی بەرژەوەندییە باڵاکان لە کۆمەڵگەداو یارمەتی دان لەسەر چاکە

کردن لەپێناوی دڵنیاکردنی بەختەوەری تاکە کەسەکان لە هەموو ئەو کۆمەڵگایەکدا کە ڕژێمی (الحسبە)ی شێوەیەکی چاك تیایدا جێبەجێ دەکرێت وە بەیارمەتی دانی ڕاستی دڵسۆزانە لەلایەن هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەوە بەپێی فەرموودەی خوای پەروەردگار (وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ)[1].

## گەشەکردنی الحسبة

(الحسبة) وەکو باسمان کرد ڕژێمێکی دینیو سروشتیو مرۆڤانەیە کە شەریعەتەکانی پێشوو ناسیویێتیو فەرمانیان پێ کردووە، وەکو هەردوو شەریعەتەکەی موساو عیسا پێغەمبەر سەلامی خوایان لەسەر بێ هەروەکو لە قورئانی پیرۆزیشدا بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە کە دەفەرموێت: (لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوْا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ (٧٨) كَانُوا لَا يَتَنَاهَوْنَ عَنْ مُنْكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ)[2]، ژیانی پێغەمبەری خواش ﷺ پڕە لە قەدەغەکردنی خراپەکان، لەوانە: لە مامەڵە دارایی یەکان دا وەکو ئەوەی هاتووە:

أ- پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کۆمەڵێك خواردن دا تێپەڕی دەستی خستە ناویەوە، پەنجەکانی تەڕبوون، جا فەرمووی: (يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ مَا هَذَا؟ ئەی خاوەنی خواردن ئەوە چی یە؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باران لێ داوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: (أَفَلَا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ حَتَّى يَرَاهُ النَّاسُ ثُمَّ قَالَ مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنَّا)[3] واتە: ئەی بۆ نەت خستە سەرڕووی خواردنەکەوە بۆ ئەوەی خەڵکی ببینن، پاشان فەرمووی: ئەو کەسەی فێڵمان لێ بکات لە ئێمە نی یە، فێڵ باز باوەڕ دامەزراو نیە.

---

[1] سوورەتی المائدة/٢.

[2] سوورەتی المائدة/ ٧٨-٧٩.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه كتاب الايمان رقم (١٦٤) وأبو داود في كتاب البيوع رقم (٥).

ب- قه‌ده‌غه‌كردنی فرۆشتنی (الغرر)[1] كه‌ بریتی یه‌ له‌ هه‌موو فرۆشتنێك كه‌ چاوه‌ڕوانی ئه‌وه‌ی لێ بكرێت كه‌ زیان بگه‌یه‌نێت به‌ یه‌كێك له‌ دوو لایه‌نی گرێبه‌سته‌كه‌، وه‌كو فرۆشتنی نه‌بوو، وه‌ فرۆشتنی فرۆشراوێك له‌پێش وه‌رگرتنی دا، وه‌ فرۆشتنی نادیار، وه‌ فرۆشتنی شتێك كه‌ فرۆشیار نه‌توانێ بیداته‌ كڕیاره‌كه‌، و ئه‌وه‌ی هێشتا نه‌بۆته‌ موڵكو ماڵی فرۆشیاره‌كه‌ وه‌ك ئه‌و ماڵه‌ی كه‌ كێشه‌ی تیایه‌، وه‌ فرۆشتنی شیر له‌ناو گوان دا، وه‌ فرۆشتنی كۆرپه‌ی ناو سكی ئاژەڵ، بێجگه‌ له‌وانه‌ش.

ت- وه‌ قه‌ده‌غه‌كردنی فرۆشتن به‌سه‌ر فرۆشتنی كه‌سانی تردا، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: (لَا يَبِعْ بَعْضٌ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ)[2]

وه‌كو ئه‌وه‌ی به‌كه‌سێك بوترێت كه‌شتێكی كڕیوه‌ له‌ ماوه‌ی هه‌ڵبژاردن دا، ئه‌و مامه‌ڵه‌یه‌ هه‌ڵبوه‌شێننه‌وه‌، من به‌ هه‌رزانترو چاكتر له‌و پێت ده‌فرۆشم، هه‌روه‌ها كڕین به‌سه‌ر كڕینی براكه‌یدا، وه‌كو ئه‌وه‌ی له‌ماوه‌ی هه‌ڵبژاردندا(الخيار) به‌فرۆشیاره‌كه‌ بڵێ: ئه‌و مامه‌ڵه‌یه‌ هه‌ڵوه‌شێنه‌ره‌وه‌ من به‌ زیاتر له‌وه‌ لێت ده‌كڕم، بناغه‌ی ڕێگریكردنه‌كه‌ زیانو ئازار گه‌یاندنه‌ به‌كه‌سانی تر به‌بێ بیانوو.

پ- وه‌ قه‌ده‌غه‌ی ئه‌وه‌ش كراوه‌ كه‌ ڕێگه‌ بگیرێت له‌بارو بكڕرێت پێش زانینی نرخه‌كه‌ی له‌بازاردا یان كڕینی كه‌سێكی شاری له‌ كابرایه‌كی لادێی كه‌ نرخ نازانێت، هه‌روه‌ها كۆكردنه‌وه‌ی شیر له‌گوانی ئاژەڵ دا له‌كاتێكدا كه‌ ده‌یه‌وێ بیفرۆشێت. پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: (لَا يُتَلَقَّى الرُّكْبَانُ[3] لِبَيْعٍ، وَلَا يَبِعْ

---

[1] الغرر= مامه‌ڵه‌ی نه‌چه‌سپاوو جێگیر به‌هۆی نه‌ناسینی شتو مه‌كی كڕراوه‌وه‌، بڕوانه‌/فه‌رهه‌نگی ده‌ریا – عه‌ره‌بی – كوردی – ئاماده‌كردنی ڕزگار كه‌ریم به‌رگی ١/ لاپه‌ره‌ ٨٠٩ چاپی/ ٢٠٠٦ (وه‌رگێڕ).

[2] صحيح مسلم: ١١٥٣/٣ رقم الحديث/١٥١٧.

[3] پێك گه‌یشتنی سوار ئه‌وه‌یه‌ كه‌ شارنشینێ پێش وازی ده‌كات له‌ كه‌سێكی سارانشین (لادێ نشین) له‌پێش ئه‌وه‌دا بگاته‌ شاره‌كه‌،و به‌درۆ هه‌واڵی پێ ده‌دا كه‌ ئه‌و كه‌لو په‌له‌ی هێناویه‌تی بازاڕی نیه‌ بۆ ئه‌وه‌ی كه‌لو په‌له‌كه‌ی به‌ بڕێكی كه‌مو كه‌متر له‌ نرخی خۆی لێ بكڕێت.

بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلَا تَنَاجَشُوا[1] وَلَا يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ[2] وَلَا تُصَرُّوا[3] الْإِبِلَ وَالْغَنَمَ فَمَنْ ابْتَاعَهَا بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْلُبَهَا فَإِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ سَخِطَهَا رَدَّهَا وَصَاعًا مِنْ تَمْرٍ)[4].

وە بێجگە لەوەش لە هەزاران ڕەفتارو ڕوداوی تر کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ کردووە بەهۆی ئەو زیان گەیاندنو خراپەیەی کە تیایدایە شەریعەتی خوای پەروەردگاریش بەهەموو زیان گەیاندنو ئازارگەیاندنێ ناڕازی یەو بەرپەچی دەداتەوە کە بەکەسانی تر بگەیەنرێت بەبێ ئەوەی بەهانەیەك هەبێت.

خەلیفەکانی ڕاشیدینو سەرجەم هاوەڵانو شوێنکەوتوانیش پەیڕەوی لە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا دەکرد ﷺ، ئەوان لێپرسینەوەیان لە خەڵکی دەکرد لەسەر وازهێنانیان لەچاکە و هەستانیان بەخراپەکردن، جا ئیتر ئەو کەسەی کە وازی لەچاکە کردن هێناو خراپە دەکات هەرکەسێك بێت. لەکاتێکدا کەلە ڕژێمی ئیسلام دا (الحصانة= پاریزیەندیی) نیە، جا ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ بەبیرو بۆچوونی (الحصانة= پاریزیەندیی) قەدەغە دەکات سەبارەت بە نزیکترین کەسی کە فاتمەی کچێتی، ڕەزای خوای لێ بێ، کاتێ کە قورەیش هاتنە ناو ئیسلامەوەو ویستیان

---

[1] بنەڕەتی النجش وروژاندنە لەوانە ڕاوەکە جوڵا، ئەگەر جوڵانت پێی دەوترێت (الناشج) لە کەلو پەل دا بەو وەسفە باس دەکرێ، لەبەر ئەوەی ئارەزوو کردن تیایدا دەجوڵێنێو نرخەکەی بەرز دەکاتەوە، نای کڕێ بەڵکو کڕیاری بۆ هەڵدەخەڵەتێنێ بۆ ئەوەی بە زیاتر لە نرخە ڕاستەکەی بیکڕێ.

[2] وەکو ئەوەی دانیشتووی شار (وڵاتەکە) بە خاوەنی کەلو پەلەکە بڵێ من هەڵدەستم بە فرۆشتنی، جا فەلسەفەی ئەو قەدەغەکردنە ئەوەیە کە نمونەی ئەو فرۆشتنە زیان دەگەیەنێ بە بەکارهێنەر لەبەر ئەوەی دەشتەکی یەکە کەلو پەلەکەی یاخود بەرهەمە کشتو کاڵی یەکەی بە هەرزانتر لەنرخی شارنشینەکە دەفرۆشێ بە بەکار هێنەرەکە.

[3] التصریە لە زمان دا کۆکردنەوەیە و لێرەدا مەبەست ئەوەیە: لەکاتێکدا کە دەتانەوێ ئاژەڵەکە بفرۆشتن ئەوا شیر لەگوانی دا کۆمەکەنەوە بۆ ئەوەی گوانی گەورە ببێو کڕیارەکە وا گومان ببات کە بەردەوام شیری زۆرە.

[4] صحیح مسلم/٣ /١١٥٥.

هه‌نـدێك لـه‌ خـاوه‌نی پلـه‌و پایـه‌ كۆمه‌ڵایه‌تیـه‌كان یـاخود ڕامیـاری یـه‌كان یـاخود هاوشێوه‌یان جیابكه‌نه‌وه‌، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پێی فه‌رموون (إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا)[1].

وه‌كـاتێ ئـه‌بو بـه‌كری سـدیق خه‌لافـه‌تی گرتـه‌ ده‌سـت لـه‌ یه‌كـه‌م وتـاری دا كـه‌ ئاڕاسته‌ی موسڵمانانی كرد وتی: كه‌ گوێڕایه‌ڵی خوام كرد ئێـوه‌ش گوێڕایـه‌ڵیم بكـه‌ن، خۆ ئه‌گه‌ر سه‌رپێچیم كرد ئه‌وا گوێڕایه‌ڵی بۆ من له‌سه‌ر ئێوه‌ نیه‌.

خه‌لیفه‌ عومه‌ری كوڕی خه‌تابیش له‌سه‌ره‌تای خه‌لافه‌تی دا وتـی: ئـه‌ی خه‌ڵكینـه‌ هه‌ركه‌سێك له‌ ئێوه‌ خوارو خێچی یه‌كی له‌منـدا بینـی باڕاسـتی بكاتـه‌وه‌، یـه‌كێك لـه‌ ئاماده‌بووان هه‌سـتاو وتـی: وه‌ڵاهـی ئه‌گـه‌ر خـوارو خێچـی یـه‌كت تیـادا ببینـین بـه‌ شمشێره‌كانمان ڕاستو ده‌كه‌ینه‌وه‌، ئه‌مجا عومه‌ر وتی سوپاس بـۆ ئه‌وخوایـه‌ی لـه‌ ئومه‌تی موحه‌ممه‌ددا ﷺ وای كردووه‌ كـه‌ خـوارو خێچـی عومـه‌ر به‌شمشـێر ڕاسـت بكرێته‌وه‌[2].

عومه‌ری كوڕی خه‌تاب یه‌كه‌م كه‌س بوو كـه‌ یاسـای (مـن أیـن لـك هـذا= ئـه‌وه‌ت لـه‌كوێ بـوو)ی جێبـه‌جێ كـرد، ئه‌گـه‌ر كه‌سـێكی بكردایه‌تـه‌ سه‌رپه‌رشـتیاری به‌ڕێوه‌بردنی كاروباری خه‌ڵكی، ئاماری دارایی یه‌كه‌ی ده‌كردو ئه‌گه‌ر بیزانیایه‌ له‌كاتی ده‌سه‌ڵات گرتنه‌ ده‌ستیا ده‌وڵه‌مه‌ند بووه‌ ئه‌وا له‌كاره‌كه‌ی دووری ده‌خسته‌وه‌.

عومه‌ر شه‌وانه‌ له‌شاری مه‌دینه‌دا هاتو چۆی ده‌كرد بۆ ئـه‌وه‌ی فـه‌رمان به‌چاكه‌ بكات به‌و كه‌سانه‌ی كه‌ وازیان له‌چاكه‌ هێناوه‌و قه‌ده‌غه‌ی خراپه‌ له‌و كه‌سانه‌ بكات كه‌ به‌ئاشكرا ده‌یكه‌ن، شه‌وێكیان له‌كاتی گـه‌ڕانی دا گـوێی لـه‌ ده‌نگـی ژنێـك بـوو ئـه‌و دێڕانه‌ی به‌ گۆرانی ده‌وت:

---

[1] صحیح البخاری، به‌رگی/٣، لاپه‌ڕه‌/١٢٨٢، ژماره‌/٣٢٨٨و صـحیح مسـلم، بـه‌رگی/٣، لاپـه‌ڕه‌/١٣١٥، ژماره‌/١٦٨٨.

[2] عمر بن الخطاب قاضیا ومشرعا للاستاذ محمد عارف مصطفی فهمي نشر مكتبة الانجلو المصرية ص٩

تطـــاول هـــذا الليـــل وازوّر جانبـــه[1]
ولـــيس إلى جنبِـــي خليـــل الاعبـــه[2]
فـــوالله لـــولا الله لا شـــيء غـــيره[3]
لزعـــزع[4] مـــن هـــذا الســـرير جوانبـــه
مخافـــة ربـــي والحيـــاء يكفـــني
وأكـــرم بعلـــي ان تنـــال مراكبـــه

پاشان لەکاروباری ئەو ژنە پرسیاری کرد، پێی وترا کەوا مێردەکەی نێردراوە بۆ جیهاد،و ئێستا ئەو ژنە لە مێردەکەیەوە دوورە، جا عومەر پرسیاری لە حەفصەی کچی کرد، ئایا ئافرەت لە دیار نەبوونی مێردەکەی دا چەند ئارام دەگرێ؟ حەفصە وتی: پاکو بێ گەردی بۆ خوا، کەسێکی وەکو تۆ لەکەسێکی وەکو من ئەو پرسیارە دەکات؟ عومەر وتی: کارەکە پەیوەندی بە بەرژەوەندی خەڵکی یەوە هەیە، حەفصە وتی: دوو مانگ، وە لە مانگی سێ هەمدا ئارامی کەم دەبێتەوەو لە چوارهەمدا ئارامی تەواو دەبێ، جا عومەر نامەی نارد بۆ ئەمیری سەربازەکان کەوا نابێ زیاتر لە چوار مانگ[5] پیاو لە ژنەکەی ڕابگیرێو دور بخرێتەوە.

---

[1] واتە: لاربوویەوەو راست بوویەوە، لە گێڕانەوەیەکی تردا (وأسود جانبه).

[2] وە لە گێڕانەوەیەکی تردا (وطال عليَ ان لا خليل الاعبه).

[3] وە لە گێڕانەوەیەکی تردا (فوالله لولا خشية الله وحده).

[4] زعزع: واتە حركه شديدا.

[5] بڕوانە: المغني لابن قدامة ٣٠١/٧.

## گەشەكردنی (الحسبة) لەخۆبەخشەوە بۆ دەسەڵات داریتی

موسڵمانان لەسەرەتای ئیسلامدا بەخۆبەخشانە پشكنینیان دەكرد بۆ كاروباری كۆمەڵگە، ئەو كارەشیان لەبەر خوا دەكردو بەڕێگای تاكە كەسیو بەناڕەسمی، چاكەیەكیان بدیایە كەوازی لێ هێنراوە ئەوا فەرمانیان بە كردنی دەكرد، هەركەسەو بەپێی توانای خۆی، بەو شێوازە كارەكە بەردەوامی وەرگرت هەتا ئەو كاتەی ژیان گەشەی كردو بارودۆخەكان ئاڵۆزبوونو پێویستی یە كۆمەڵایەتیەكان جۆراو جۆر بوون، لە پاش ئەوەی كە زەوی دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بوو وە ژمارەی دانیشتوانیان زۆربوو كەلتورەكانو ئارەزووەكان جۆراو جۆر بوون لە كاریگەری ئەوەدا كە گەلو نەتەوە ناعەرەبەكان هاتنە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوەو موسڵمان بوون، ئەوان لە دابو نەریتو ئادابو فەلسەفەیانو ڕوانینیاندا بۆ ژیان جیاوازبوون، وە دەوڵەتی ئیسلامیش خۆی وابینی كە پێویستی بەوە هەیە كە ژیانی گشتی كۆمەڵگە ڕێك بخات بە دامەزراندنی دامەزراوەكان بۆ دابین كردنی ڕۆشتنی سروشتی بۆ پاڵپشتی ژیانی گشتیو دۆزینەوەی چارەسەرە گونجاوەكان بۆ ئەو كێشە كۆمەڵایەتیانەی لە ئەنجامی ئەو فراوان بوونە هاتبوونە ئاراوە، جا لەئەستۆ گرتنی (الحسبه) لەنێوانی ئەو دامەزراوانەدا لەبارودۆخە تازەكان سەپاندبویان، كە هاتبوو بۆ هاوبەشی كردن لە ژیانی كۆمەڵگەكەو دەستەبەركردنی جێبەجێكردنی ڕێسا شەرعیو یاساییەكان بەشێوەیەكی دروستو دەسەڵات داریتی (الحسبه) پەیوەستكرا بە فەرمان بەرانی سەربە دەوڵەتەوەو (المحتسب) لەو فەرمان بەرانەی كە بەشێوەیەكی ڕەسمی فەرمان كردن بەچاكەو قەدەغەی كردنی خراپە دەگرێتە دەست، (المحتسب) لەلایەن خاوەن كارەوە دەكرێتە وەكیل بۆ ئەوەی هەستێ بە فەرمان كردن بەچاكەو قەدەغەكردنی خراپە لەجیاتی دەستەی كۆمەڵایەتی[1]

---

[1] دور الحسبة الشرعية وجهاز الادعاء العام في حماية الهيئة الاجتماعية للاستاذ فتحي عبد الرضا الجواري ، لاپەڕە/٣٧.

(المحتسب) بەناوی هەموو تاکێکی کۆمەڵگەکەوە بەو کارە هەڵدەستێ، ئەگەر باروئۆخی کۆمەڵایەتی تازە ئامادەیی تیانەبوو بۆ ماوەدان بە هەستان بەو کارە بەتەنیا خۆی، ئەوا بۆخۆی یاخود ئەوە وازێ دێنێ بۆ تاکەکەسەکان، ئەگەر ویستیان ئەنجامی دەدەن وە ئەگەر نەشیان ویست ئەوا پەنا دەبەنە بەربێ دەنگی بەپێی ئارەزوو بەرژەوەندییەکانیان.

بەڵام ئەوە مانای ئەوە نی یە کە بەرپرسیارێتی فەرمان کردن بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە لەسەر خەڵکانی تر لابراوە لەسەر هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە بەڵکو (الحسبە) بەتێگەیشتنە گشتی یەکەی بەفەرزی کیفایە مایەوە لەسەر هەرکەسێك کە توانای هەبێت بەپێی دەقە گشتی یەکانی قورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ ئەوەی جیاوازی بکات لەنێوانی خۆبەخشو فەرمان بەرەکەدا، بەڵام زانایانی بواری شەریعەتی ئیسلامی جیاوازی لەنێوانیان دا دەکەن بە چەندین جیاوازی، لەوانە[1]:

١- الحسبة بۆتە ئەرکێکی پێویست سەبارەت بەوکەسەی کە لەدەسەڵاتی گشتی یەوە ئەو ئەرکەی پێ سپێدراوەو سەبارەت بەکەسانی تر (فەرزی کیفایەیە).

٢- سەبارەت بەوکەسەی لەلایەن دەسەڵاتی گشتی یەوە بۆ ئەو کارە دادەنرێت پێویستە لەسەری کە خۆی بۆ ئەو کارە یەکلای بکاتەوەو نابێت لێی بێ ئاگا بێتو خۆی بەکاری دیکەی دەرەوەی (الحسبة) خەریك بکات بە پێچەوانەی کەسانی ترەوە کە ئازادیی ئەوەی هەیە کە خۆی بەکاری ترەوە خەریك بکات بێجگە لەکاری فەرمان کردن بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە.

٣- لەسەر فەرمانبەری (المحتسب) پێویستە کە بگەرێ بەدوای ئەو خراپانەدا کە دەرکەوتوون بۆ ئەوەی بگاتە ئەو کەسەی کە نکوڵی لێ دەکاتو پشکنین بۆ

[1] الأحكام السلطانية للماوردي (أبي الحسن علي بن محمد) (ت- ٤٥٠ هـ) لاپەرە/ ٢٨٤- ٢٨٥، چاپی/٢/١٦٦ مصطفى البابي.

ئەوە بکات کە چاکەیەکی بە ئاشکرا واز لێ هێناوە بۆ ئەوەی فەرمانی پێ بکات بە ئەنجامدانی بەپێچەوانەی ئەو کەسەوە کە بۆ ئەوکارە دانەنراوە.

٤- بۆ (المحتسب)ی دیاری کراو هەیە کە هاوکاران وەربگرێت بۆ ئەوەی دەست بگرێ بەسەر نکوڵی کارانی خراپەکاران دا بۆ ئەوەی بەتواناتر بێتو زاڵ تر بێت بە پێچەوانەی کەسانی تری ناڕەحەسمیەوە.

٥- بۆ (المحتسب)ی ڕەسمی هەیە کە سزای ئەو کەسە بدات کە وازی لە چاکە کردن هێناوەو کردەوەی خراپ ئەنجام دەدات، بەپێچەوانەی کەسانی تروە ناڕەسمیەوە، لەبیرو بۆچوونی ئێمەدا بۆ کەسانی تریش ئەو دەسەڵاتە هەیە لەکاتی دیارنەبوونی دەسەڵاتی گشتی دا ئەگەر بەرژەوەندی گشتی پێویستی بەوە بوو.

٦- بۆ (المحتسب)ی ڕەسمی هەیە موچە لە بەیتول مال (خەزێنەی گشتی) وەربگرێت بەبێ کەسانی تری ناڕەسمی، بەڵام وای دەبینین کە کەسانی تر پێویستە پاداشت بدرێنەوە ئەگەر خزمەتێکیان پێشکەش کرد بە بەرژەوەندی گشتی لە ڕێگای فەرمان کردن بە چاکەکردن یاخود قەدەغەکردنی خراپی بەپێی ئەو فەرمودەیەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت (هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ)[1] جیاوازی تریش هەیە کە ماوە نیە بیان خەینە ڕوو.

[1] سوورەتی الرحمن/٦٠.

# جێباسی سێ هەم:
# بەراورد لەنێوانی الحسبة و
# ئەو زاراوانەی کە پەیوەندییان پێوەی هەیە

**الحسبە و دادوەری:**

لەڕاستی دا ئەرکەکانی (المحتسب)و کردارە گشتی یەکانی جۆراوجۆرن، بە گشتی مەبەستی دەستەبەرکردنی بەڕێوەبردنی سروشتی یە بۆ جومگەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، ئەو ئەرکانەش سروشتی بەڕێوەبردنیان هەیە لەگەڵ تایبەت مەندێتی دادوەری دا، ئەویش سروشتێکی ناوەندیان هەیە لەنێوانی ڕژێمی دادوەری‌و ڕژێمی سکاڵاو ناڕەزاییەکان دا.

**بەراورد لەنێوانی (الحسبة) و دادوەری دا:**

الحسبة لەدوو ڕووەوە لەگەڵ دادوەری دا ڕێك دەکەوێت‌و لەدوو ڕووشەوە کورت دەهێنێ‌و لەدوو ڕووشەوە لەو زیاتر دەهێنێ:

**یەکەم: لەڕووی ڕێکەوتنەوە:**

ڕووی یەکەم: وەکو دادوەر، بۆ (المحتسب)یش هەیە کە بڕوانێتە ئەم سێ داواکاریەی کە دێن:

١- ئەوەی پەیوەندی هەیە بە سوك کردنی، یاخود کەمتر ە مافی خۆی لەپێوان‌و کێشان دا.

٢- لەوەدا کە پەیوەندی هەیە بە فێل کردن‌و گزی کردن لە مامەڵەکاندا.

٣- لەوەدا پەیوەندی هەیە بە دەستی دەستی پێ کردن و دواخستنی بردنە سەری بەڵێن بۆ ئەو قەرزانەی کە کاتی دانەوەیان دێت.

ڕووی دوهەم وەکو دادوەر بۆ (المحتسب) هەیە کە تاوانبارکراو ناچار بکات لەسەر گەڕانەوەی مافی داواکار ئەگەر بەدان پیانانی خۆی جێگیر بوو، وەکو ناچاری کردنی زەوت کەر بۆ گێڕانەوەی زەوت کراو بۆ ئەو کەسەی کە لێ ی زەوت کراوەو ناچارکردنی دزەکە بۆ گەڕانەوەی شتە دزراوەکە بۆ دزی لێ کراوەکەو هاوشێوەی ئەوانە، لەبەر ئەوەی دواخستنی گەڕانەوەی ماف بۆ خاوەنەکەی لە کارە خراپەکانە.

**دوهەم: ڕووی کورت هێنانی الحسبە لە دادوەری:**

یەکیان: کەم و کوڕی (الحسبە) لە بیستنی هەموو ئەو سکاڵایانەی لەدەرەوەی دیاردە خراپەکانن وەکو ئەو سکاڵایانەی کە بۆ سەلماندنیان پێویستیان بە بەڵگە هەیە، لەبەرئەوەی (المحتسب) ناڕوانێت، مەگەر بۆ خراپەیەك کە ئەنجامدانی دەرکەوتبێت.

دوهەمیان: (الحسبە) کورت کراوەتەوە لەسەر ئەو مافانەی دانی پیانراوە، بەبێ ئەوانەی کێشەو نکوڵی کردن و مل نەدان دەچنە ناویەوە، نابێت (محتسب) بۆی بڕوانێ، بە پێچەوانەی دادوەر، لەبەر ئەوەی لە گرنگترینی ئەرکەکانی دادوەر یەکلایی کردنەوەی کێشەکانە لەڕێگای سکاڵاکان و ڕوونکردنەوەکان.

**سێهەم: دوو ڕووی زیاتری (الحسبە) لەسەر دادوەر:**

یەکەمیان: دروستە بۆ ئەو کەسەی لە (الحسبة) دەڕوانێ، وردبونەوە بکات لەوەی کە فەرمان بکات بە چاکەیەك کە واز لێ هێنانی ئاشکرا بووەو قەدەغەی خراپەیەك بکات کە کردنەوەی ئاشکرا بووە، بەبێ بەرز کردنەوەی سکاڵا لەلایەن نەیارەوە یاخود لە داخوازی گشتی یەوە بەپێچەوانەی دادوەر کە بۆی نیە بڕوانێتە ئەو سکاڵایانە بەبێ ئەوەی نەیار یاخود داخوازی گشتی داوای بکات.

دوهەمیان: چاودێری (الحسبة)، دەسەڵاتی تواناو زاڵ بوون و توند کردنی هەیە لەوەی کە پەیوەستە بەخراپەکردنەوە، بە پێچەوانەی دادوەرەوە، لەبەرئەوەی

ئەرکی (الحسبة) پێویستی بەوە هەیە بترسێنێ، بەڵام نابێ (المحتسب) زیادەڕەوی بکات لەزاڵ بوونو توندیو زبری، بەڵکو دادوەرێتی بۆ ویژدان دانراوە، باشتر ئەوەیە لەسەرخۆو بەڕێزەوە بێتو لێیان دەرنەچێت بۆ دەسەڵاتدارێتی (الحسبة)و زیادەڕەوی کردنو بەزاندن، لەبەر ئەوەی بابەتی هەریەکە لەو دوو ئەرکە لێك جیاوازن، جا تێپەڕاندن تیایدا دەرچوونە سنور[1].

## (الحسبة) و دەسەڵاتی بەسەر داگیرکراوەکاندا

(ولاية المظالم) دەسەڵات بەسەر داگیرکراوەکاندا یەکێکە لە دەسەڵاتە گشتیەکان لە ئیسلامدا کە پەیوەندی هەیە بە (الحسبة) لەپاش گەشەسەندنی[2].

الولاية: لە زماندا پشت گیری کردنە بەرەهایی، لەزاراوەدا پشت گیری کردنی ستەم لێکراوە بۆ ئەوەی ماف بگەڕێنرێتەوە بۆ ڕێڕەوی ڕەوای خۆی.

المظالم: کۆی (مظلم)ە،و (المظلم) لە زماندا دانانی شتێکە لە غەیری شوێنی خۆی، لەزارلوەدا زیادەڕەوی کردنە لەسەر مافی کەسانی تر بەئەنقەستو بەبێ بەهانە[3].

### ڕەوایەتی دەست گرتن بەسەر زۆرداری یەکاندا

سەرچاوەکانی ڕەوایەتی ئەو (الولاية) بریتیە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺو (الإجماع= کۆڕا)و (معقول= پەسەند)و وتەکانی خەلیفەکانی ڕاشدین.

أ- قورئانی پیرۆز: لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتی زۆر هاتووە لەبارەی حەرام کردنی زوڵمو زۆرداری یەوە پێویست بوونی بەرپەچدانەوەی لەپێش ڕووداناو لابردنی

---

[1] الأحكام السلطانية للقاضي أبي يعلي محمد بن الحسين الحنبلي (ت–٤٥٨هـ) چاپی ٢/١٩٦٦ بڵاوکردنەوەی مصطفى البابي لاپەڕە/٢٨٥.

[2] واتە: گەشەسەندنی (الحسبة) لەبارودۆخی خۆبەخشی یەوە بۆ بارودۆخی تر.

[3] مختار الصحاح ی رازی مادة الظلم.

لەدوای ڕوودانی دا. لەسەر هەموو لایەكیش كە توانای هەبێت بە تایبەتی لەسەر لێپرسراوان لە مافەكانی خەڵك بپارێزن، لەو ئایەتە پیرۆزانەش:

فەرموودەی خوای پەروەردگار: (وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ)[1].

وە فەرموودەی خوای پەروەردگار(ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنْتُمْ تَكْسِبُونَ)[2].

ب– سونەتی پێغەمبەر: لەبارەی حەرام كردنی زوڵمو ستەم كاریو پێویست بوونی لابردنی یەوە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرهەن جەخت لە ئەو ئایەتە پیرۆزانەی قورئان دەكەنەوە كەلەو بارەوە هاتوون لەو فەرموودانەش: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (انصر أخاك ظالماً أو مظلوماً)[3]. سەرخستنی زۆردار بەوە دەبێ قەدەغەی زۆرداری یەكەی لێ بكرێ وە سەرخستنی ستەم لێكراویش بەوەیە قەدەغەی ستەم لێكردنی بكرێو سەندنەوە مافە لێ زەوت كراوەكانی ستەمكار.

ت– كۆڕا= (الإجماع): جیاوازی نیە لەنێوانی زانایانی شەریعەتی ئیسلامی دا لەوەدا كە هەربڕیارێك كە دەقی قورئانی پیرۆزی لەسەر هاتووە، یاخود بەسوننەتێكی پێغەمبەری خوا ﷺ جێگیر ببێت ئەوە كارێكی ڕەوایەو پێویستە كار بەناوەڕۆكەكەی بكرێت.

پ– ژیری: ئاوەزی ساغ هاوكاری كردنو هاو بەرپرسیاریو یەككرتن لەڕێگای چاكەداو وەستان لەدژی هەموو خراپەیەك لەسەر زەوی داو هەستان بەلابردنی زیانەكان پێویست دەكات.

ج– وتەو كرداری خەلیفەكانی ڕاشیدین، كە چەند نمونەیەكیان لێ دەهێنینەوە:

---

[1] سوورەتی ئیبراهیم/٤٢.

[2] سوورەتی یونس/٥٢.

[3] كتب و رسائل و فتاوى ابن تيمية في الفقه ، بەرگی٣٥، لاپەرە/٩٤.

١- لەوتەکانی خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری سدیق ڕەزای خوای لێ بێت لەکاتێکدا کە کاری خەلافەتی گرتە ئەستۆ، وتی: (لاواز لەناوتانا لەلام بەهێزە تا مافەکەی بۆ وەردەگرمەوە،و بەهێز لەناوتانا لەلام لاوازە هەتا مافەکەی لێ وەردەگرمەوە).[1]

٢- لەوتەکانی خەلیفەی دوەهەم عومەری فاروق ڕەزای خوای لێ بێ لەوکاتەدا کە وتاری بۆ ناوچەکانی ژێر فەرمان ڕەوایەتی ئیسلامی دەدا وتی: (من کاربەدەستەکانم بۆ ئەوە بەکار ناهێنم بەسەرتانەوە کە بدەن لە پێستی جەستەتان[2]و جنێو بدەن بەئابڕوتانو ماڵو سامانەکانتان ببەن، بەڵکو بۆ ئەوە بەکارم هێناون تا فێری قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرتان بکەن جا هەرکەسێك فەرمانبەرێکی لێپرسراو ستەمێکی لێ کرد مۆڵەتی نادەم هەتا تۆڵەی[3] لێ دەستێنم)[4].

٣- لەدادوەری خەلیفەی سێهەم عوسمانی کوڕی عەففان دا ڕەزای خوای لێ بێ بڕیاردانی بەمیرات گرتنی (تماضر)ی ژنی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف کە لەنەخۆشی مردنەکەیدا تەڵاقی دا لەگەڵ ئەوەش دا کەبە (تەڵاقێکی بائین) تەڵاقی دا، ئەوەش مامەڵەیەکە کە لەدژی مەبەستە خراپەکەیەتی، لەبەر ئەوەی ئەگەر یەکێك لەنەخۆشی مردنی[5]دا ژنەکەی تەڵاق بدات، تەڵاقەکەی بەوە لێك دەدرێتەوە کە مەبەستی لێ ی بێ بەش کردنی ژنەکەی بووە لەمیرات.[6]

---

[1] الطبقات الكبرى لإبن سعد ١٨٧/٣.

[2] البشر= دەرەوەی پێستی ئادەمیزادە.

[3] واتە قصاص لێ وەربگرم.

[4] الإدارة الإسلامية للإستاذ محمد كرد علي. لاپەڕە/٣٢.

[5] ئەو نەخۆشی یەیە کە زۆربەی جار دەبێتە هۆی مردن.

[6] لە (المغني)ی ابن قدامة (عبدالله بن أحمد) المقدسي ٣٣٠/٦ (ولنا- واتە: بەڵگەمان ئەوەیە کە عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ (تماضری کچی ئەصبەغی کەلبی کردووە میرات گر لە عبدالرحمن ←

بنەڕەتی ئەو بڕیار دانەش سێ شتە:

یەكێكیان: وەرگرتن بەڕێسای شەرعی مردنەكە بەوەی مامەڵە لەگەڵ كەسێك دا دەكات بەپێچەوانەی مەبەستە خراپەكەیەوە.

دەوهەم: وەرگرتن بەڕێسای (سد الذرائع= قەدەغەكردنی بەهانە)، ئەگەر مەبەست پێی ئامانجێكی ناڕەوابێت.

سێهەم: سیاسەتی شەرعی. زانایانی هاوەڵان لەسەر ئەو بڕیارە بەكۆدەنگی بێ دەنگی كۆبونەتەوە، هەروەكو زانایانی شەریعەت- بێجگە لە (زاهیریەكان)[1] لەسەر ئەو بڕیارە كۆبونەتەوە بەڵام جیاوازیان لەدرێژە پێ دانەكەیدا[2] هەیە، جا یاسادانەری عێراقی بەهەڵەدا چووە لەوتەی نەكەوتنی تەڵاق دان لەكاتی نەخۆشی مردن دا لەیاسای باری كەسێتی[3] ژمارە (٢/٣٥)[4] دا.

---

ی كوڕی عەوف كە لە نەخۆشی مردنی دا (تەڵاقی بائین)ی داو لەناو هاوەڵان ناویانگی هەبوو كەس نكوڵی لێ نەكرد، كوڕابوو، لە عەلیو عبدالرحمن ەوە جێگیر نەبوو كە پێچەوانەی ئەوە بێت) پاشان خاوەنی المغنی لەسەری دەڕواو دەڵێ: (لەبەر ئەوەی ئەو مەبەستە مەبەستێكی خراپ بووە لە میرات دا، جا بەپێچەوانەی مەبەستەكەی كاركرا، وەكو ئەو بكوژەی بەمەبەستی خێرا دەستكەوتنی میراتی یەكەی كەسەكە دەكوژێو بەبێ بەش بوونی لەمیراتی یەكەی سزا دەدرێت).

[1] المحلي لإبن حزم الظاهري ٢١٨/١٠و ئەوەی لەدوایەوە دێت.

[2] سەردانی دا نەرمان بكە (الطلاق في جميع الشرائع والقوانين و الأعراف خلال أربعة آلاف سنة).

[3] ژمارە/١٨٨ ساڵی/١٩٥٩.

[4] دەقی ماددەی (٢/٣٥) تەڵاقی ئەو كەسانە ناكەوێ كە ڕوون كردنەوەیان لەسەر هاتووە:

١- سەرخۆشو شێتو گێلو زۆر لێ كراو ئەو كەسەش كە ناتوانێت جیاوازی بكات لەتوڕەبوونو بەڵای لەناكاو یاخود نەخۆشی.

٢- نەخۆش لە نەخۆشی مردندا یاخود لەباروبۆخێكی لەوجۆرەدا كە ئەگەر لەونەخۆشیەدا مرد یاخود لەو باروبۆخەدا، ژنەكەی میراتی لێ دەبات.

پێشنیاری ئەوە دەكەم كە برگەی دوو لابرێت، لەبەر نەكەوتنی تەڵاقی نەخۆشێك كە لەنەخۆشی مردن دابێت ئەگەر توانای جیاكردنەوەی نەبێت، ئەو برگەی یەكەم هاتووە، وە ئەگەر بۆ پاراستنی كافەكانی ژن بێت ئەوا هەموو مافەكانی پارێزراوە بەم مەرجانەی خوارەوە:

←

٤- لەدادوەری خەلیفەی چوارەم دا عەلی ڕەزای خوای لێ بێت.

دەگێڕنەوە کەبەلای کەناری فورات دا تێپەڕی بینی کەوا خواردەمەنی کابرایەکی بازرگان کۆمەڵ کراوەو کۆی کردۆتەوەو بەندی کردووە بەمەبەستی گران کردنی، عەلی فەرمانی کرد ئەو خۆراکە بسوتێنرێت[1]، حبیش وتی: عەلی کوڕی ئەبو تالیب خەرمانێکی منی بەڕەشی سوتاند کە گێرم دابوو، ئەگەر وازی لێ بهێنایە ئەوا وەکو داهاتی کوفە قازانجم لێ دەکرد.[2]

**دەسەڵاتەکانی کارپێ سپێردراوی داگیرکراوەکان**

ئەو دەستەڵاتانە زۆرن ماوە نی یە باس لەهەموویان بکەین هەندێك لەوانە:

١- چاودێری کردنی کارەکانی فەرمان بەران و لێپرسراوان لەکاروبارە کارگێڕییەکان لەوناوچانەدا کە مل کەچن بۆ فەرمانڕەوایی ئیسلامی و قەدەغەکردنیان لەمامەڵە کردنی ناڕەوا لەگەڵ ژێر دەستەکاندا.

٢- گەڕانەوەی ماڵ و سامانی داگیرکراو دزراوو تالان کراو بۆ خاوەنە شەرعییەکانیان.

---

١- ئەگەر تەلاق دانەکە لەنەخۆشی مردن دابێت.
٢- ئەگەر لەو نەخۆشیەدا بمرێت گەرچی بەهۆکاریَ:ی تریش بێت.
٣- تەلاق دانەکە بەهۆکارێکەوە نەبێت لەژنەکەوە، وە بەداواکردنی ئەویش نەبێت.
٤- دەبێ لەدوای سەرجێی کردن (دخول)بێت (الاباضیة) ئەو مەرجەی نەکردۆتە مەرج، بەلام زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەبارەی ماوەی کەوتنی مافەکەی دا لەمیرات.
١- حەنەفیە دەڵێ: ئەگەر مێردەکە مردو ژنەکە هێشتا لە (عیدەی)دا بوو.
٢- الامامیە دەڵێ: ئەگەر ساڵێك بەسەر هاوسەرگیری دا تێنەپەڕی بێت، ئەگەر هاوسەرگیری نەکردبێت.
٣- حنابلە دەڵێ: ئەگەر هاوسەرگیری نەکردبێ.
٤- مالکیەو الأباضیة دەڵێن: تەلاق دراو میرات دەبات لەبەر ئەوە بڕیاردان لەگەڵ هۆکارەکەی دا دەسوڕێتەوە، بەبوونی یاخود بەنەبوونی، هۆکارەکانیش بەو هۆکارانە باس کران ناکەویَ

[1] الروض النضیر شرح مجموع الفقه الکبیر للامام حسین بن أحمد ٣/٥٨٥ چاپی ساڵی/١٩٦٨.
[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣– فه‌رمان كردن به‌جێبه‌جێ كردنی بڕیاره‌كانی دادگا به‌بێ دواكه‌وتن.

٤– سه‌رنجدان له‌باروبۆخی نوسراوی دادگاكان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی سه‌ر ڕاستی موسڵمانانن.

٥– پێداچونه‌وه به ئه‌وشتانه‌ی نه‌توانراوه پێیدابچنه‌وه له‌به‌رژه‌وه‌ندیه گشتیه‌كان[1].

٦– بینینی ئه‌و سكاڵایانه‌ی كه‌به‌رز ده‌كرێته‌وه بۆلایان له‌لایه‌ن ئه‌و كه‌سانه‌وه كه هه‌ست به نادادپه‌روه‌ری بڕیاری دادگا ده‌كه‌ن، له نمونه‌ی ئه‌و سكاڵایانه‌ی كه ئافره‌تێك به‌رزی كردوه‌وه بۆ عه‌لی كوڕی ئه‌بو تالیب ڕه‌زای خوای لێ بێ له‌كێشه‌یه‌كی میراتی دا كه شێخ مارفی نۆدێی له‌م دێڕانه‌دا هۆنیویه‌وه:

| | |
|---|---|
| وكالركابية وهي عرس | واخوة لمن حواه الرمس[2] |
| عددهم عشرة واثنان | والدة والاخت وابنتان |
| فيها ثلاثة مع الثمانية | فضربت اولاهما في الثانية |
| لكنها تصح من ستمائة | فاستكملت سهامها تلك الفئة |
| وذاك في عهد علي وقعت | ثم إلى قاضي شريح رفعت |
| وبعد ان جعلها من ست | مائة اعطى واحدا للاخت |
| فاقبلت نحو ابي تراب | ورجله اذ ذاك في الركاب |
| قالت اخي مات وعندما هلك | ستمية من الدنانير ترك |
| ولي بدينار شريح قد حكم | وقد اتيت اشتكي مما ظلم |
| قال لعل حين ذاق حتفه | عصابة سواك خلى خلفه |
| وعدهم كما مضى قالت نعم | فقال بالحق قضى وما ظلم |

واته: وه‌كو ڕه‌كابیه و براكانی ئه‌وكه‌سه‌ی كه قه‌بر له‌خۆیی گرت. ژماره‌یان ده‌و دوه، دایكو خوشكو دوو كچ، سیانی تیادایه له‌گه‌ڵ هه‌شت، یه‌كه‌میان لێدرا

---

[1] الأحكام السلطانية للماوردي، سه‌رچاوه‌ی پێشوو.

[2] قه‌بر

لەدوهەم[1]، بەلام لە شەش سەد ڕاستە، ئەو کۆمەڵە بەشەکەی تەواوکرد. ئەوەش لەسەردەمی عەلی دا ڕووی دا، پاشان بۆ شورەیحی قازی بەرزکرایەوە، دوای ئەوەی لەشەش سەد داینا، یەك دانەی دایە خوشك، ئەو خوشکە چوو بۆلای ئەبوتراب[2]، کەلەوکاتەدا بەسەر وڵاخەوە لەسەر سەفەربوو، خوشکەکە وتی: براکەم مردو کاتێ لەناوچوو شەش سەد دیناری بەجێ هێشت، شورەیح یەك دیناری بۆ من بڕیاردا، واهاتوم سکاڵا لەو کەسە دەکەم کە ستەمی کرد، وتی لەوانەیە کاتێ کە مەرگی تۆشیوە، بێجگە لەتۆ باوانێك[3] لەدوای بەجێ مابێ، وەك باسکرا ژماردنی، وتی بەڵێ، وتی بە حەق بڕیاری داوەو زوڵمی نەکردووە.

**بەراورد لەنێوانی سیستەمی داگیرکراوو (الحسبة)دا**

(الحسبة) ئەو دۆخەی وەرگرتوە کەوا ناوەندە لەنێوانی سیستەمی دادوەری‌و سیستەمی، ئەو دوو سیستەمەش لەچەند بارێك دا ڕێکن لەباری تریش دا جیاوازییان هەیە.

---

[1] کورتەی ئەو بابەتە ئەوەیە کە پیاوێك مردووەو میرات گرەکانی پێك هاتوون لە ژنەکەی‌و دوو کچ‌و دایك‌و خوشکێك‌و دوانزە برا، بۆژنەکەی ٨/١ لەبەربوونی لقی وارث (دووکچ) بۆ دووکچەکە ٣/٢و بۆ دایك ٦/١ وە بۆ براو خوشکی ماوە بۆنێرێك بەشی دوو مێ، بنەڕەتی بابەتەکە لە (٢٤) لەبەر ئەوەی گەورەترین بەشکەری ناوخۆیی (قاسم مشترك) بۆ شوێنی ناوبراوەکان ئەوە ئەو ژمارە دەست کەوتووەیە لە لێکدانی (٣) کە بریتیە لە شوێنی بەشی دوو کچەکە لە (٨) ئەوەش شوێنی بەشی ژنەکەیەو بۆ ژنەکە (٣) بۆ دووکچەکە (١٦)و بۆ دایکەکە (٤)و یەك بەش بۆ براو خوشکەکە ژمارەیان لەپاش دانانی هەر برایەك بەدوو خوشك (٢٥) دابەش کردن بەسەریانا وەرناگیرێ جا ژمارەیان لە بنەمای بابەتەکە دەدرێت (٢٥* ٢٤)= ٦٠
بۆ ژنەکە (٧٥)و بۆ دایك (١٠٠) بۆ دووکچەکە (٤٠٠) بۆ هەریەکە لە براکان (دوو بەش)و بۆ خوشك یەك بەشە.

[2] نازناوی عەلی یە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نازناوەی لێ ناوە.

[3] عصابة بەکەسرەی ژێر عەین واتە کۆمەڵ (٤) واتە عەلی ژماردنی لەبەر ئەوەی لەبەشی خوشکەکەوە ژمارەی میرات گرەکانی زانی.

**أ- له‌رووه‌كانی لێك چوونه‌وه:**

١- هه‌ریه‌كێك له‌و دوانه له‌سه‌ر هێزو ترساندن‌و كۆڵ نه‌دان وه‌ستاوه له‌ڕاستی‌و توندوتیژی دا بۆ ئه‌وه‌ی له‌وێدا ده‌رچوونێك نه‌مێنێته‌وه بۆ داگیركاریی له‌كۆمه‌ڵگه‌دا.

٢- بۆ هه‌ریه‌كه‌یان ئه‌نجامدانی تایبه‌تی خۆیان هه‌یه وه ده‌سته‌ڵاتیان له‌خۆیانه‌وه به‌بێ پێویست بوون بۆ داواكاری سته‌ملێكراو، واته بۆ هه‌ردووكیان هه‌یه كه بگه‌ڕێن به‌دوای ئه‌و ڕێگاو هۆكارانه‌ی كه ده‌بێته هۆی به‌رپه‌چ دانه‌وه‌ی زیان له‌سه‌ر تاكه كه‌سه‌كان‌و به‌ده‌ست هێنانی دڵنیایی‌و هێمنی‌و به‌رپه‌رچ دانه‌وه‌ی دوژمنایه‌تی‌و لابردنی زیانه‌كان.

**ب-رووه‌كانی جیاوازی:**

١- بۆ ئه‌وكه‌سه‌ی ده‌ڕوانێته به‌سته‌مداگیركراوه‌كان بۆی هه‌یه كه بڕوانێته هه‌موو ئه‌و بابه‌تانه‌ی كه ده‌خرێته به‌رده‌ستی، به‌پێچه‌وانه‌ی (المحتسب)ه‌وه كه‌هه‌ر وه‌كو باسكرا ده‌سه‌ڵاتی دیاری كراوه.

٢- ئه‌وكه‌سه‌ی ده‌ڕوانێته به‌سته‌مداگیركراو بۆی هه‌یه ده‌ستوه‌داته كاروباری (المحتسب) وه ده‌شتوانێ بڕوانێته ئه‌و كێشانه‌ی كه (المحتسب) تیایدا بێ توانایه كه تیایدا بڕیاربدات، به‌بێ پێچه‌وانه‌كه‌ی.

**به‌راورد له‌نێوانی سیسته‌می به‌سته‌مداگیركراوو دادوەری دا:**

له‌هه‌ندێ رووه‌وه ڕێك ده‌كه‌ون‌و له‌هه‌ندێ رووی تره‌وه لێك جیاوازن:

**أ- رووی لێك چوون:**

١- هه‌ریه‌كه له‌ودوانه مه‌به‌ستیان ئه‌وه‌یه كه دادپه‌روه‌ری له‌ناو خه‌ڵكی دا سه‌قامگیربكه‌ن.

٢- هه‌ریه‌كه‌یان مافی ئه‌وی هه‌یه كه بڕیار ده‌ربكات بۆ ئه‌و شتانه‌ی دێن بۆلای‌و ئه‌و ڕێگایانه به‌كاربهێنێ كه ده‌یگه‌یه‌ننه زانیاری دروست.

٣- بۆ هەریەکەیان هەیە کە داوای یارمەتی لەو فەرمانبەرانە بکات کە دەکەونە ژێر دەستەڵاتی یەوە.

**ب- ڕووی جیاواز: لەو کارانەدا جیاوازن:**

١- بینەری بەستەمداگیرکراوەکان کەڵك وەردەگرێ لەهێزو شکۆیەك کە قازی ئەوەی نیە.

٢- بینەری بەستەمداگیر کراوەکان بواری دەسەڵاتی لەقازی فراوانترە لەگەیشتن بەزانینی ڕاستی، لەبەر ئەوەی قازی پابەندە لە سەلماندنی مافی سکاڵاکەر بەڕێگا دیاریکراو لەوانە بەرزکردنەوەی سکاڵاو سەلماندنی بە بەڵگەوە.

٣- بینەری بەستەمداگیرکراوەکان دەسەڵاتی ئەدەب دادانی هەیە بۆ ئەو کەسەی دوژمنکاریەکەی دیارەو ستەمەکەی دەرکەوتووە بەڵام ئەوە لە دەسەڵاتی قازی دا نیە.

### (الحسبة)و داواکاری گشتی

داواکاری گشتی بە پێشکەوتنێکی (الحسبە) دادەنرێت، چونکە (الحسبە) چەند پەرەسەندنێکی بەخۆوەبینیوە، کۆتاییەکەی سیستەمێکە پێت دەوترێت (الإدعاء العام= داواکاری گشتی)، بەڵام ئەو پەرەسەندنە مانای ئەوە نیە کە داواکاری گشتی جێگەی (الحسبە)ی گرتبێتەوە، بەڵکو لێپرسراوێتی فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە بە فەرزی کیفایە دەمێنێتەوە لەسەر هەموو کەسێکی پێگەیشتووی ژیر کە توانای هەبێت فەرمان بکات بەوەی خێری تێدایە بۆ تاكو کۆمەڵگە، قەدەغەی خراپەکارییەکانیش بکاتو یارمەتی دەربێت لەگەڵ دەسەڵاتی گشتی لە نەهێشتنی تاوانەکانو خراپ کاری داو دانانی سنوور بۆ هەموو ئەو کەسانەی نیازی ئەوەیان هەیە خراپەکاری بڵاوبکەنەوە، ئەوەش بەپێی ناوەڕۆکی دەقە گشتی یەکان لە قورئانی پیرۆزو سونەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەبێ لە هەموو ڕۆژگارێكو کاتێکدا کاری پێ بکرێت هەتاکو ژیان بەردەوام بێ لەسەر هەسارەی زەوی.

وه له‌به‌ر په‌یوه‌ندی پته‌و له‌نێوانی (حیسبه)و داواكاری گشتی دا سه‌رنجێكی مێژوویی ده‌ده‌ینه داواكاری گشتی له‌عێراق دا.

عێراق له‌وه‌و پێش دامه‌زراوه‌یه‌كی سیستمانێكی وه‌های نه‌ناسیوه كه بناغه‌و مه‌به‌سته ڕون‌و ئاشكراكانی زاراوه‌ی (داواكاری گشتی) لێ بنرێت، به‌ڵكو ئه‌و فیكره‌یه له‌نیوه‌ی دووه‌می سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌مدا بووه كاتێ كه عێراق له‌ژێر فه‌رمان ڕه‌وایی خه‌لافه‌تی عوسمانی دا بوو كه (م/٩١) ده‌قێك بوو له‌یاسای بنه‌ڕه‌تی عوسمانی كه له‌ساڵی ١٨٧٦ی زایینی ده‌رچوه به‌وه‌ی (داواكاری گشتی یه‌كان بۆ به‌رگری كردن له‌مافه گشتی یه‌كان له‌كاروباری ژیان دا داده‌مه‌زرێنێت، به‌ڵام كاره‌كانی ئه‌و داواكارانه‌و پله‌كانیان له‌یاسادا[1] جێگیر ده‌كرێت).

پاشان به‌شی یه‌كه‌م له‌یاسای پێك هێنانی دادگای یاسای كه له‌ساڵی ١٨٨٠و زایینی دا ده‌رچووه كاره‌كانی داواكاری گشتی ڕێك خستووه، به‌پێی ئه‌و یاسایه مه‌رجدار كراوه له‌وه‌دا كه ئه‌و كه‌سه‌ی به داواكاری گشتی داده‌مه‌زرێت ئه‌و مه‌رجانه‌ی تیادابێ كه له‌دامه‌زراندنی قازی دا هه‌یه، له‌پاش داگیركردنی عێراقیشه‌وه له‌لایه‌ن هێزه‌كانی به‌ریتانیاوه‌و چونه ناوه‌وه‌یان بۆ به‌غدا له‌ساڵی ١٩١٧دا ده‌قی مادده‌ی/١٤ هه‌یه له‌ڕوونكردنه‌وه‌ی فه‌رمانڕه‌وایی به‌ریتانی كه‌وا دادگاكانی شارستانێتی عێراقی به‌رده‌وام بن له‌سه‌ر كاركردن به‌یاساكانی عوسمانی، پاشان ده‌سه‌ڵات داره‌كانی داگیركه‌ر یاسای بنه‌ماكانی دادگایی كردنی سزادانی ده‌ركرد كه له ساڵی/ ١٩١٩ی زایینی[2] یه‌وه ده‌ستی كرده به‌كاریوه.

چه‌ند هه‌مواركردنه‌وه‌یه‌ك ڕویدا له‌سه‌ر یاسای بنه‌ماكانی دادگایی كردنی سزادان به‌پێی ئه‌وه گۆڕانكاریی زۆرهات به‌سه‌ر ڕژێمی داواكاری گشتی دا كه خستنه ڕوویان سودێك نیه.

---

[1] دكتور رعد الجدة/ التشريحات الدستورية في العراق/ لاپه‌ڕه/٩١.

[2] دكتور عبدالجبار عريم شرح قانون اصول المحاكمات الجزائية/ ١٢/١.

پاشان یاسای بنەماکانی دادگایی کردنی سزادان[1] دەرچوو، بەپێی ئەو یاسایە دامەزراوەی دلواکاری گشتی بووە دەزگای کاریگەرو جوڵێنەر لەرێکگرتنی دادگەری دا بەڵام ئەو یاسایە نەلکێنرا بە دەزگای داواکاری گشتی یەوە بۆ زیادکراوی دەزگا هاوشێوەکان لە دەوڵەتە پێش کەوتووەکانی تردا.

پاشان یاسای داواکاری گشتی ژمارە/١٥٩ی ساڵی ١٩٧٩و پەیرەوکار جێگای گرتەوە کە لەماددەی یەکەمی دا دانی نا بەوەی ئەو یاسایە مەبەستی ئەوەیە کە دەزگای داواکاری گشتی رێك بخات بۆهێنانە دی ئەمانەی خوارەوە:

یەکەم: پاراستنی یاسای وڵاتو هێمنیو دامەزراوەکانیو گرنگی دان بەدیموکراتییەتی گەلو بەرگری کردن لەدەست کەوتەکانی شۆڕشو پاراستنی سامانی دەوڵەتو بەشی هاوبەش.

دوهەم: هاوکاری کردنی رژێمی هاوبەشیو پاراستنی بناغەکانیو تێگەیشتنی لەچوارچێوەی چاودێری رەوایەتیو رێزگرتنی جێبەجێکردنی یاسا.

سێهەم: هاوبەشی کردن لەگەڵ دادگاو لایەنە تایبەت مەندییەکان لەدۆزینەوەی خێرا لەسەر کارە تاوانکاریەکانو کارکردن لەسەر خێرا یەکلایی کردنەوەی بابەتەکانو پێکەوە کارکردن بۆ دواخستنی ئەو دادگایی کردنانەی کە بیانوویان نیەو بەتایبەتی ئەو تاوانانەی کە دەبنە رێگر لەبەرمەم رێگەگرتن لە گۆڕانە هاوبەشیەکاندا.

چوارهەم: چاودێریکردنی جێبەجێ کردنی بڕیارو فەرمانو سزاکان بەپێی یاسا.

پێنجەم: بەشداریکردن لە هەڵسەنگاندنی[2] یاسادانانی دادگایی کردنەکان بۆ زانینی چەندێتی گونجامی لەگەڵ واقیعە پەرەسەندوەکەدا.

شەشەم: بەشداربوون لەتێبینی کردنی دیاردەی تاوانو کێشەو پێشکەش کردنی پێشنیاری زانستی بۆ چارەسەرکردن کەمکردنەوەیان.

---

[1] ژمارە/٢٣ی ساڵی/١٩٧١ کە لەشوێنی جێبەجێ کردن دانراوە لەرۆژی/١/٧/١٩٧١ دا.

[2] لە دەستەواژەی ماددەکەدا وشەی (تقییم) هاتووە ئەوە هەڵەیەکی بڵاوە ڕاستی یەکەی (تقویم)ە بڕوانە: لسان العرب بەشی (قاف) پیتی (میم) ١٥/٤٠٢.

حەوتەم: بەشدایكردن لە پاراستنی خێزانو منداڵێتیدا.

ئەوەی لەو ماددەیەدا هاتووە گونجاوە لەگەڵ ئەوەی کە لەقورئانی پیرۆزو سوننەتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوون بەڵام جیاوازی زۆر هەیە لەنێوانی سیستەمو جێبەجێكردندا.

## دەرئەنجام

لەخستنەڕووی ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بەبەرگری كردنی شەرعی ناوخۆیی گشتی یەوە لە توخمو بڕیاردا دەگەینە ئەو ئەنجامەی هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیدارن بەفەرمان كردن بەچاكەكردنو قەدەغەكردنی خراپەكان ڕەوایە بەڵكو پێویستە ئەگەر پابەندبوونو پێوەی چەسپا بۆ جێبەجێكردنی ئەم ئەركە.

# بەشی پێنجەم

## بەرگری شەرعی گشتی دەرەکی
## لەتەرازووی شەرع و یاسادا

بەرگری شەرعی گشتی دەرەکی بەهۆیەك لە هۆکارەکانی ڕێپێدان دادەنرێت ئەگەر پایەو مەرجەکانی تیادا بوون و بەربەستەکانی نەمان.

وەباسکردنی بەدەرەکی لەسەر ئەو بناغەیە وەستاوە کەدوژمنکاری زۆربەی کات لەدەرەوەی وڵاتەوە دێت.

لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە دابەش دەبێ بەسەر دوو باس دا:

باسی یەکەم تایبەت دەکرێ بۆ بەرگری کردنی شەرعی گشتی دەرەکی لەتەرازووی شەریعەتی ئیسلامیدا.

باسی دوهەم لەتەرازووی یاسای نێودەوڵەتی گشتی دا.

# جێباسی یەکەم:
# بەرگری شەرعی گشتی دەرەکی لەتەرازووی شەریعەتی ئیسلامیدا

ئەو جۆرە لەبەرگری شەرعی گشتی لەزاراوەی شەرعی ئیسلامی دا پێی دەوترێ (جیهاد)، زانینی هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلامی لەوجۆرە بەرگری یەدا (یاخود جیهاد) لەپێویستی یەکانە، بۆ ئەوەی بەهەڵە تۆمەتباکردنی شەریعەتمان بۆ روون ببێتەوە، کە گوایە دینی ترساندنو تۆقاندنەو بەشمشێر بڵاوبۆتەوە لەوڵاتانو ئاوەدانی یەکانی جیهانداو لەرێگەی بەکارهێنانی توندوتیژی هێزەوە، ئەوەش تۆمەتبارکردنێکی درۆو بوختان کردنە، لە ئەنجامی تێنەگەشتن نا موسڵمانانەوەیە بەراستیو پاکی ئەو شەریعەتە لەبواری جیهاد کردن داو لەسەر رەفتاری نادروست لەلایەن هەندێ لەرۆڵەکانی ئیسلامەوە.

لەسەر جیهانی ئیسلامیو نا ئیسلامی یەکان پێویستە کە بزانن لەوێدا راستی یەك هەیە وەکو روناکی رۆژی نیوەرۆی بەهار رۆشنە، ئەوەش ئەوەیە کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینی ئاشتی یەو بنەرەت لە ئیسلام دا ئاشتی یە،و جەنگیش جیاکردنەوەیە بۆ بەرگری کردن لە ژیانو ئابرووو سامانو بەرژەوەندییەکانی تر کە دەکەونە بەردەمی دوژمنکاریی.

شەریعەتی ئیسلامیش لەسەرەتای ئیسلامدا لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ دانی بەوەدا ناوەکە جەنگ کردن لەخۆی دا رەوایەتی نیە، لەبەر ئەوەی بەڵاو کارەساتی ناشیرین ژیانی زۆرێك لە خەڵکی کاولو وێران دەکات،و

زەویو زارو شتو مەك لەناو دەباتو كاول كاریو كارەساتەكانو ماندوو بوونو ڕەنجو ئازارەكان تەشەنە دەكەن.

جەنگ كردن خراپەیەكی ڕوونە، ئەگەر سەركەوتوش بوو، لەبەر ئەوەی بەشێوەیەكی دڵ ڕەقانە گەلێك برین دار دەكات، نە پارچە بەشوێن داگیركردنو نەبەدەستكەوتنی زۆر ناتوانرێت قەرەبووی ئەو گیانە دەرچوانەی ئادەمیزادو فرمێسكی خێزانە خەمبارو پەژارەدارەكان بكاتەوە، بەڵام ئەگەر جەنگ شەڕێك بێت لەشەڕەكان ئەوە ڕاستی یەكی تاڵە كە سونەتی ژیانو حەزو ئارەزووی زیادەڕەوی كردن كە لەدەروونی مرۆڤایەتی دا خۆی شاردۆتەوە سەپاندوویەتی، كارە ئاشتی یەكان هەرچەندێ شایانی ڕێزداری بێت بە پاڵنەری خۆویستیو بەرژەوەندیە كەسی یەكان لەپشتیەوەیە.

جا پیشە سازیو بازرگانی كردن لە جیهان دا هەرچەند سەروەتو سامانە زەبەلاح دابەش دەكات، بەڵام لە هەمان كات دا خۆشەویستی زیاترو زاڵ بوونو ڕكابەری یان لێ پەیدا دەبێت بەبێ بەزەییانە یاخود ئارامیو هێمنی دەبنە هۆی دڵ ڕەقی ئادەمیزاد، جا جیاوازی نیە كەوتمان بەسروشتی خۆی خێردارە، یاخود وتمان ئەوە بەسروشتی پڕخراپەیە،و پەروەردەی گیانیش ئەوەیە كە ڕەفتار بگۆڕێت، ئیتر ئەو بارە وەرمان گرت یاخود بەوی تر، لەبەر ئەوەی بڕێكی هاوبەش هەیە كەلەسەری ڕێكەوتوون، لەوەدا كەدوو كەس جیاوازییان تیادا نیە، ئەوەش ئەوەیە كە ئادەمیزاد بەلای حەز كردن لەزاڵ بوونو زیادەڕەوی دا لاردەبێتەوە لەسەر مافەكانی كەسانی تر كە لە هەموو سەدەیەكداو لەهەموو بارودۆخێكدا خۆی دەسەپێنێ، بوونی هێزێك بەڕووی چاوچنۆكان دا دەوەستێ كە چاویان بڕیوەتە مافی گەلانو سوكایەتی بە گیانی خەڵكی دەكەن، ئەدەبی ئەو كەسانە دادەدات كە بەردەمیان لەبەهانەكانی مرۆڤایەتیو بنەماكانی شەریعەتو یاسا دانرلوو بەڵگەنامە نێودەوڵەتیەكان گرتووە، وە لەبەر ئەو هۆیانە لە دەروونی مرۆڤایەتی دا، دەبینین كە جیهانی مرۆڤایەتی هەر لەبەدی هێنانی یەوە دابەش بووە بۆ دوو سەربازگە، كە سەربازگەی خێرو

سەربازگەی شەڕە، ئەو سوننەتەش بۆ ژیان وای ویستووە کە لە هەموو سەردەمێك دا دەستێکی دانایی کارساز هەبێت کە پەتەکە بگرێت و کەشتی یە قەرەباڵغە کە کە مل ملانێی تیادایە بەرەو کەناری خێرو چاکسازی بەرێت لەکۆتایی شوێنی گەڕان دا، جا لێرە فەلسەفەی ڕەوایەتی شەڕکردن و پێویستی زامن کردنی بەرگری کردن دەردەکەوێت، لەسەر هەموو ئەوانەی کە خاوەنی توانان کە هاویەشی بکەن لەو جیهاد کردنەداو هەرکاتێك مافە پارێزاوەکان بەپێی شەرع و یاسا کەوتنە بەردەم مەترسی دەستدرێژکردنەوە.

لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتە دابەش دەبێت بەسەر چوار بەشدا.

یەکەم تایبەت دەکرێت بەوەی کە بنەما لە ئیسلامداو ئاشتی یەو جەنگ ناچاریە، بەشە دوهەم بۆ بناغەکانی ڕێسای بنەما لە ئیسلامدا، کە ئاشتی یەو جەنگ ناچاریە. بەشی سێهەم بۆ تایبەتە بەمۆڵەت و قەدەغەکردنی بەرگری شەرعی گشتی. بەشی چوارهەم بۆ حوکمی کۆیلەیە لە ئیسلامدا.

# جێ مەبەستی یەکەم:
# بنەڕەت لەئیسلام دا ئاشتی یەو جەنگیش ناچاریە

بەراورد کردن لەنێوان بانگەوازی ئیسلامی لەو ئایەتانەدا کە لەشاری مەککە دابەزیون وە لەنێوانی هاندان بۆ جەنگ کردن لەو ئایەتانەدا کە لەشاری مەدینەی مونەوەرە دابەزیون، هۆکارێکی گومان و ئاژاوە بوو بۆ زۆرێك لە دەروون نەخۆشەکان کە وا خەیاڵدەکەن کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام شەریعەتی شەڕکردنەو وەکو ڕێسایەکی گشتی بانگەوازی موحەممەدی کۆتایی هێناوەو لەوێنەی کودەتایەکی کۆتایی دا نیشانەی ئاشتی لەئیسلامدا پێ سڕاوەتەوە، هەندێ لەڕۆژهەڵات ناسەکانیش لە ئەنسکلۆپیدیا تازەکانی ئەورووپاشدا بابەتی درێژیان لەسەر ئیسلام نوسیوەو لەسەر ئەو بۆچوونە هەڵانە بیروڕای خۆیانیان لەبارەی ئیسلامەوە نوسیوە.

ئەو ڕۆژهەڵات ناسانەی لەسەر ئیسلام و ڕزگارکردنەکانی (فتوحات) ئیسلامیان نوسیووە ناپاکی یان لەگەڵ ویژدانو وردبوونەوەو بیرکردنەوەی دروست دا کردووە لە تێگەیشتن لەوەی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە، کە دەستوری هەموو مرۆڤایەتی یە و لە سوننەتەکانی پێغەمبەردا هاتووە، وە لە وتەکانی خەلیفە ڕاشدینەکاندا هاتووە، ئەوانەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان بەشێوەیەکی دروست جێبەجێ کردووە. جا شڵەژان لە پێنوسی ئەوانەدا هەر دەمێنێتەوە، هەتا ئەوان بە ڕاستیو دروستی لە ئیسلام نەزاننو هەتا دوورین لە تێگەیشتنی ناوەڕۆکیو ڕەهەندەکانی، ئەو بانەگەشە کردنانەشیان بەردەوام دەبێ هەتا ئەوان بڕیار لەسەر ئیسلام بدەن بە ڕەفتاری هەندێ لەو موسڵمانانەی لەڕووی نەزانینیانەوە یاخود لەڕووی پیلان گێڕانیانەوە لەلایەن کەسانێکەوە کەبەناوی خزمەت کردن بەئیسلام لەپشتی پەردەکانەوە پاڵیان

پێوەدەنێن، هەتا بەدرۆو بوختان کردن وا باسی ئیسلام بکەن کە دینی ترس‌و تۆقاندنە.

ئیسلام دینی ترس‌و تۆقاندن نیە، بەڵکو دینی لێبوردن‌و دینی ئاشتی‌و خۆشەویستی‌و شکۆداری‌و برایەتی مرۆڤایەتی یە.

وشەی (ئیرهاب= ترساندن) کە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: (وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تُظْلَمُونَ)[1]. مەبەست پێی ترساندنە. مەبەست لە (تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ) ئەوەیە پێ ی دەیانترسێنێت، لەبەر ئەوەی ئەگەر دوژمنەکەتان زانی تۆش ئەوەت هەیە کە ئەو هەیەتی لەهێزی بەرگری کردن، یاخود تۆ لەو بەهێزتری، ئەوا تەماحت تیَ ناکات‌و چاوت تیَ نابڕێ‌و ناوێرێ دەستدرێژی بکاتە سەرت، نەلەنزیکەوەو نەلەدوورەوە، ئەوەش ڕاستی یەکە کە سیاسەتی سەربازی نێودەوڵەتی بەبەڵگەیەکی ڕاستی تەواوە ئەوەی سەلماندووە.

شەریعەتی ئیسلامیش پڕە لەگەواهی دان‌و بەڵگەکان لەسەر ئەوەی کە شەریعەتی ئاشتی یەو حوکمی ئەوە نادات پەنا ببرێتە بەر هێز، مەگەر بۆ بەرگری کردنی شەرعی، لەو بەڵگانەش:

وشەی (السلم)= ئاشتی‌و وەرگێراوەکان لێ ی لە قورئانی پیرۆزدا لە (١٣٣) ئایەتی قورئانی دا هاتووە: لەوانە: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ)[2] بەپێ ی پێویستی ئەو ئایەتە دەکرێت پەنا ببرێت بۆ توندوتیژی‌و بەکارهێنانی هێز لەچارەسەرکردنی جیاوازی یەکان‌و کێشەکاندا بەپێ ی پەیڕەو جێبەجێ کردنی پلانەکانی ئەو شەیتانەی کە لەسەر سەختترینی دوژمنەکانی ئادەمیزادە وە لەوانە: فەرموودەی خوای پەروەردگار: (وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى

[1] سوورەتی ئەنفال/ ٦٠.

[2] سوورەتی بەقەرە/٢٠٨.

دَارِ السَّلَامِ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ)[1] وه فەرموودەی خوای پەروەردگار: (فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا)[2].

١- لەبارودۆخی پەنا بردن بۆ بەكارهێنانی هێزو چوونە ناوجەنگەوە بەمەبەستی بەرگری شەرعی، هەركاتێ دەستدرێژی كار دلوای وەستانی جەنگو چوونەناو دانوستانو چارەسەری كێشەكەی كرد بەرێگاكانی ئاشتی، خوای پەروەردگار بەهەر دەبیّو پابەند بوون، فەرمانی كردووە بەوەڵام دانەوەی ئەو شەڕەو وازهێنان لە جەنگو هەڵبژاردنی رێگاكانی ئاشتی، بۆ ئەوە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ).[3]

٢- ئایینی پیرۆزی ئیسلام فەرمانی كردووە كە لەنێوانی خەڵكی دا بەردەوام سەلام لەیەكتری كردن بگۆڕنەوەو سەلام لەیەكتری بكەن كاتێ بەیەكتری دەگەن (السلام علیكم و علیكم السلام) بەڵام لاسایی كردنەوەی موسڵمان بۆ دابو نەریتەكانی خۆرئاوا ئەو رێگا نمونەیی یە نیە كە شوێنی ئەو سەلام كردنەیان بە (صباح الخیرو مساء الخیر= بەیانیت باشو ئێوارەت باش) گرتوەتەوە.

٣- ئایینی پیرۆزی ئیسلام پێویستی كردووە لەسەر هەموو ئەو كەسانەی كە نوێژ دەكەن لە نوێژەكانیان بڵێن: (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ) هەروەكو فەرمانیان پێكراوە كە كۆتایی هێنانی نوێژەكانیان بە دووجار سەلام كردن بێت، سەلامێكیان لەلای ڕاست دەكرێو دووهەمیان لەوانەیە كە كەوتونەتە لای چەپەوە. بۆ ئەوەی سەلام كردن لەبیرو مێشكیاندا رەگ دابكوتێو ڕۆژێ لەڕۆژان بیرنەكەنەوە لەوەی هەستن بەهیچ جۆرە دوژمنایەتی یەك لەدژی

[1] سوورەتی یونس/٢٥.
[2] سوورەتی نیساء\٦٠.
[3] سوورەتی ئەنفال/٦١.

ئادەمیزادەکانی تر بەڵکو لەدژی هیچ گیانلەبەرێکی زیندووی سوودبەخش مەگەر بەمافێك یاخود بەهانەیەکی ڕەوا.

٤- شەریعەتی ئیسلامیو کارکردن بەناوەرۆکەکەی ناونراوە ئیسلام لەبەرئەوەی ئیسلام لە (السلم) وەرگیراوەو ئاشتی هێنانە دی لەنێوانی تاکەکانی نەوەی ئادەمیزاد دا لە پێشەکی مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامەوەیە، بەڵام جێبەجێکردن بەپێی جێبەجێ کردنێك پێچەوانەبێت لەگەڵ ئاشتیو هێمنی شەرعی دا لەکەمو کوڕی ئەو کەسانەیە کە ئەو جێبەجێکردنە بەهەڵە دەبەن بەڕێوە، نەك لە کەمو کوڕی شەریعەتی ئیسلامی خۆیەوە بێت.

٥- شەریعەتی ئیسلامی کوشتنی بەناحەقی لە تاوانە گەورەکان داناوە خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا)[1].

قورئانی پیرۆز قەدەغەی تەواوو بنەبڕی کردووە لە کوشتنی بەناحەق بەبێ جیاکردنەوە لەنێوانی ئەوەدا کە کوژراو موسڵمان بێت یاخود موسڵمان نەبێت هەروەکو لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ)[2] وە وشەی (النفس) لە دابەشتنی تێکڕاییە، کە بەهۆی (ال)ی خایاندن (الاستغراق)ەوە بۆ تێکڕایە.

٦- شەریعەتی ئیسلامی لەدوای ئەوەی ڕێی دا بە بەرگری شەرعی بەڕاشکاوی لە چەندین ئایەتدا لەسنوور تێپەڕاندنی ئەو بەرگری کردنەی حەرام کردووەو زیادەڕەوی کاری بە دەستدرێژی کار داناوە، واتە: هەرکەسێك بەرگری بکات لەمافێکی ڕەوا، ئەگەر لەڕادەی پێویستی ئەو بەرگری کردنە زیادەڕەوی کرد ئەوا هەڵدەگەڕێتەوە لەوەی بەرگری کار بووە بۆ ئەوەی کە دەبێتە دەستدرێژی کار بۆسەر دەستدرێژی کار لەلایەنی بەرپرسیارێتیو سزادانەوە، وە لەو ئایەتە

---

[1] سوورەتی مائیدە/٣٢.

[2] سوورەتی ئیسرا /٣٣.

پیرۆزانه كه دەفەرموێت: (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ)[1] جا ئەم ئایەتە پیرۆزە بەرگری كردنی بەستۆتەوە بەوەی كە دەبێ وەكو دەستدرێژی كار بێ هەروەكو چۆن بووە، وە فەرمانی كردووە بە تەقوای خوا، واتە بەلە خواترسان لەباروبۆخی زیادەڕەوی كردن دا، وە ڕوونی كردۆتەوە كە خوای پەروەردگار لەخوا ترسانی خۆش دەوێت، واتە ئەو كەسانەی كە پابەندن بەسنوورەكانی بەرگری كردن لەترسی خوای پەروەردگار، لەو ئایەتە پیرۆزانەش: (وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ)[2] ئەو ئایەتە ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە جەنگاوەر لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی یاخود بەرژەوەندی تایبەتی، ئەگەر لەسنوورە پێویستەكان زیادەڕەوی كرد، ئەوا هەڵدەگەڕێتەوەو دەبێتە دەستدرێژی كار، خوای پەروەردگاریش دەستدرێژی كاری خۆش ناوێت، دەشفەرموێت: (وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ)[3] ئەو ئایەتە پیرۆزانەی بۆ دەقەكەی زیادكردووە لەسەر هاوشێوەیی‌و زیادەڕەوی نەكردن، هانی دەستدرێژی بۆكراوی داوە لەسەر لێبوردن‌و ئارام گرتن لەسەر ئەو ئازاردانەی كە زیادەڕەوی لەسەركراوە ئەگەر دەستدرێژی كار لەو كەسانەبوو كە شایەنی سۆزو بەزەیی بوو یاخود خۆی بەبێ سزادانی چاك دەكرد.

لە قورئانی پیرۆزدا هاندان بۆ لێبوردن لەزۆر ئایەتی پیرۆزدا هاتووە لە ژماردنی سیفەتەكانی تەقوا كاران (لەخوا ترسان دا) (الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ).[4]

---

[1] سوورەتی بەقەرە /١٩٠.

[2] سوورەتی بەقەرە /١٩٤.

[3] سوورەتی نەحل /١٢٦.

[4] سوورەتی ئالی عیمران / ١٣٤.

٧- قورئانی پیرۆز فەرمان بە بانگخواز دەکات بۆ ڕاستیو ڕێگای شیاو بەوەی شێوازی دانایی وەربگرێت، ڕێگای ئامۆژگاریو ئاراستەکردنو هۆشیار کردنەوە بگرێتە بەرو وتو وێژی کارەکان بەو شێوە بکات کە باشترو چاکترە لەلایەنی نێتو بەلگەهێنانەوە بەبەلگەی ئەقڵی بۆ سەلماندنی ڕاستی یەکانو ڕازی کردنی لایەنی بەرامبەر بەرووداوی تەواو بەکەڵك، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ)[١] پاشان خوای پەروەردگای فەرموودەکانی بەوە کۆتایی پێ دێنێ کەوا بانگخواز بەرپرسیار نیە بەهێنانەدی مەبەست، بەڵکو لەسەری پێویستە هەوڵ گرنگی پێدان بدات، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار زانایە بەسەرگەردانی ئەو کەسانەی کە ڕێگەی ڕاستیان لێ تێك دەچێو سەرگەردان دەبن. وە زانایە بەڕێنومایی ئەو کەسانەی کە ڕێنومایی وەردەگرن، ئەو ڕێگایەش بریتی یە لە (هەوڵ دانی گرنگی پێدان بەبێ هێنانەدی مەبەست) ئەوەش سەبارەت بە بانگخوازی ئاسایی نیە بەتەنیاو بەڵکو سەبارەت بە پێغەمبەرانو نێرراوانی خواشە، ئەو ڕاستی یەش دەقی ئایەتی قورئانی لەسەر هاتووە لەزۆر ئایەتەکاندا، لەوانە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ)[٢] هەروەها دەفەرموێت: (فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ)[٣] هەروەها فەرموویەتی (قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ)[٤] هەروەها ئایەتی (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ)[٥]

---

[١] سوورەتی نەحل /١٢٥.

[٢] سوورەتی غاشیە /٢١ -٢٢، وتارەکە ئاراستەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ و هەموو ئەو بانگخوازانەش دەگرێتەوە کە بانگ بۆ لای خێردەکەن.

[٣] سوورەتی نەحل /٣٥.

[٤] سوورەتی نوور /٥٤.

[٥] سوورەتی بەقەرە /٢٥٦.

هەروەها ئایەتی: (وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ)[1] هەمزە لە ئایەتی (أفأنت)بۆ (أستفهامی بۆ پرسیارکردنی مل نەدانە، لە نەهی کردن بەهێزترە لەبواری ڕەوان بێژیو لەبواری کاریگەریشەوە.

فەلسەفەش لەناڕەوایەتی بەکارهێنانی هێزدا لەدژی ئەو کەسانەی کە مەبەستە بانگ بکرێن بۆ ئیسلام، بریتی یە لەوەی کە باوەڕیە لە دوو توخم پێکدێت:

**أ- توخمی مەعنەوی:**

بریتی یە لە بیروباوەڕی پڕو تەواوو جێگر کە لەگەڵ ڕاستی بوونی خوای پەروەردگارو ڕاستی موحەممەدا ﷺ لە پەیامەکەیدا یەك بگرێتەوە بەوەی قورئانی پیرۆز نیگایە لەخوای پەروەردگارەوە، بە هەموو ئەو لقانەوە کە لێ ی بۆتەوە لەباوەڕ بە نادیارەکان (الغيبيات).

**ب-توخمی ماددی:**

ئەوەش بریتی یە لە کارەچاکەکان جا ئەگەر بەزۆرپێکردن زاڵ بوو بەسەر کارە ماددیەکان دا، بەڵام ناتوانێ زاڵ ببێ بەسەر توخمی مەعنەوی دا کە لەناو دڵدایەو خواو خاوەنەکەی خۆی نەبێت کەس پێی نازانێ، جا بەپێی ئەو ڕاستی یە، زۆرکردن لەسەر دین سەبارەت بەو کەسانەی کە بەتوخمی مەعنەوی ڕازی نابنو دەبێتە کەسێکی دوو ڕوو (منافق)، دەرەوەی پێچەوانەی ناوەوەیەتی، لە کۆمەڵگەی ئیسلامی دا (مونافیق= دووڕوو) ناودەبرێت کە زۆر مەترسی دارترە لەو کەسەی لەسەر بیرو باوەڕی خراپی خۆی دەمێنێتەوە کەلە پێش زۆر لێ کردنەکە باوەڕی پێ ی هەبووە.

---

[1] سوورەتی یونس /٩٩.

# جێ مەبەستی دووەم:
# بناغەکانی ڕێسای
# (بنەڕەت ئاشتیەو جەنگ ناچاریە)

ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر ئەو ڕێسایە دامەزراوە کە بنەڕەت بریتی یە لە ئاشتیو جەنگیش ناچاریە (استثناء) لەسەر چەند بناغەیەك لەوانە:

## یەکیتی رەچەلەک:

قورئانی پیرۆز لەزۆر ئایەت دا دەقی هێناوە لەسەر ئەوەی کە هەموو تاکەکانی ئادەمیزاد خوشکو برای یەك دایكو باوکن، لەبەر ئەوەی لەیەك باوکن کە (ئادەمە– سەلامی خوای لێ بێت) وە لەیەك دایکن کە (حەوایە– سەلامی خوای لێ بێت) بۆ ئەوەی ئادەمیزاد ئاگادار بکاتەوە لەسەر ئەوەی کە سروشتی برایەتی بریتیە لەخێرو چاکەو سوودو دەستەبەرکردنی ئاشتیو ئاسووریو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی بۆ بەرهەمهێنانی خێرو بەرەکەتی زەویو سوود وەرگرتن لەوەی کە خوای پەروەردگار بەدی هێناوە بۆیان لە ئاسمانو بێ گیانەکانو گیان دارەکان، لەو ئایەتە پیرۆزانەش فەرموودەی خوای پەروەردگار: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ)[1] تەقواش بریتی یە لەوزەیەکی گیانی کە ئادەمیزاد بەدەستی دێنێ لە کارە چاکەکانو خۆپاراستن لەشەڕو ڕەفتاری لارو خوارو نزیك بوونەوەی لەخێرو سوودی گشتی هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (أفضل الناس أنفعهم للناس)[2].

---

[1] سوورەتی الحجرات /١٣.

[2] تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە گێڕاویتی یەوە، صحيح الجامع /٣٢٨٧.

## یەکێتی پێکهاتە:

قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەت دا دەقی لەسەر ئەوە هێناوە کە ئەو سەرچاوەیەی ئادەمیزادی لێ بەدی هاتووەو لێی بەدی دێت بریتی یە لە خۆڵ، کارێکی بەڵگە نەویستیشە کە خۆڵیش خۆ بەکەم گرەو هەموو بوونەوەرێکی زیندووی جوڵاو بەویستی خۆی بەسەری دا دەڕوات، جا پێویستە بەدی هێنراویش کە لەو خاکە خۆ بەکەم گرە بەدی هێنراوە، ئەویش لە سروشتی خۆیدا خۆبەکەم گریێت لەبەرئەوەی هەموو شتێك دەگەڕێتەوە بۆ بنەڕەتەکەی، لەبەرئەوەی خۆبەکەم گرتن چاکەیەو خۆ بەزل زانین‌و خۆپەرستیش بەدرەفتاری یە.

هەروەها پێویستە هەرکاتێك ئادەمیزاد پلەو پایەی زانستی‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری زیادی کرد، بەو شێوەیەش خۆ بەکەم گرتنی زیاتر ببێ، هەروەکو درەختی بەردار وابێ، جا درەختێك بەرووبوومی زۆری هەڵگرتووە، لق‌و پەلەکانی بەرەکەیان هەڵگرتووەو سەریان خستۆتە سەرزەوی بۆ خۆ بەکەم گرتن، بەڵام ئەو درەختانەی کە لق‌و پەلەکانی هیچ بەرهەمێکی پێوە نیە سەری بەرەو ئاسمان ئاڕاستەی وەرگرتووە، وە لەو ئایەتە پیرۆزانەی کە بەڵگەن لەسەر یەك سەرچاوەیی ئادەمیزاد فەرموودەی خوای پەروەردگار: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ)[1] وە بەڵگە نەویستە کە هەموو ئادەمیزادێك لە (تۆو ی نێر)و (هێلکەی مێ) بەدی هاتووە، ئەو دوانەش لەناو کرۆکی خوێنن، خوێنیش لەناو کرۆکی خواردن‌و خواردنەوەکانن، ئەوانیش لەناو کرۆکی خۆڵن، لەسەر ئەو بناغەیەش هەموو ئادەمیزادەکان لەیەك سەرچاوە بەدی هێنراون، ئەو سەرچاوەیەش خۆڵە، پێغەمبەری مەزنیش ﷺ ئەوەی دڵنیا کردۆتەوە کە ئەو بناغەیە (یەکێتی ڕەچەڵەك‌و

---

[1] سوورەتی ڕووم /٢٠.

یەکێتی پێکهاتە)ن فەرموویەتی: (كلكم من أدم و أدم من تراب لافضل لعربي على أعجمي ولا أبيض على أسود إلا بالتقوى)[1]

جا لەوێدا نەتەوەیەك نیە کە پێکهاتەکەی بۆ نمونە لە ئاڵتون دروست کرابێ‌و نەتەوەیەکی تر لە کانزای مس بەدی هێنرابێ بۆ ئەوەی یەکەمیان چاکەی هەبێ بەسەر دووهەمەوە، وە لەو ئایەتە پیرۆزانەی بەڵگەن لەسەر یەکێتی پێکهاتە ئەو فەرموودەیەی خوای پەروەردگارە کە دەفەرموێت: (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ[2] مِنْ طِينٍ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً[3] فِي قَرَارٍ مَكِينٍ[4] (١٣) ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً[5] فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً[6] فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ[7] فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ)[8].

## یەکێتی دروست کار:

ئاشکرایە کە هەموو بەدی هێنراوێك لەبێ گیانەکان‌و بوونەوەرە گیاندارەکان لەناویشیاندا ئادەمیزاد لەبەدی هێنراوی خوای پەروەردگارن، ئەوەش لە قورئانی پیرۆزدا چەندین دەقی لەسەر هاتووە، لەوانەش فەرموودەی خوای پەروەردگار: (ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ)[9].

---

[1] مسند البزاز ٧/٣٤٠ ژمارە /٢٩٣٨.

[2] السلاسة= پوختەی

[3] (الحمين والبيبيضة) لەدوای پیتاندنیان.

[4] رەحمی دایك.

[5] خوێنێکی وشك.

[6] پارچە گۆشتێك ئەوەندەی کە بێتە پارویەك.

[7] واتە گیانی دەکەین بەبەردا

[8] سوورەتی مؤمنون /١٢-١٤.

[9] سوورەتی ئەنعام /١٠٢.

ئادەمیزاد وەکو پۆشاکو کەلو پەل نیە کە لە ولآتە جیاوازەکانو کۆمپانیا جیاوازەکان دا بەرهەم بهێنرێت لەجۆری بەرهەم هێنانەکەیدا جا کەلو پەلو پۆشاکی ولآتێکی وەکو بۆ نمونە ئەلمانیا چاکتربێت لەهی ولآتێکی تری بۆ نمونە چین، ئەو جیاوازی یە لە ئادەمیزاددا نیە بۆ ئەوەی هەندێ کەس لە هەندێ کەسی تر جیاوازبێو لەخێرو بەراتەکانی زەوی پشکی شێری هەبێت. لەتەرازووی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا جیاوازی کردنی ڕەگەزی یاخود تایفەگەری یاخود مەزهەبی ناپەسەندە، بێجگە لەوەی لە دیاردەی دواکەوتوویی و نەفامیو تێنەگەیشتنە لەدینو ژیان بەشێوەیەکی دروستو ڕاست.

## یەکیتی بەرژەوەندییەکان

هەرچی لەبوونەوەردا بەدی هێنراوە لەتوانای دا هەیە کە سوود بە ئادەمیزاد بگەیەنێت، هاویەشە لەنێوان هەموو تاکەکانی خانەوادەی مرۆڤایەتی دا لەڕابردوو لە ئێستاو لە داهاتوودا، دابەش بوونی ئادەمیزادیو سنووری دەولەتانو بەشەکان لەناوخۆدا لەهەموو ناوچەکان دا، ئەوانەی لەدروست کردنی ئادەمیزادنو لە دروست کردنی خوای پەروەردگار نین، بۆیە ئایەتەکانی قورئان جەختی کردوەتەوە لەسەر ئەوەی هاویەشە لەنێوانی هەموو خەلکی دا، وەکو لە فەرموودەی خوای پەروەردگاردا هاتووە: (هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا)[1] وشەی (ما) ئیسمی مەوصولەو بۆ گشتی یە لەخۆی داو (جميعا) جەختکەرەوەیە بۆ ئەو گشتی یە.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ)[2] وە ئایەتی تریش هەن بەلگەن لەسەر ئەوەی لە زەویو ئاسمان دا هەیە بۆ ئادەمیزاد بەدی هێنراوەو بۆی ڕام کراوە بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینێ.

---

[1] سوورەتی بەقەرە /٢٩.

[2] سوورەتی لوقمان /٢٠.

شەریعەتی ئیسلام دانی ناوە بە موڵکایەتی تایبەت دا، ئەگەر لەسەر بناغە ڕاستەکانو هۆکارە ڕەواکان دامەزراوبێتو پایەو مەرجەکانی تێدابێت ئەوەش بۆ دوورکەوتنەوە لە ململانێ کانو کێشە لەنێوانی تاکو کۆمەڵگاکان دا.

## یەکێتی چارەنووس

چارەنووسی هەموو ئادەمیزادێك مردنو گواستنەوەیە بۆ جیهانێکی تر خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا[1] فَانٍ (٢٦) وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ)[2] هەروەها ئایەتی (أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِكُكُمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنْتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ)[3].

## یەکێتی بەرپرسیاریتی:

هەموو ئادەمیزادێك لەدنیاو ئاخیرەت دا لە کردەوەکانی بەرپرسیارە خۆ ئەگەر چاکبن ئەوا پاداشتەکەی چاکە، خۆ ئەگەر خراپیش بن ئەوا پاداشتەکەی شەڕە، پارێزیەندی نیە بۆ ئادەمیزاد نە لەدنیاو نە لەئاخیرەتدا ئیتر پلەو پایەی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو ئابووری هەرچۆنێ بێ بۆ هەموویان بەگشتی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ)[4] جا وشەی (من) (اسم شرط) لەخۆیدا بۆ گشتگیری یە.

---

[1] واتە: لەسەر زەوی.

[2] سوورەتی الرحمن /٢٦–٢٧.

[3] سوورەتی نیساء /٧٨.

[4] سوورەتی زلزلة /٧–٨.

## توخمەكانی بەرگری شەرعی گشتی و بناغەكانی

توخمەكانی بنەڕەتی بەرگری شەرعی لە هەموو جۆرەكانی ئیتر ئەگەر تایبەتی یاخود گشتی ناوخۆیی یاخود دەرەكی بێت، بریتی یە لەوەی كە لەپێشەوە ڕوون كراونەتەوە.

جا لەبەرگری گشتی شەرعی دا ئیتر ئەو بەرگری كردنە ناوخۆیی بێت یاخود دەرەكی، ئەو مافە كە دەكەوێتە بەر مەترسی دەستدرێژی كاری ناوخۆیی، یاخود دەرەكی یەوە مافی گشتە بۆ هەموو تاكەكانی كۆمەڵگە، خۆ ئەگەر بەهۆكارە گونجاوەكان بەر پەرچ نەدرایەوە ئەوا زیانەكەی گشتی و گشتگیر دەبێ، تایبەت نابێت بەكەسێكەوە بێجگە لەكەسێكی تر، وەكو دەستدرێژی كاری جولەكە لەم سەردەمەدا لەسەر گەلی فەلەستینی و داگیركردنی زەویەكانی، جا بەرگری كردن لەو گەلە ستەم لێ كراوە لەدژی ستەمكاری ستەم كەری داگیركەر لەسەر هەموو بەتوانایەك پێویستە كە بەدارایی یاخود بەگیان هاوبەشی بكات لەو بەرگری كردنەداو جیهاد بكات لەپێناوی بانگەواز كردن دا بۆ خەڵكی بۆ ئەوەی موسڵمان ببن و بێنە ناو ئیسلامەوە، ئەوەش بە گەیاندنی ڕاستی یەكان و ناوەڕۆكی ئیسلامەوە بۆ ئەو كەسانەی شارەزانین لە ڕۆڵی ئیسلام لە ڕێكخستنی ژیانی خێزانی مرۆڤایەتی.

جیهاد كردنیش دەبێت بەپێنوس و زمان و وەرگێڕانی حوكمەكانی ئیسلام و شی كردنەوەو پوخت كردنی ئەنجامەكانی بەهەموو زمانەكان و بڵاوكردنەوەیان دەبێت.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینی سروشت و ئایینی ژیری ساغ ئایینی سیستەم ئایینی دەوڵەتە، خۆ ئەگەر بە تێگەیشتنێكی ڕاستی و تەواو لێ ی تێبگەن و بەشێوەیەكی دروست و تەواو جێبەجێ بكرێت، دوور لە هەڵخەڵەتاندن و چاوبەست و خورافیات و باوەڕی پڕو پوچ ئەوا هەرچی وا لەسەر زەوی دا باوەڕیان دەهێنا.

# جیٚ مەبەستی سیٚهەم:
# ئەوەی ڕیٚی پیٚدراوە و ئەوەی حەرامە
# لە بەرگری شەرعی گشتی دا -جیهاد-

شەریعەتی ئیسلامی بەرگری شەرعی گشتی ڕیٚکخستووەو بەندی کردووە بەکۆمەڵە مەرجو پابەندیەکەوە، ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کامەی حەڵاڵەو کامەی حەرامە، لەکاتی بەبەرگری شەرعیدا، وا هەندیٚ نمونە دەخەینەڕوو لەسەر ئەوەی ڕیٚپیٚدراوەو ئەوەش کە حەرامە:

**أ- ئەوەی بەهۆی جیهادەوە ڕیٚ پیٚ دراوە:**

١- لەناوبردنی کەس‌و شتی تر لەپیٚش بەدیلگرتنیان‌و لەپیٚش کۆتایی هاتنی جەنگەکە سەبارەت بە هەموو ئەو کەسانەی بەشیٚوەیەکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ هاوبەشییان لەدەستدریٚژی کردنەکەدا کردووە.

٢- لەناوبردنی یاخود بردنی هەموو ئەو کەرەسە سەربازیانەی کە لەو دەستدریٚژی کردنەدا بەکارهیٚنراوە لەلایەنی دوژمنەوە، یاخود لەباریا هەبووە لەکاتی دەستدریٚژی کردنەکەدا بەکاربهیٚنریٚت.

٣- لەناوبردنی یاخود بردنی هەموو ئەو ئازووخە سەربازیانە لە چەك‌و تەقەمەنی‌و کەرەستە خۆراکی یەکان‌و داودەرمان‌و شتی تریش، کە دوژمن لەکاتی دەستدریٚژی کردنەکەیدا پشتی پیٚ دەبەستیٚ.

٤- لەناوبردنی یاخود بردنی هەموو ئەو شتانەی کە لەباری دا هەیە دوژمن پشتی پیٚ ببەستیٚ لەهیٚنانەدی مەبەستی دوژمنکاری یەکەیدا.

٥- وەرگرتنەوە هەموو ئەوانەی دوژمن دەستی بەسەردا گرتبو لەوانەی کە بەرگریان پیٚدەکرا لە ئامیٚری جەنگی‌و کەسی دیل‌و سامان‌و دارایی وەکو

خانوویەرەو گوێزراوەکان.

**ب–ئەوەی ئەنجام دانی حەرامە لەکاتی بەرگری شەرعی و لەپاش بەرگریەکەش:**

١– نابێ و دروست نیە لەناوبردنی کەس و شتی تریش، سەبارەت بە هەموو ئەوانەی کە هاوبەشییان یان نەکردووە لەدەستدرێژی کردن دا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆو تایبەتی ژنان و منالان و پیروپەککەوتەو پیاوانی ئاینی.

٢– نابێ و دروست نی یە کوشتنی دیل، یاخود ئازاردانی لەکاتی جەنگو لەدوای جەنگەکەش لەبەر ئەوەی دژایەتیکردن کردن سەبارەت بەو کۆتایی دێت.

٣– نابێ و دروست نیە تالان کردن و لێ سەندن و زەوت کردن سەبارەت بە ماڵ و سامانی ئەو کەسانەی کە مەدەنین و سەریەلایەنی دەستدرێژی کارانن ئەگەر دەستدرێژی کار لەدەستدرێژی کردنەکەیدا بەکاریان نەهێنێ.

٤– نابێ ئاوەدانیەکان کاول بکرێن وەکو ڕوخاندنی خانوو بڕینی درەختەکان یاخود هەڵکەندنیان وە نابێ کشتوکاڵ لەناوببرێت، چ لەکاتی جەنگداو چ لەدوای جەنگەکەش.

٥– نابێ زەوی هەریەکە لەدەستدرێژی کارو دەستدرێژی بۆسەر کراو داگیربکرێت، لەبەر ئەوەی دەست کەوتەکانی جەنگ لە کەرەستەکان و ئازوخە جەنگیەکان دا کورت دەبێتەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە لەدەستدرێژی کردنەکەدا بەکاردەهێنرێت بەبێ شتی تر، جا داگیرکردن لە شەریعەتی ئیسلامیش و لە یاساکانی نێودەوڵەتیش دا حەرامن.

٦– نابێ شوێنی دەستدرێژی کار بکەوێ لەزەویەکانی خۆی دا، لەبەر ئەوەی گەڕانەوەی دەستدرێژی کار بۆ ئەو شوێنانەی کە لێوەی هاتووە مانای کۆتایی هێنانێتی بە دوژمن کاری، جا هیچ بەهانەیەك نامێنێتەوە بۆ دواکەوتنی ئیتر ئەو کشانەوەیە بەویستی خۆی بێ یاخود بەناچار کردنی بێ.

٧- نابێ زیادەڕەوی بکرێت لە سنوورەکانی بەرگری شەرعی دا، وە نابێ چەکێك بەکاربهێنرێت کە بەهێزتربێت لەو چەکەی لەدەستدرێژی کردنەکەدا بەکار هاتووە، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار فەرموویەتی (فأعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم) جا لێك چوون واتە: گونجاندن وەکو بووەو چۆن بووە.

٨- نابێ دیلەکانی جەنگ بهێڵرینەوە بەڵکو پێویستە بە بەرامبەر ئازاد بکرێن یاخود بەبێ بەرامبەر هەر لەپاش تەواو بوونی جەنگە ڕەوا کە یاخود ناڕەواکە ئازادبکرێن‌و نابێ ئازار بدرێن‌و برسی‌و تینو بکرێن بەپێی فەرموودەی خوای پەروەردگار: (وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا).[1]

وە بەردانی دیلەکانی بەخێرایی پێویستە، ئیتر ئەو بەردانە لەبەرامبەردا بێت وەکو گۆڕینەوەی دیلەکان، یاخود پێویست کردنی مەرجی ڕەوا لەسەر لای بەرامبەر یاخود بە قەرەبوو کردنی مادی یاخود مەعنەوی، وەکو ئازاد کردنی دیلەکانی جەنگی بەدری گەورە لەبەرامبەر فێرکردنی منالآنی موسڵمان بەنوسین‌و خوێندنەوە، بەڵگەش لەسەر ئەوە قورئانی پیرۆزە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنْتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا).[2]

## سەرچاوەکانی حەڵاڵ و حەرام لە بەرگری شەرعی گشتی دەرەکی (جیهاد)

ئەو سەرچاوانەی کە لەبەرگری شەرعی گشتی دا حەڵاڵ‌و حەرام دەخەنەڕوو قورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ وە ڕاسپاردنەکانی جەنگە لەلایەن خەلیفەکانی ڕاشیدینەوە وەکو:

---

[1] سوورەتی ئینسان /٨.

[2] سوورەتی موحەممەد /٤.

١- قورئانی پیرۆز: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ)[1] هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ)[2] لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: (وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ)[3] بێجگە لەم ئایەتانەش سەدان ئایەتی تر لەم جۆرە هەن.

٢- سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئەو موسڵمانانەی دواندووە کە هاویەشی دەکەن لە جیهاد کردن دا بۆ پارێزگاری کردن لەدین‌و ئابڕوو ژیان‌و دارایی، فەرموویەتی: (لا تغدروا ولا تغلوا[4] ولا تقتلوا وليدا وستجدون رجالاً في الصوامع معتزلين من الناس فلا تعرجوا لهم ولا تقتلي امرأه ولا صغيراً ولا كبيراً فانياً ولا تحرقن نخلاً ولا تقلعن شجرا ولا تهد من بيتاً)[5].

٣- ڕاسپارەکانی خەلیفەکانی ڕاشدین:

أ- خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری سدیق ڕەزای خوای لێ بێ ئەو هاوەڵانەی دەدوان کە لە جیهاد کردن دا بوون، پێی وتن: (ناپاکی مەکەن‌و ستەم‌و غەدر مەکەن‌و منداڵی بچوک‌و پیرو ئافرەت مەکوژن، دارخورما مەبڕینەوەو لەڕەگەوە هەڵی مەکێشن‌و درەختی بەردار مەبڕنەوەو مەڕو مانگاو حوشتر سەرمەبڕن) تێبینی ئەوە بکرێ کە ناوبردنی ئەو ئاژەڵانە تەنها هەر ئەوانە نی یە بەڵکو بڕیارەکە هەموو گیاندارێکی تر دەگرێتەوە کە موڵکی خەڵکی مەدەنی بێت.

---

[1] سوورەتی بەقەرە /١٩٤.
[2] سوورەتی نەحل /١٢٦.
[3] سوورەتی بەقەرە /١٨٨.
[4] الغل والغدر – لەباروئۆخی زیادەڕەوی کردن لەسنوورەکانی بەرگری شەرعی ڕوو دەدەن.
[5] الواقدي، بەرگی /٢، لاپەڕە /٧٥٨.

ب- عومەری کوڕی خەتاب لەکاتێکدا کە قسە لەگەڵ یەکێك لەسەرکردەکانی سوپای موسڵمانان دەکات دەڵێ: (من فەرمان بەتۆش‌و بەو سەربازانەش دەکەم کەوان لەگەڵتا کە لەهەموو کاتێکدا لەخوابترسن لەبەر ئەوەی لەخواترسان چاکترینی کەرەستەکانە لەسەر دوژمن گەورەترینی پیلانیش لەجەنگدا، وە فەرمان بەتۆو بەوانەش دەکەم کەوان لەگەڵتا کە بەتوندترینی شێوە خۆتان لەتاوان‌و یاخی بوونەکان بپارێزن زیاتر لەدوژمنەکانتان. لەبەر ئەوەی گوناهکردنی سوپا بەسەریانەوە مەترسی دارترە وەك لەدوژمنەکەیان، بەڵکو سەرکەوتنی موسڵمانان بەهۆی یاخی بوونی دوژمنیانە لە خوا، خۆ ئەگەر ئەوە نەبوایە ئێمە هێزی ئەوانمان نەدەبوو، لەبەر ئەوەی ژمارەی ئێمە وەکو ژمارەی ئەوان نیە وە نە کەرەستەکانیشمان وەکو کەرەستەکانی ئەوانە، خۆ ئەگەر ئێمە کەوتینە ناو یاخی بوونەوە ئەوا ئەوان لەهێزدا لەئێمە چاکترن).

ت- خەلیفەی چوارەمیش عەلی کوڕی ئەبو تالیب ڕەزای خوای لێ بێ لەکاتێکدا کە یەکێك لە سەرکردەی موجاهیدەکانی دەدواندو مەبەستی هەموان بوو (نەکەی خوێنەکان بەناحەق بڕێژی، هیچ شتێ نی یە ئەوەندەی ئەوە ببێتە هۆی نەگبەتی‌و دەرئەنجامی خراپی گەورەی مرۆڤو نەهێشتنی نیعمەت، جا دەسەڵاتی خۆتان بەرشتنی خوێنی حەرام بەهێز مەکەن ئەوەیە کە دەبێتە هۆی کەم‌و کوڕی‌و لاوازی دەسەڵات بەڵکو نای هێڵێ‌و دەی گوێزێتەوە.)

لەکۆتایی دا بەو کەسانە دەڵێم کە گومانی خراپیان هەیە بەجیهاد کردن لەئیسلامدا، ئەگەر هەڵە کردنێك هەبێ لە ڕزگار کردنە (فتوحات)ەکانی ئیسلامی دا، سەرچاوەی ئەو هەڵەکردنە سوپاکەو سەرکردەکە خۆیەتی، ئەو ڕاستی یەی کە پەیوەندی هەیە بە بەرگری کردنی شەرعی گشتی دەرەکی یەوە (واتە: جیهاد) بریتی یە لەوەی کە باسمان کرد لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

## حوکمی بەکۆیلەکردنی ئادەمیزاد بۆ برا ئادەمیزادەکەی لە ئیسلامدا

بەشێوەیەکی کورت خستنەڕووی ئەم بابەتە دەگەڕێنینەوە بۆ دوو هۆ:

یەکەمیان: زۆرێك لەوانەی کە هێشتا لە ڕەهەندەکانی ئیسلام‌و ڕاستێتی تێ نەگەیشتوون، بەردەوامن لەسەر ئەوەی پڕوپاگەندە بکەن کە شەریعەتی ئیسلام دانی ناوە بەو سیستەمە بۆگەنەدا (بەکۆیلە کردن)ی ئادەمیزاد بۆ برا ئادەمیزادەکەی، ئەوەش لە شەریعەتی ئیسلامیدا چەسپابێت تا ڕۆژی دوایی بەردەوام دەبێت، ئەو پڕوپاگەندەیە خراپەیە بەرامبەر بە ئیسلام، ئەگەر چی مەبەستیشی باش بێت، بەڵام هەر خراپەیە بەرامبەر ئیسلام دەکرێ و ڕاستێتی یەکەی دەشێوێنێ‌و تیشکی سەوز بۆ دوژمنانی هەڵدەکات بۆ تاوانبارکردنی بەوەی کە دینی زۆرداری‌و دڵ ڕەقی‌و ترساندن‌و دواکەوتنە، بەشێوەیکی تایبەتیش لەدوای ئەوەی کە یاسای هەموو جیهان بە تاوان دایناو سزای لەسەر دەرکرد.

دوهەم: لەڕاستی دا سەرچاوەی سەرەکی بۆ بوونی دیل، جەنگە ناڕەواکان بوو کە لەنێوانی کۆمەڵگە دڕندەکان دا ڕوویان دەدا، دەوڵەتەکانی جیهان ئێستا وازیان لەو ڕێگایە هێناوە.

لەبەر ئەو دوو هۆیە، لێکۆڵینەوە لەو دوو بابەتە لە زیاتر جێگەیەك لە کتێبەکانم‌و لێکۆڵینەوەکانم هاتووە، بۆ نەهێشتنی ئەو بیرو بۆچوونە خراپەی کە لەمێشکی هەندێ لە موسڵمانان دا هەیە، کە بەناوی بەرگری کردن لە ئیسلام، ناوبانگی ئیسلام دەشێوێنن بەنیێتێکی چاکەوە بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن.

# جێ مەبەستی چوارەم:
# مافەکانی دیل و نەخۆش و بریندارو کوژراوانی جەنگ لە شەریعەتی ئیسلام دا

لەم بەشەدا باس لەمافەکانی دیل دەکەین بەهەندێك لەدرێژەپێدان لەگەڵ ئەوەشدا کە لەدانراوەکانی تردا باسمان لێ کردووە، لەبەر ئەوەی بابەتەکە لەلای زۆرێك لە رۆشنبیرە موسڵمانەکان رۆشتن نیە.

مافەکانی دیل: بەپێی دەقەکانی قورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەو وڵاتو لایەنانە پێویستە کە دیلیان لەلایە پارێزگاری لەدیل بکەنو نەیان کەنە کۆیلە، پارێزگاری ژیانیان بکەنو نەیانکوژن، پارێزگاری جەستەیان بکەنو سزاو ئەشکەنجەیان نەدەن، پارێزگاری لەرێزو کەرامەتیان بکەنو سوكو رسوایان نەکەن، وەکو لەم روون کردنەوانەدا هاتووە:

ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە سیستمێکەوە هاتووە کە ئادەمیزاد ئازاد دەکات لە بەکۆیلەکردنو لە تاریکایی کۆیلایەتی مرۆڤو شیرکو ستەم دەریدەهێنێ بۆ ناو روناکایی‌و ئازادی‌و دوورخستنەوەی لەکۆیلایەتی کردن بۆ بێجگە لەخوای پەروەردگار، هەروەکو خوای پەروەردگار فەرمانمان پێ دەکات کە لەهەموو کاتێکی نوێژەکانمان دا دووبارەی بکەینەوە بڵێین: (إياك نعبد وإياك نستعين)[1] بۆ رۆشنایی باوەڕو دانپەروەری.

---

[1] سوورەتی فاتیحە /٥.

بەكۆیلەكردنی ئادەمیزاد بۆبرا ئادەمیزادەكەی لە دیاردەكانی سەردەمی درندایەتیو دواكەوتویی بوو، جا چۆن دەستووری نەمری خوای پەروەردگار بڕیار لەسەر كارێك دەدات كە ژێری ساغ بەدیاردەیەكی دواكەوتو ناشیرینی دادەنێت.

بەڵام بۆچی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەیەك جاردا حوكمی پوچەڵ كردنەوەی نەدا؟

ئایینی پیرۆزی ئیسلام چارەسەری نەخۆشیە كۆمەڵایەتیە درێژ خایەنە جێگیرەكانی بەهەنگاوو قوناغی پلە بەپلە كردووە بۆ خۆپاراستن لە پەرچەكرداری خراپ، وەكو حەرام كردنو قەدەغەكردنی سەرخۆشكەرانو سوو خواردنو بەكۆیلەكردنو هاوشێوەیان.

كاتێ كە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات ڕێژەی كۆیلەكانو كەنیزەكەكان زیاتر بوون لە ڕێژەی ئازادەكان جا ئەگەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەیەك جار بڕیاری پوچەڵ كردنەوەی كۆیلەی بدایە ئەوا ئەم ئەنجامە خراپانە دەهاتنە ئاراوە.

١- بازرگانی كردن بەكۆیلەوە بڕبڕەی پشتی ژیانی ئابووری بوو، جا ئازادكردنی كۆیلە بەیەك جار دەبووە هۆی وەستانی سەمكارانو گەورەو خاوەنی كۆیلەكان لەدژی پەیامی ئیسلامی.

٢- لەبەیتول مال (خەزێنە)ی موسڵمانان دا ئەوەندەی تیادا نەبوو كە ژیانی ملیۆنەها كۆیلەی ئازاد كراو دابینو مسۆگەر بكات، سەرچاوەیەكیش نەبوو بۆ ژیانیان، جا ئازادكردنیان بەیەك وەجبە دەبووە هۆی هەستانیان بەیاخی بوون لەدژی ئیسلام.

٣- كەمدەستو هەژارەكان ڕاهاتبون بۆ كۆیلایەتی كردن، ئازادكردنی ئەوانە دەبووە هۆی ئەوەی پێی ڕازی نەبن، هەروەكو ئەوە لە ئەمریكادا ڕوویدا، كاتێ كە یاسای بەتاڵ كردنەوەی بەكۆیلەكردن لەشانزەهەم سەرۆكی وڵاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا (ابراهام لنكولن)ەوە (١٨٦١-١٨٦٥) دەرچوو.

كە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات بینی، ڕژێمی بەكۆیلەكردنی ئادەمیزاد بۆ برا ئادەمیزادەكەی زەلكاوێكی بۆگەنەو لەچەند جۆگەیەكەوە ئاوی بۆ دەچێت، بۆیە

ئاوی جۆگەکانی لێ بڕی، بە دەست گرتن بەسەر ئەو جۆگانەدا، ئەوەبوو زەلکاوەکان وشکیان کرد بەبێ گەڕانەوە، ماوەیەکی ڕاگگوزەر دانرا بۆ کۆتایی پێهاتنیءو لەو ماوەیەدا لە قورئانی پیرۆزو لە سونەتی پێغەمبەردا حوکمی بۆ ڕێکخراو، پاشان کارکردن بەو دەقانە وەستا کە ئەو حوکمانەی ڕێك دەخست، ئەوەش پێی ناوترێت سڕینەوە بەڵکو ئەوە وەستانە بە کارکردن بەو دەقەی کە بۆ چارەسەرکردنی مەبەستێکی دیاری کراو هاتووە، جا بەکۆتایی هاتنی ئەو مەبەستە کارەکە کۆتایی پێ دێت، هەروەکو لە یاسا وەزعیەکان دا ناسراوە.

لەو بنەما ڕیشەییءو فیقهیانەی کە لەئیسلامدا کۆڕایان لەسەرە: حوکم لەگەڵ هۆکارەکەیدا دەسوڕێتەوە بەبوونءو نەبوونی هۆکارەکە جا ئەگەر هۆکارەکە نەما ئەوا حوکمەکەش نامێنێ.

## گرنگترین هۆکارەکانی بوونی کۆیلە لەسەردەمەکانی پێش ئیسلامدا

١- جەنگ: جەنگ کردن لەپێشەوەی هۆکارەکانی بەکۆیلەکردن بووە لەلای گەلەکانی پێشوو، جا قورئانی پیرۆز هاتو چارەنوسی دیلەکانی لە ئازادکردنیاندا پوخت کرد بەبێ بەرامبەر یاخود بە بەرامبەر، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً)[1]. ئەو داڕشتنە قورئانی یە لەزانستی ڕەوان بێژی دا بۆ (الحصر= قەتیسکردن)ە. جا بۆ هیچ موجتەهیدێك نیە کەلێنێکی تری بۆ زیاد بکات بەوەی بڵێ یاخود بەکۆیلەکردن یاخود کوشتن، یاخود ئیسلام، لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار نەبیری ئەچێتەوەو نە بەو کەلێنانەش بێ ئاگابوو.

نە پێغەمبەری خوا ﷺ وە نەهیچ سەرکردەیەکی موسڵمان لەجەنگ دا هیچ دیلێکیان نەکردۆتە کۆیلە، کوشتنی کۆیلەش لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ

[1] سوورەتی محمد /٤.

چەندین هۆکاری تری هەبووە، کە لەم شوێن لێکۆڵینەوەی دیاری کراوەدا ماوەی باس کردنی نیە.

کاتێ شاری مەککەی ڕزگار کرد فەرمووی: بڕۆن هەمووتان ئازادن.

سەرکردەی ئیسلامیش صەلاحەدینی ئەیوبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەجەنگی خاچپەرستەکاندا بیستو پێنج هەزار دیلی بەبێ بەرامبەر ئازادکرد.

٢– چەتەگەریی فڕاندنو هاوشێوەیان: قوربانی یەکانی ئەو دەستدرێژ یانە، مامەڵەی دیلی جەنگیان لەگەڵدا دەکرا کۆیلەییان بەسەردا دەسەپاندن، ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەو ڕێگایەی حەرام کردووەو سزای بەرگری کردنی توندی بۆ بڕیاردراوە.

٣– ئەنجامدانی هەندێ تاوانی مەترسیدار: وەکو کوشتنو دزی کردنو زیناکردن، جا بڕیاری سزادان بەسەر تاوان باردا بەکۆیلەکردن بوو بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت یاخود بۆ بەرژەوەندی دەستدرێژی بۆ سەرکراو بوو یاخود بۆمیرات گرەکانی بوو. بەڵام ئاینی ئیسلام سزای تایبەتی بەو تاوانەی دیاری کرد.

٤– بڵاوبونەوەی هەژاریی: کەوا لەهەژار دەکات پەنا بەرێت بۆ قەرز کردن، جا کاتێ هەژارەکە نەیتوانی قەرزەکە بداتەوە چەند ئەوەندە سووی لەسەر زیاد دەکرێت لە کۆمەڵگەیەکی هەژاردا کە تەرازووی دادپەروەری تیایدا تێك چووە.

ئەو سووەش هۆکارێك بوو بۆ زیادکردنی ڕادەی هەژاری کە قەرزداری بەرەو ڕۆنگاوی کۆیلایەتی دەبرد، کاتێ کە بۆخاوەن قەرز هەبوو کە قەرزدارو ژنەکەیو منالەکانی بەشێوەی کۆیلە بفرۆشێت. جا ئاینی ئیسلام چەندین هۆکاری داناوە بۆ دەست گرتن بەسەر گیرو گرفتی هەژاریدا وەکو خەراجو زەکاتو هاوشێوەیان، سوو خواردنیشی حەرام کردووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:
(وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ).[١]

[١] سوورەتی بەقەرە /٢٨٠.

٥- دەسەڵاتی کەسێك بەسەر خۆیدا: لەکاتی ناچاری ئابووری دا خۆی بەکەسێکی تر دەفرۆشێت بۆ دەست کەوتنی پارووپەك بژێوی جا ئایینی ئیسلام هاتو بەچەند رێگایەك ئەو رێگایەی داخست، هەروەکو باسمان کرد.

٦- دەسەڵاتی باوك: باوك مافی ئەوەی هەبوو کە هەرکامێکیانی بویێ لەمنداڵەکانی وەکو کۆیلە بفرۆشێت، ئیسلام ئەوەشی حەرام کرد.

٧- وەچەخستنەوەی کۆیلەکان: کوڕی کەنیزەك بە پێی بنەچە دەبووە کۆیلە، بەڵام ئیسلام ئەو کوڕەی بە ئازاد دادەنا ئەگەر باوکی ئازاد بوایە.

هۆکاری تریش هەن ماوەی باس کردنیان نیە.

**هۆکارەکانی تەقینەوەی ئەو سەرچاوانە:**

١- هۆکارەکانی ڕەگەز پەرستی هۆزایەتی و ئایینی.

٢- خراپ بوونی رژێمی ئابووری.

٣- نەبوونی گیانی سۆزو بەزەیی لەناو خەڵکی دا.

٤- دیارنەبوونی شەرع و یاسا.

٥- نەبوونی سزای شیاو بۆ سزادانی تاوان بار.

**رێگاکانی دەست گرتن بەسەر سیستەمی کۆیلایەتیدا.**

ئایینی ئیسلام چەند رێگایەکی داناوە بۆ دەست گرتن بەسەر ئەو سیستەمەدا، لەو رێگایانەش:

١- حەرام کردنی بەکۆیلە کردنی دیل بەچارەنوس دیاریکردن کە ئازادکردنە لەبەر ئەم حیکمەتانە:

أ- دیل بەئارەزووی خۆی نایەت بۆ گۆڕەپانی جەنگ (لەزۆربەی کاتدا)، ئیتر لەسەر چ بنەمایەك دەکرێتە کۆیلە؟

ب-لەئیسلامدا جەنگ کردن بۆ بەرگری کردنی شەرعی یە، سەبارەت بە دیل لەدوای بەدیل گرتنی، کۆتایی پێ دێت، جا بە کۆتایی هاتنی دوژمنکاری، بەرپرسیارێتی یەکە کۆتایی پێ دێت.

ت- ناچاركردنی بۆ موسڵمان بوون به‌ هه‌ڕه‌شه‌ی كۆیله‌یی كردنی پێچه‌وانه‌ی قورئانی پیرۆزه‌ له‌و ئایه‌تانه‌ش كه‌ هاتوون: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ).[1]

پ- به‌راورد كردن به‌ هاوشێوه‌ كه‌زۆرێك په‌نای بۆ ده‌به‌ن ڕه‌وایه‌تی به‌كۆیله‌كردنی دیل له‌زۆر ڕووه‌وه‌ ناپه‌سه‌نده‌، له‌وانه‌:

یه‌كه‌م: له‌ هه‌موو وڵاته‌كانی جیهان دا به‌كۆی ده‌نگ ڕژێمی كۆیلایه‌تی پوچه‌ڵ كراوه‌ته‌وه‌ ئیتر كوا به‌راوردكردن به‌هاوشێوه‌.

دووه‌م: به‌راوردكردن به‌ هاوشێوه‌، پێویست به‌وه‌ ده‌كات یان مامه‌ڵه‌ی كۆیله‌یه‌كی ناو زراوی له‌گه‌ڵ بكرێت واته‌ (به‌كۆیله‌ كردنی به‌نده‌) وه‌ك ده‌سه‌ڵاتێك په‌روه‌ردگار هه‌یه‌تی یاخود دابه‌زاندنی مامه‌ڵه‌ی په‌روه‌ردگار له‌گه‌ڵیدا بۆ مامه‌ڵه‌ی به‌نده‌كه‌ی، ئه‌م دووه‌ هه‌ردووكی به‌تاڵن.

سێهه‌م: به‌كۆیله‌كردنی دیل به‌مه‌به‌ستی تۆڵه‌ كردنه‌وه‌ له‌دوژمن پێچه‌وانه‌ی فه‌رمووده‌ی خوای په‌روه‌ردگاره‌: (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى).[2]

٢- ئیسلام ئازادكردنی كۆیله‌ی كردوّته‌ كه‌فاره‌تی زۆرێك له‌ گوناهه‌كان هه‌روه‌كو له‌ (ظیهار)و (كوشتنی به‌هه‌ڵه‌دا) دای ناوه‌، خوای په‌روه‌ردگار له‌ باسی (ظیهار)دا ده‌فه‌رموێت: (وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا)[3]، هه‌روه‌ها له‌ كوشتنی به‌هه‌ڵه‌دا له‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌دا ده‌فه‌رموێت: (وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ).[4].

---

[1] سووره‌تی به‌قه‌ره‌ /٢٥٦.

[2] سووره‌تی ئه‌نعام /١٦٤.

[3] سووره‌تی المجادلة /٣.

[4] سووره‌تی نیساء /٩٢.

٣- قورئانی پیرۆز بەهای (١/٨)ی دەست کەوتی زەکاتی تایبەت کرد بۆ ئازادکردنی کۆیلە، بۆ ئەوەی کۆیلە ئازادی بۆ بگەڕێتەوە بەدەرکردنی بڕێك دراو کە لە دارایی زەکات دەردەچێتو دەدرێتە گەورەکەی لەبەرامبەر ئازادکردنی دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ).[1]

٤- ئیسلام بڕیاری داوە کە کوڕی هەموو کەنیزەکێك کە باوکی کوڕەکە ئازاد بێت کە لەگەڵ کەنیزەکەکەدا بە هاوسەری یاخود بەخاوەن دارێتی بژی ئەو منالە بە ئازاد دادەنرێت، دایکی کوڕەکەش لەپاش مردنی مێردەکەی یاخود گەورەکەی خۆی بۆخۆی ئازاد دەبێت، بەو شێوە ئایینی پیرۆزی ئیسلام نەیهێشت (وەچە) بوون وەکو هۆیەك لە هۆکارەکانی کۆیلە بەکار بهێنرێت.

٥- ئیسلام فەرمانی دەرکردووە فەرمانی پێویست بوونو پابەند بوون، کە هەرکەسێك توانای هەبێت لەبواری دارایی دا ئەوا بەدارایی یەکەی یارمەتی دەربێت لە ئازادکردنی کۆیلەدا لەڕێگەی کڕینو ئازاد کردنیەوە، یاخود لەڕێگەی دانی پارە بە کۆیلەکان، بۆ ئەوەی ئەوانیش ئەو پارەیە بدەنە خاوەنەکانیان لەبەرامبەر ئازاد کردنیان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ).[2]

٦- خوای پەروەردگار فەرمانی کردووە بە گەورەی کۆیلەکان بۆ ئازادکردنی کۆیلەکانیان، فەرموویەتی: (فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا)[3] هەروەها هانی

---

[1] سوورەتی تەوبە /٦٠.
[2] سوورەتی بەقەرە /١٧٧.
[3] سوورەتی نوور /٣٣.

هەموو ئەو کەسانەی داوە کە لەبواری دارایی دا بەتوانان کۆیلە ئازاد بکەن لەبەرامبەر پاداشتێکدا لەخواوە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ فَكُّ رَقَبَةٍ).[١]

٧- ئایینی پیرۆزی ئیسلام بڕیاری ئازادکردنی دارایی کۆیلەو کەنیزەکەکانی داوە خۆیان بۆخۆیان ئەگەر لقەکانیان هەیان بووبێ.

٨- هەرکەسێك بەشی خۆی لەکۆیلە ئازاد کردبێ کە لەکۆیلەکەدا هاوبەشی هەبووبێت ئەوا بەشی هاوبەشەکەش ئازاد کردوە ئەگەر توانای ماددی هەبووبێ، جا پێویستە قەرەبوو بداتە هاوبەشەکەی لەبەرامبەر بەشەکەیدا.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەو شێوەیە ئەو نەخۆشیە درێژ خایەنەی لەناو بردووە کەڕێزی ئادەمیزاد سوك دەکاتو کەسێتی تێکدەشکێنێو هەموو ئادەمیزانێکیش لەلای خواوە ڕێزی لێ گیراوە.

**مافەکانی دیلی جەنگ**

مافی دیلەکانی جەنگ بۆ پارێزگاری کردن لە ژیانو سەلامەتییانو خۆش مامەڵەکردن لەگەڵیانداو بە ئازادی ئەنجام دانی دروشمە ئایینیەکانیانو لەپاش کۆتایی هاتنی جەنگەکە ئازادکردنیان، بەپێی ئەم بەڵگە نەقڵیو عەقڵی یانەوە:

**أ- لەبەڵگە نەقڵی یەکان:**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا)[٢] هەروەها فەرموویەتی: (فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً).

لەڕۆژی بەدری گەورەدا (عەباس) یان بەدیلی هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش کراسێکی عبدالله ی کوڕی ئەبو حاریسی لابوو، کردیە بەری[١] و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (الا لا يجهزن على جريح ولا يتبعن مدبر ولا يقتلن أسيراً).[٢]

---

[١] سوورەتی بەلەد /١٢-١٣.

[٢] سوورەتی ئینسان /٨.

لەڕزگارکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی نەکرد بەکوشتنی کەس، سێ کەس نەبێت لەبەرئەوەی ناپاکی گەورەیان کردبوو، نەك لەبەر ئەوەی کە دیلن، بێجگە لەمان بەخەڵکی مەککەی فەرموو: (لا تثريب عليكم انهبوا فأنتم طلقاء).[3]

دیل نەکوژرا لەبەر ئەوەی دیلە، بەڵکو لەبەر ناپاکی گەورەیان بوو کە کردبوویان، جا خەلیفەکانی ڕاشیدینو سەرکردەکانی موسڵمانانیش پەیڕەوییان لە پێغەمبەری خوا کردو ﷺ.

شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (سوفیانی کوڕی عیینە هەواڵی پێ داین کە لەڕۆژی (صفين)دا کە هێشتا جەنگەکە هەر بەردەوام بوو عەلی دیلێکی هێنا، دیلەکە وتی مەمکوژە، عەلیش پێی وت: نات کوژم من لەخوای پەروەردگاری جیهانیان دەترسم، ئیتر ئازادی کرد).[4]

سەرکردەی ئیسلامیش سەلاحەدینی ئەیوبی لە جەنگەکانی خاچ پەرستاندا هەزاران دیلی ئازادکرد، بەڵام ناپلیۆن بۆنابرت کاتێ کە خواردنی بۆ دیلەکان لانەما کە ژمارەیان گەیشتە چوار هەزار کەس لە (عكا) فەرمانی کرد بە کوشتنیان.[5]

## ب—لەبەڵگە عەقڵی یەکان:

١— کوشتنی دیل لەبەر ئەوەی دەستدرێژکار بووە دروست نیە، لەبەر ئەوەی بەدیل بوونی دەستدرێژی کردنەکەی کۆتایی پێ هاتووە، بەرگری کردنی شەرعیش بە کۆتایی هاتنی دەستدرێژی کردنەکە کۆتایی پێ دێت.

---

[1] بڕوانە صحيح البخاري بەشەرحی/ فتح الباري ١٨٠/٨.

[2] أخرجه بلفظ قريب البيهقي في سننه ١٨١/٨ وأبن شيبة في مصنفه ٥٤٣/٧ ژمارە /٣٧٨١٦ وعبدالرزاق في مصنفه ١٢٣/١٠.

[3] بڕوانە احكام القرأن للجصاص ٢٩١/٣.

[4] بڕوانە الام ی پێشەوا شافیعی ٢٩١/٤.

[5] بڕوانە اسرى الحرب في التشريع الإسلامي والقانون الدولي قاضي فاضل دولان لاپەڕە /٥٨.

٢- كوشتنی دیل به‌مه‌به‌ستی تۆڵه‌كردنه‌وه له وڵاته‌كه‌ی پێچه‌وانه‌ی فه‌رمووده‌ی خوای په‌روه‌ردگاره كه فه‌رموویه‌تی (ولا تزر وزارة وزر أخرى).

٣- سه‌رپشك كردنی دیل له‌نێوانی كوشتن یاخود موسڵمان بوون دا پێچه‌وانه‌ی قورئانی پیرۆزه كه خوای په‌روه‌ردگار تیایدا فه‌رموویه‌تی: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ).

٤- كوشتنی بۆ به‌راوردكردنی هاوشێوه‌ی، پێویسته په‌یڕه‌وی دینی خوا بكرێت بۆ پله‌ی ئازاده‌میزاد بۆ پله‌و پایه‌یه‌ك كه خوا بۆی داناوه، ناچاركردن‌و ناچاركراو پوچه‌ڵن.

ڕووی په‌یوه‌ندی به‌راوردكردن به‌هاوشێوه له‌نێوانی زۆرتره‌كان‌و زۆربه‌رزه‌كاندا ده‌بێت نه‌ك له‌نێوانی نزمه‌كان‌و به‌رزه‌كاندا.

## مافه‌كانی نه‌خۆش و كوژراوانی جه‌نگ

حوكمه‌كانی دیل كه له شه‌ریعه‌تی ئیسلامی دا باس كران به‌سه‌ر نه‌خۆش‌و بریندارەكانی جه‌نگیشدا واجیبه‌جێ ده‌بن، به‌زیادكردنی خزمه‌تگوزاریی ته‌ندروستی بۆیان‌و پێدانی چاره‌سه‌رو ته‌داوی كردنیان، حاڵیان وه‌ك حاڵی نه‌خۆش برینداره‌كانیانه.

به‌ڵام كوژراوانی جه‌نگی دوژمن، ئه‌گه‌ر له‌زه‌وی ئیسلامدابن ئه‌وه له‌به‌ر دوو هۆ پێویسته به‌خاك بسپێرێن:

یه‌كه‌میان: بۆ ڕێزگرتن له كه‌رامه‌تیان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ)[1] ئه‌و ڕێزگرتنه ئه‌وانیش ده‌گرێته‌وه هه‌روه‌كو چۆن موسڵمانان ده‌گرێته‌وه، وه پێویسته ڕێز له‌دابونه‌یتیان بگیرێت ئه‌گه‌ر توانرا.

دوهه‌میان: ئاگاداربوون له‌بواری ته‌ندروستی، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر نه‌نێژرێن، ئه‌وا ده‌بێـه هۆی بڵاوبوونه‌وه‌ی ده‌ردو نه‌خۆشیی له گۆره‌پانی جه‌نگه‌كه‌دا.

---

[1] سووره‌تی ئیسلاء /٧٠.

# جێباسی دوەم:
# بەرگری شەرعی لەیاسای نێودەوڵەتی دا

یاسای نێودەوڵەتی پێشکەوتنی زۆری تێپەڕاندوە، چونکە لە سەرەتایەوە بریتی بوو لە ئامانجو بەرژەوەندییە تایبەتەکانی دەوڵەتە گوێڕایەڵەکان بۆ ئەو یاسایە، پاشان لەدوای قۆناغێك لە پێشکەوتنبوو بەرژەوەندیەکانو مەبەستە گشتییەکان بە لایەنێکی تەنها بەوتە، بەڵام لەبواری جێبەجێ کردن دا هەر بە بەرژەوەندی تایبەت مایەوە، لەبەر دیارنەبوونی پێوانەی نێودەوڵەتی، پابەند نەبوونو دیارنەبوونی دەسەڵاتێك کە لێپرسینەوەبکات لەلایەنی بەرپرس، لەسەرپێچی کردنی ئەو یاسایەو لەپاش ئەوەی ئەو یاسایە بە قۆناغێکی تردا تێپەڕی کرد لەپێش کەوتن، ئەوسا بووە یاسایەکی نێودەوڵەتی مەبەستی ئەوە بوو کە خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتە گوێڕایەڵەکان بکات، لەبواری وتەو جێبەجێ کردن دا، بەڵام هەندێ لەبەربەستی بۆمایەوە کە لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر، بەبێ جێبەجێ کردنی سەبارەت بە هەموو دەوڵەتو گەلەکان مایەوە، لەبەر زاڵ بوونی هەندێ لە دەوڵەتە گەورەکان بەسەر ئەو یاسایەدا، خۆتێ هەڵقورتاندنی لەکاتی جێبەجێ کردن دا بەوەی کە دادپەرو یەکسانیو لەنێوانی هەموو گەلو نەتەوەکان دا بێنەدی، دەوڵەتەکان هەتا سەدەی هەڤدەهەم ئاشنا نەبوون بەیاسایەکی نێودەوڵەتی کە پەیوەندییە نێودەوڵەتی یەکان رێك بخاتو مافەکانو پابەندبوونە نێودەوڵەتی یەکان لە هەردوو بارودۆخی ئاشتیو جەنگ دا، پاشان فیکرەی یاسای نێودەوڵەتی دەرکەوتو بەم قۆناغەدا تێ پەڕی کرد:

## أ- پەیماننامەی وستفالیا (١٦٤٨) زاینی لەنێوان وڵاتە ئەوروپییەکان دا.

دادەنرێت بەخاڵی سەرەتا بۆ یاسای نێودەوڵەتی باو[1]، جەنگ دانرا بە دیاردەیەك بۆ دەسەڵاتی رەها بۆ ئەو دەوڵەتانەی كە ئیمزایان لەسەركرد، بۆ نمونە: تۆماز هۆبز، ئەو پیاوە كە لە بیرمەندانی ئەو سەدەیە بوو بانگەوازی جەنگی گشتگیری كرد واتە: جەنگی هەموو خەڵكی لەسەر هەموو خەڵكی و زاڵ بوون بەسەر فكرەی رەوا و نارەوادا، وە فیكرەی دادپەروەری و ستەم داو، دانانی هێزو ساختەكاری بەدوو پشتگیری باش لە بارودۆخی جەنگ دا[2].

## ب- رێكەوتنی كۆمەڵەی گەلان:

لە ئەنجامی ئەوەدا كە پەیمان نامەی وستفالیا بڕیاری لەسەرداوە لە ئازادی رەها بۆ وڵاتان، لەچوونە ناو جەنگەوە، ئەگەر ئەو جەنگە بەرژەوەندیەكانی وڵاتەكەی هێنایەدی، جەنگی جیهانی یەكەم لەماوەی چوار ساڵدا (١٩١٤–١٩١٨)ی زایینی جیهانی بە ئاگری خۆی سوتاندو بەڵاو كارەساتەكانی ئەو جەنگە پاڵی نابە

---

[1] ئەو هۆكارانەی كاریگەرییان هەبوو لە یاسای نێودەوڵەتی لە پەیمان نامەی وستفالیای ساڵی ١٦٤٨ی زایینی كە دەستی گرت بەسەر ئەو كۆمەڵە سیاسیەی كە لەماوەی سەدەكانی ناوەراست دا گەورەی ئەوروپا بوون و كۆمەڵێكی تر شوێنی ئەو كۆمەڵەیان گرتەوە كە رێگەیان خۆش كرد بۆ دامەزراندنی یاسای تازەی نێودەوڵەتی:

أ– رأپەرینی ئەوروپاو دەركەوتنی وڵاتە سەربەخۆكان.

ب–لەدایك بوونی هەستی نەتەوایەتی.

ت–پەیمان نامەی وستفالیا.

پ–بنەمای بەرژەوەندی دەوڵەت.

ج–دۆزینەوەی ئەمەریكا ١٤٩٢.

ح–چاكسازی دینی.

خ–بنەمای دەسەڵاتی رەها.

د– بنەمای هاوسەنگی ئەوروپی.

[2] بۆ زیاتر درێژە پێدان بڕوانە اسری الحرب ی دكتۆر عبدالواحد یوسف لاپەرە /٣٩و دوای ئەو.

دەوڵەتەکان‌و گەلەکانەوە بۆ بیرکردنەوە بۆ پێویستبوونی پێك هێنانی دەسەڵاتی نێودەوڵەتی باڵا، کە چارەسەری کێشەکان بەرێگا ئاشتی یەکان بگرێتە دەستو سنوورێك دابنێ بۆ جەنگە ناڕەواکان، جا کۆمەڵەی گەلان لەساڵی (١٩٢٠)ی زایینی دا دامەزرا، بەڵام لەبەردوو هۆ نەیتوانی مەبەستەکانی بێنێتەدی:

یەکەمیان: ئەو ڕێکەوتنە جەنگی حەرام نەکرد مەگەر لەیەك باروبۆخدا ئەویش بریتی یە لە جیاکردنەوەی کێشە بەبڕیاری دادکاری یاخود ڕاپۆرتی پابەندکار لە ئەنجومەنی کۆمەڵەکەوە لەگەڵ ڕەزامەندی یەکێك لەلاکانی کێشەکەو لەگەڵ ئەوەشدا لاکەی تر بچێتەناو جەنگەکەوە.[1]

دووەم: ئەو دەوڵەتە گەورانەی کە کۆمەڵەی گەلانیان دامەزراند ئامانج سیاسەتەکانیان ناکۆکی‌و جیاوازی لەنێوانیاندا ڕەنگی دایەوە لەسەر نەبوونی پەیماننامەیەکی یەکگرتوو کە لەسەری ڕێك بکەون، بەڵکو پەیماننامەکە تێکەڵەیەکبوو لەو کەرەستە لاستیکی یەی کە زیاتر لەیەك لێکدانەوەی بۆ دەکرا.[2]

وە بەو پێیە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان وەکو ئەو ڕاسپاردە وەهابوو کە پابەند بوونیان نیە.

## ج- پەیمانی بریان کیلۆج

میسو بریان وەزیری دەرەوەی فەرەنسا گرێ بەستێکی ڕێك کەوتنی خستە بەرچاو هاوڕێکەی کە مستر کیلۆج وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ نەهێشتنی جەنگی نێوانیان‌و پەنابردنە بەر هۆکارەکانی ئاشتی لەباروبۆخی کێشەکاندا، وڵاتە یەکگرتوەکانیش ئەو بیروبۆچونەی وەرگرتو پێی ڕازی بوو، بەڵام پێشنیاری ئەوەی کرد کە دەرگاکە بکرێتەوە بۆ وڵاتانی تر بۆئەوەی بێنە ناوەوە، پەیمانەکەشی لەساڵی (١٩٢٩)ی زایینی دا وای لێ هات پەیڕەوی لێ کرا، (٦٣) وڵات لەپێش جەنگی

[1] بڕوانە ماددەکانی (١٢، ١٣، ١٤) لە ڕێکەوتنی کۆمەڵەی گەلان.

[2] بڕوانە عصبة الأمم المتحدة للاستاذ احمد توفيق ٦٤٣/١.

جیهانی دووەمدا چوونە ناویەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پەیمانەش شكستی هێنا كە لەجێبەجێ كردنی مەبەستەكەیدا، لەبەر چەند هۆیەك كە لێرەدا ماوەی باسكردنیان نیە.

## د- پەیمانی نەتەوە یەكگرتووەكان:

له ئەنجامی شكست هێنانی یاسای نێودەوڵەتی له هەموو ئەو قوناغەدا كە باس كران لەدانانی سنوورێك بۆ جەنگە نارەواكان‌و دڵنیاكردنی سەلامەتی‌و ئارامی وڵاتان. جەنگی جیهانی دووهەم له ساڵی (١٩٣٩- ١٩٤٥)ی زایینی رویداو ئەم پەیمانە شوێنی پەیمانی كۆمەڵەی گەلانی گرتەوەو رێكخراوێكی تازە شوێنی كۆمەڵەی گەلانی گرتەوە، له كۆبوونەوەیەكدا له مۆسكۆ لەرۆژی ٢٠ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٤٣، لەنێوانی سەرۆكی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكاو سەرۆكی یەكێتی سۆڤیەتی پێشو.

پاشان لەكۆبوونەوەی واشنتۆن دا لەنێوانی نوێنەری وڵاتە گەورەكاندا لەرۆژی ٢١ی ئابی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٤٤دا.

پاشان له كۆنگرەی سان فرانسیسكۆ دا لەساڵی ١٩٤٥ی زایینی‌و لەرۆژی ٢٦ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥دا، دەوڵەتەكان رەزامەندییان دەربڕی لەسەر پەیمانی دامەزراوەی نەتەوە یەكگرتووەكان، لەدوای ئەنجامدانی ڕاست كردنەوەكان لەسەری‌و لەرۆژی ٢٤ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٤٥ی زایینی پەیرەوی لێ كرا.[1]

تا ئێستا (١٩٣) دەوڵەت چونەتە ناو ئەو پەیمانەوە، له سەرەتای پەیمانەكەوە روونكردنەوەیەكی كورت هاتووە كە ئەمە دەقەكەیەتی:

(ئێمە گەلەكانی نەتەوە یەكگرتووەكانین، لەسەر خۆمان داناوە كە نەوەكانی داهاتوو له بەڵاو كارەساتەكانی جەنگ ڕزگار بكەین، كە لەمیانەی یەك نەوەدا دووجار

---

[1] بروانه القانون الدولي العالمي للاستاذ دكتور حسن الجبلي الدفاع الشرعي في ميثاق الأمم المتحدة لەوانەبێژیەكانی (ماستەر) لەیاسای چاپ كراو لەسەر رۆنیۆ، لاپەرە /١٤و دوای ئەو.

خەم پەژارەی هێنا بەسەر مرۆڤایەتی دا کە ناتوانرێ باسی بکرێت، سەر لەنوێ دڵنیا دەکەینەوە کە باوەڕمان هەیە بەمافەکان، لەناویاندا مافەکانی پیاوان و ئافرەتان، نەتەوە گەورەکان و نەتەوە بچوکەکان لەمافەکان دا یەکسانن، وە ئەو بارودۆخانە ڕێکبخەینکە دەتوانرێت لە سێبەریان دا دادپەروەری و ڕێزگرتنی پابەند بوونەکان بێتەدی کە لە پەیمانەکان و بێجگە لەوانیشدا لە سەرچاوەکانی یاسا نێودەوڵەتی یەکان... هەتا دوایی).

ئەو پەیمانە بەشی یەکەمی تایبەت کردووە بە: ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی دامەزراوەکەو بنەماکانی، لە ماددەی یەکەم دا هاتووە لەسەر ئەوەی کە مەبەستەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەم شێوەیەیە:

١- پاراستنی ئاشتی و هێمنی وڵاتان، بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش ڕێکخراوەکە سازانێکی هاوبەشی کاریگەری وەرگرت بۆ قەدەغەکردنی ئەو هۆکارانەی کە هەڕەشە ئاشتی دەکات کار دوژمن کاریەکان و وێنەکانی ڕادەماڵێت بە ئاشتی، بەپێی بنەماکانی دادپەروەری و یاسای نێودەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشە نێودەوڵەتی یەکان کە دەبنە هۆی نەهێشتنی ئاشتی.

٢- پەیوەندی دۆستایەتی لەنێوانی گەلەکاندا لەسەر بنەمای ڕێزگرتن لەو بیروڕایەی فەرمان دەکات بەیەکسانی کردنی مافەکان لەنێوانی گەلاندا، بەوەی هەر گەلێك لەو گەلانە بڕیار لەسەر چارەنوسی خۆی دەدات هەروەها گرتنەبەری ڕێگەچارەی تری گونجاو بۆ بەهێزکردنی ئاشتی گشتی.

٣- هێنانەدی یارمەتی نێودەوڵەتی لەسەر چارەسەرکردنی کێشە نێودەوڵەتیەکان وەك ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و مرۆڤایەتی، لەسەر بەهێزکردنی ڕێزگرتن لە مافەکانی ئادەمیزادو ئازادیە بنەڕەتیەکان بۆ هەمووو خەڵکی و هاندان لەسەری بەرەهایی، بەبێ جیاوازی کردن بەهۆی ڕەگەز یاخود دین و بەبێ جیاوازی لەنێوانی پیاوان و ئافرەتان دا.

٤- ئەو ڕێكخراوە بكرێتە سەرچاوە بۆڕێك خستنی كارەكانی نەتەوەكان‌و ئاڕاستەكردنیان بەرەو زانینی ئەو ئامانجە هاویەشانە.

بێجگە لەوانەی كە باسمان كرد، پەیمانەكە ڕەوایەتی جەنگی تەنها لەبواری بەرگری شەرعی دا هێشتۆتەوە، دەقی ماددەی ٥١/ لەسەر ئەوەی (لەو پەیمانەدا لاوازكردن یاخود ڕێگەگرتن نیە لە مافی سروشتی دەوڵەتەكان بەتەنهاو كۆمەڵ لەبەرگری كردن لەخۆیان،ئەگەر هێزێكی چەكدار دەستدرێژی كردە سەر ئەندامێكی نەتەوە یەككگرتووەكان، ئەوەش بۆ ئەوەی ئەنجومەنی ئاسایش سازانی پێویست وەربگرێت بۆ پاراستنی ئاشتی‌و ئارامی‌و وڵاتەكان‌و ئەو ڕێوشوێنانەی ئەندامەكان وەری دەگرن بۆ بەكارهێنانی مافی بەرگری كردن لەخۆیان، دەگاتە ئەنجومەنی ئاسایش بەخێرایی، ئەو ڕێوشوێنانە كاریگەری نابێت لەسەر ئەنجومەن بەهەر شێوەیەك بەپێی پێویستی ئەو دەسەڵات‌و بەرپرسیارێتی یەی لە بڕیارەكانی ئەو پەیمانەوە بۆی هاتووە، لەمافێتی لەوەدا كە لەهەركاتێكدا ببینێ پێویستە لەو كارانە وەربگریێ بۆ پاراستنی ئاشتی‌و هێمنی دەوڵەتەكان.

نكوڵی لەوە ناكرێ كە پەیمانی نەتەوە یەككگرتووەكان هەنگاوی گرنگی پێشكەوتوو دەنێ لەڕێكخستنی ژیانی خێزانی نێودەوڵەتی دا بەڵام بوونی مافی (فیتو) واتە مافی ڕەخنەگرتن لە بڕیارە مەوزوعی یەكانی وڵاتە گەورەكان، لە ئەندامە هەمیشەییەكانەوە وای كردووە، سوودی كەم بێت لە پارێزگاری كردن لەسەر مافەكانی گەلان‌و دانانی سنوورێك بۆ زیادەڕەوی یە ناڕەواكان‌و بەستنەوەی جەنگە ناڕەواكان‌و دڵنیایی كردنی ئاشتی‌و هێمنی وڵاتان كەمبێتەوە.

## ٥- جاڕی جیهانی بۆ مافەكانی مرۆڤ:

وای لێ هات ڕاگەیاندنی مافەكانی مرۆڤ لەساڵی ١٩٤٨ی زایینی یەوە پەیڕەوكراوە، ئەو ڕاگەیاندنەش بریتی بوو لە بڕیاردانی مافەكانی مرۆڤو پارێزگاری لێ كردنی كەلە ماددەی یەكەم دا دەقی لەسەر هاتووە، دەڵێ: (هەموو كەسەكان بە ئازادی لەدایك

دەبن و لەڕێزو ماف دا یەکسانن، ئەوان عەقڵ و ویژدانیان پێ بەخشراوەو لەسەریان پێویستە کە بەگیانی برایەتی یەوە مامەڵە لەگەڵ یەکتری دا بکەن.

**دەرئەنجام:**

لەوەی کە باسمان کردو پەیوەندی هەبوو بە مەبەستەکانی یاسای نێودەوڵەتی یەوە، ئەم دەرئەنجامانەمان دەست کەوت:

١- دابینکردنی ئاشتی و هێمنی وڵاتان.

٢- جیاوازی کردن لەنێوانی جەنگە ڕەواکان و ناڕەواکاندا.

٣- قەتیسکردنی جەنگە ڕەواکان لەبواری بەرگری شەرعی داو بەستنەوەی ئەو بەرگری کردنە بەپابەندبوون و مەرجە سنووردارەکان.

٤- ڕەچاوکردنی دادپەروەری و یەکسانی لەمامەڵەکردن لەگەڵ لایەنی تردا لەهەردوو بارودۆخی جەنگ و ئاشتیدا.

٥- پارێزگاری کردن لەڕێزو مافی ئادەمیزادو لەپێشیەوە یەکسانی لەنێوانی گەلەکانداو بڵاوکردنەوەی گیانی برایەتی و جیاوازی نەکردن لەسەر بنەمای ڕەگەز یاخود بنەچە یاخود ڕەنگ یاخود دین هاوشێوەی ئەمانە.

## مافەکانی دیل و برین دارو نەخۆش و کوژراوی جەنگ لەیاسای نێودەوڵەتی دا:

یاسای نێودەوڵەتی تازە لەدوای پێش کەوتنی چارەسەری ئەم بابەتەی کردووە بە مامەڵەیەکی مرۆڤانەی نزیك لە مامەڵەی شەریعەتی ئیسلامی یەوە لەڕووی ڕەفتاری مرۆڤایەتی یەوە، بۆ نمونە باسێکی کورت دەکەم لەوەی کە لەڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ و ڕێکەوتننامەی جنێف دا هاتووە لەبەر کەم دەرفەتی شوێنەکە:

لە ڕاگەیاندنی جیهانی بۆ مافەکانی مرۆڤ هاتوە، کە لەڕۆژی ١٩٤٨/١٢/١٠دا دەرچووە، لە ماددەی دوهەم دا (بۆ هەموو ئەو ئادەمیزادێك هەیە کەڵك وەربگرێ لەهەموو مافەکان و ئەو ئازادیانەی کە لەو ڕاگەیاندنەدا باسکراون بەبێ ئەوەی

جیاوازی لەهەر جۆرێك، بەتایبەتی جیاوازی نەکردن بەهۆی توخم یاخود ڕەنگ ڕەگەز[1]و زمان‌و ئاین یان بۆچونی سیاسی‌و ناسیاسی یان بنەڕەتی نیشتمان‌و کۆمەڵایەتی‌و...) بارێکی هەروەها لەماددەی /٣دا هاتووە: (هەموو کەسێك مافی ژیان‌و ئازادی‌و ئەمینی لەسەر خۆی بۆ هەیە).

وە لە ماددەی (٤)دا هاتووە: (نابێ کەس بکرێتە کۆیلە یاخود بەندەو کۆیلەو بازرگانی کردن بەکۆیلەوە بەهەموو شێوەیەك قەدەغەیە).

سەبارەت بەڕێکەوتنەکانی جنێف کە لەنێوانی ٢١/٤/١٩٤٨– ١٢/١/١٩٤٩ی زایینی دا بوو، کۆنگرەی دیبلۆماسی بەسترا بۆ دانانی ڕێکەوتنە نێودەوڵەتیەکانی بۆ پارێزگاری کردن لە قوربانیانی جەنگ وە بەڕەسمی (٦٣) وڵات نوێنەرلیەتیان کردو کۆنگرەکە گەیشتە ئەوەی پشت ببەستێ بەم ڕێکەوتنانەی کە دێت:

ڕێکەوتنی یەکەم: ڕێکەوتنی جنێف بۆ چاککردنی بارودۆخی بریندارو نەخۆشەکانی هێزە چەکدارەکان لە گۆڕەپاندا ١٢/أب/١٩٤٩.

ڕێکەوتنی دوهەم: بە چاککردنی بارودۆخی بریندارو نەخۆشەکان‌و خنکاوەکانی هێزە چەکدارەکان لە دەریاکاندا لەبەرواری ١٢/أب/١٩٤٩دا کرا.

ڕێکەوتنی سێهەم: لەبارەی مامەڵەی دیلەکانی جەنگەوە لەبەرواری ١٢/أب/١٩٤٩.

ڕێکەوتنی چوارهەم: پارێزگاری کردن لەکەسە مەدەنییەکان لەکاتی جەنگەکەدا لەبەرواری ١٢/أب/١٩٤٩.

یەکەمیان لە ماددەکانی (١–٦٤) زۆر بڕیاری لەخۆی گرتووە کە پەیوەندییان هەیە بەکاروباری بریندارەکان‌و نەخۆشەکانەوە، لەوانە ڕێزلێگرتن لەتاکەکانی هێزە چەکدارەکان‌و ناشتنی مردووەکان بەڕێزەوەو بەپێی دروشمی ئاینەکەیان ئەگەر توانرا لەسەر قەبرانەکانیان دا ڕێزیان لێ بگیرێت، وە نابێ لەوشکانی یەوە هێرش بکرێتە سەر کەشتی خەستەخانەکان، دروست نی یە هێرش بکرێتە سەر فڕۆکە

[1] الجنس= چاکتر وەهایە (الصنف) بەکاربهێنرێت لەجیاتی الجنس، لەبەر ئەوەی مەبەست لە (نێرو مێیە) ئەو دوانەش پۆلن نەکو ڕەگەز.

پزیشکی یەکانیان کە بۆ لابردنی برین دارەمانو نەخۆشەکان بەکاردەهێنرێن، وە دروست نیە دیلی جەنگ جەستەیان بشێوێنرێتو تاقی کردنەوەی پزیشکی یاخود زانستی یان لەسەر بکرێت، سوکایەتیکردن بە دیلی جەنگ قەدەغەکراوە، دیلەکانی جەنگ مافی ئەوەیان هەیە کە رێز لەکەسێتی یانو ئابڕوویان بگیرێت لەهەموو بارودۆخەکاندا، وە پێویستە لەگەڵ ژنە دیلەکاندا بە هەموو رێزێکەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت کە لەگەڵ رەگەزەکانیان دا شیاو بێت[1] پارێزگاریش دەکرێ لەدیلی جەنگ بەتەواوی شیاوی ئەو لایەنی مەدەنییەی کە لەپێش بەدیل گرتنی دا هەیبووە، وە نابێت بۆ ئەنجام دانی مافەکانی کە ئەو شیاویە پێویستی بووە لێ ی ببەسترێت، مەگەر ئەوەندەی دیلێتی پێویستێتی.

ئەو دەوڵەتەی دیلەکانی جەنگی تێدایە سەرپەرشتی کردنیان زامن دەکات بەبێ بەرامبەر وەکو پێشکەش کردنی سەرپەرشتی کردنی پزیشکی بەخۆڕایی، وە لەسەر ئەو دەوڵەتە پێویستە کە بەیەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات بەبێ جیاوازیو هەروەها بەخۆڕایی زامنی شتەکانیان بێت لەگەڵ ئەو مافانەی تریشیان دا کە لێرەدا ماوەی باسکردنیان نیە.

---

[1] بڕوانە اتفاقیات جنیف المؤرخة في ١٢/أب-أغسطس ١٩٤٩.

به‌شی دووهه‌م له‌ هۆکاره‌کانی ڕێپێدان به‌کارهێنانی که‌سی یه‌، ئه‌و مافه‌ی که‌ شه‌رع‌و یاسا پێی داوه‌، جا ئه‌و کاره‌ ناڕه‌وایانه‌ی که‌ ئاده‌میزاد ئه‌نجامیان ده‌دا له‌سه‌ر بناغه‌ی به‌کارهێنانی مافه‌که‌ ده‌گۆڕێت بۆ ڕه‌واو ڕێپێدراو، ئه‌گه‌ر پایه‌کان‌و مه‌رجه‌کانی ئه‌و به‌کارهێنانه‌ی تیادا بێت، به‌ربه‌سته‌کانیشی تیا نه‌بێ، خاوه‌نی مافه‌که‌ش له‌به‌کارهێنانی مافه‌که‌ی دا پابه‌ند ده‌کرێت به‌و پێوه‌ندانه‌ی به‌سه‌ر ویستی یه‌وه‌ دانراوه‌ به‌پێ‌ی شه‌رع‌و یاسا.

ئه‌و به‌شه‌ش توێژینه‌وه‌ی سێ خاڵی سه‌ره‌کی له‌خۆگرتووه‌ ئه‌وه‌یش مافی ئه‌ده‌ب دادانی مێرده‌ بۆ ژنه‌که‌ی، ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی لێ ڕووی دا بووه‌ هۆی که‌م‌و کوڕی له‌ پابه‌ندییه‌کانی وه‌کو هاوسه‌ر، یاخود ئه‌نجامدانی تاوانێك که‌ له‌گه‌ڵ ئاداب‌و ڕوشت دا پێچه‌وانه‌بوو.

وه‌ ئه‌ده‌ب دادانی سه‌رپه‌رشتیار بۆ ئه‌و منداڵه‌ پێنه‌گه‌یشتووه‌ی وا له‌ژێر سه‌رپه‌رشتی کردنی دایه‌، ئه‌ده‌ب دادانی فێرکار بۆ فێرخواز که‌ نه‌گه‌یشتۆته‌ ته‌مه‌نی پێگه‌یشتن له‌م به‌شه‌دا جێگه‌ی ده‌بێته‌وه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی فێرکار هه‌روه‌کو لێپرسراوه‌ له‌فێرکردن، هه‌روه‌ها لێپرسراویشه‌ له‌ په‌روه‌رده‌و کاره‌ وه‌رزشیه‌کان.

بۆ توێژینه‌وه‌ له‌هه‌ر خاڵێك له‌و خاڵانه‌ جێ لێکۆڵینه‌وه‌یه‌کی سه‌ربه‌خۆ تایبه‌ت کراوه‌.

# جێباسی یەکەم:
# ئەدەبدادانی خێزان

توێژینەوەی ئەو بابەتە دابەش دەبێ بۆ دوو جێ مەبەست، یەکەمیان تایبەت دەکرێ بە ئەدەب دادانی مێرد بۆ ژنەکەی، دوهەمیش پەروەردەکردن و ئەدەب دادانی منالانی پێنەگەیشتوو.

## جێ مەبەستی یەکەم:
## ئەدەب دادانی مێرد بۆ ژنەکەی

ئەو ئەدەب دادانە بناغەکەی بریتی یە لە بەرپرسیارێتی مێرد بەپێی ئەو توانا جەستەیی و دارایی یەی کە هەیەتی بۆ پاراستنی ژنەکەی لەدەستدرێژی کردن بۆ سەر ژیانی یان سەلامەتی یان ئابرووی، هەروەها خەرجیکردن و هاوشێوەکانی تر، لەژێر ئەو گشتگیریەدا بەرپرسە لە رەفتارو هەڵس و کەوتی بەرامبەر مێردەکەی و منداڵەکانی و ئەوانی تریش.

سەرچاوەی ئەو بەرپرسیارێتیەش بریتی یە لە فەرموودەی خوای پەروەردگار کە فەرموویەتی: (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ)[1].

---

[1] سوورەتی نیساء/٣٤ تەواوکردنی ئایەتەکە (فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا).

(قوامه) كه‌مو كورتی نی یه له‌شیاوێتی ژنه‌كه‌دا، هه‌روه‌ها مه‌به‌ست ئه‌و مانا زانراوه‌ی (القیمومة) نیه له‌سه‌ر منداڵی (قاصر) پێنه‌گه‌یشتو و ناشیاو، به‌ڵكو مه‌به‌ست پێی به‌رپرسیارێتی یه له‌سه‌ر پارێزگاری كردنو خه‌رجی سه‌باره‌ت به ژن.

هه‌روه‌ها وشه‌ی (التفضیل) مه‌به‌ست له‌وه نیه كه پیاو پله‌و پایه‌و شوێنی له ژن چاكتربێت، به‌ڵكو مه‌به‌ست پێی توانای جه‌سته‌یی‌و توانای بونیادیه‌تی كه به‌هۆیانه‌وه پیاوان جیا ده‌كرێته‌وه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له سیفاته ده‌ركه‌وتووه‌كان له پیاوان دا بریتی یه له‌هێزی به‌رگری كردن، به‌ڵام له ژن دا گرنگترینی سیفاته ده‌ركه‌وتووه‌كان بریتی یه له نه‌رمو نیانیو سۆز، له‌به‌ر ئه‌وه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌زڵو چاكه‌ی دایكی داوه به‌سه‌ر باوك دا به‌سێ هێنده، له‌كاتێكدا كه یه‌كێك له هاوه‌ڵانی پرسیاری لێ كردو وتی: (چاكه له‌گه‌ڵ كێ دا بكرێت پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: دایكت، پاشان وتی پاش ئه‌و كێ؟ فه‌رمووی: دایكت، وتی پاشان كێ؟ فه‌رمووی دایكت، وتی: پاشان كێ؟ فه‌رمووی: باوكت)[1].

به‌و پێ یه مێرد پێویسته له پێشه‌كی دا ئه‌م خاڵانه بزانێو كار به‌ناوه‌ڕۆكیان بكات:

١- ئافره‌ت كه‌لو په‌لێك نیه بفرۆشرێتو بكڕێتو نرخه‌كه‌شی ماره‌ییه‌كه‌ی بێت به‌ڵكو له‌وه به‌به‌هاترو به‌رێزتره كه به‌های به‌نرخ دیاری بكرێت، ئافره‌ت نیوه‌ی كۆمه‌ڵگه‌یه ئه‌گه‌ر هه‌مووشی نه‌بێت، ئافره‌ت دایكه، خوشكه، كچه، هاوسه‌ره.

٢- ژن له ژێر ڕه‌حمه‌تی مێرده‌كه‌یدا نی یه، ئه‌گه‌ر ویستی هۆگری بێتو ئه‌گه‌ر ویستیشی گاڵته‌ی پێ بكاتو سوكایه‌تی پێ بكات، یاخود ته‌ڵاقی بدات، ته‌ڵاقیش ناخۆشترینی حه‌ڵاڵه كه بۆ ناچاری یه‌كان دانراوه‌و به پێوانه‌ی خۆی ده‌پێورێت.

---

[1] حديث حسن صحيح، أخرجه أبوداود، والنسائي، وابن ماجه وسكت عنه أبوداود ونقل المنذري تصحيح الترمذي، وأقره.

٣- هاوسەرگیری گرێبەستێك نی یە کە ژن تیایدا شوێنی ئەو گرێبەستە بیّ، بەڵکو هاوسەرگیری بریتی یە لە پەیمانێکی توندو تۆڵ، هەروەکو دەقی قورئانی پیرۆزی لەبارەوە هاتووە کە دەفەرموێت: (وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا)[1] بەپێی ناوەڕۆکی ئەو پەیمانە هاوبەشییەکی گیانی پێك دێت لەنێوانی هەردوو هاوسەردا کە سەرمایەکەی بریتی یە لە ئاڵوگۆڕکردنی خۆشەویستیو ڕێز لەنێوانیاندا وەکو یەك، قازانجەکەشی بریتی یە لە نەوەیەکی نوێی چاك بۆ بەردەوامیو مانەوەی جۆری نەژادی ئادەمیزاد، بەو شێوەی کە گونجاو بێت لەگەڵ پلەو پایەی ئادەمیزاد لە گەردوونەداو، ڕێزگرتنی خوای پەروەردگار بۆی.

٤- تەڵاق ناخۆشترینی حەڵاڵە بەلای خوای پەروەردگارەوە لەگەڵ ئەوەشدا ڕەوایی پێداوە وەکو یەکێك لەکۆتا هۆکارەکانی تەمێکاریی لەباروذۆخی جیاوازی خێزانی دا، کۆتا چارەسەریش بۆ کێشەکانی خێزان.

٥- ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەوە ڕازی نابێت کە خانوویەك بروخێ بەسەر هەردوو هاوسەرەکەو منداڵەکانیان دا، کە تەواوکردنەکەی چەند ساڵێکی پێچووە بە تێچوونێکی زۆر.

لەپاش ئەم پێشەکی یە لەسەر مێرد پێویستە کە لەبەکارهێنانی مافی ئەدەب دادانێکی چاکدا نێتو مەبەستێکی باشی هەبێتو ئامانجیشی ئەوە بێت کە چاکسازی بکاتو پارێزگاری لە هاوسەرێتی بکات بەبێ تۆڵە سەندنەوەو لەو ئەدەب دادانە چاکەکەدا پابەند بێت بە زنجیرەیەکی سروشتی مرۆڤایەتی یەوە کە لە قورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە هاتووە:[2]

[1] سوورەتی نیساء/٢١.

[2] هەروەکو لەپێشتردا باسی لە سوورەتی نیساء/٣٤دا هات، هەروەها فەرموودەی خوای پەروەردگار لە سوورەتی تەحریم ئایەتی /٦دا دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ).

## یه‌كه‌م: ئامۆژگاری

قورئانی پیرۆز فه‌رمانی كردووه‌ به‌مێرد له‌كاتی یاخی بوونی ژنه‌كه‌و بوونی كه‌م و كوڕی له‌ پابه‌ند بوونه‌كانی هاوسه‌رێتی دا، پیاوه‌كه‌ ده‌ست پێشخه‌ری بكات بۆ چاره‌ی ڕێنومایی‌و ئامۆژگاری كردن‌و ئاراسته‌ كردن له‌سه‌ر هه‌ڵه‌كان له‌جیاتی په‌نابردن بۆ كارێكی تر، خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت: (وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ)[1]، ئه‌و ڕێگایه‌ بریتی یه‌ له‌یه‌كه‌م ئه‌ركی سه‌رشانی مێرد بۆ چاككردنی هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی كه‌ توشی خێزانه‌كه‌ی ده‌بن له‌ خراپه‌كاری‌و له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كاری چاكسازی كردن بۆ خانه‌واده‌كه‌ پێویسته‌و داواكراوه‌، به‌پێی فه‌رمووده‌ی خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ)[2].

ئامۆژگاری كردن به‌تایبه‌تی لێره‌دا بۆ مه‌به‌ستێكی دیاری كراوه‌، ئه‌وه‌ش چاره‌سه‌ركردنی سه‌ره‌تای یاخی بوونی ژنه‌و ئه‌نجام نه‌دانی ئه‌ركه‌كانی هاوسه‌رێتی یه‌ له‌پێش ئه‌وه‌دا كاره‌كه‌ گه‌وره‌ بێت، و ئه‌نجامی نادروستی لێ په‌یدابێت، به‌ڵام ژنه‌كه‌ له‌وانه‌یه‌ به‌هۆی جوانیه‌كه‌یه‌وه‌، یاخود سامان‌و كه‌س‌و كاریه‌وه‌ یاخود ئاستی ڕۆشنبیری یه‌وه‌ یاخود هاوشێوه‌یان یاخی ده‌بێت، هه‌روه‌كو خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت: (كَلَّا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَيَطْغَى أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى)[3]، له‌وانه‌یه‌ ئه‌و ژنه‌ ئامۆژگاری چاك كاری لێ نه‌كات، له‌وكاته‌دا له‌سه‌ر مێرده‌كه‌ی پێویسته‌ شێوازی ئامۆژگارییه‌كه‌ی بگۆڕێت به‌ گرتنه‌ به‌ری ڕێگای دووه‌م.

---

[1] سووره‌تی نیساء/٣٤.

[2] سووره‌تی ته‌حریم/٦.

[3] سووره‌تی العلق /٦-٧.

## دووهەم: بەجێ هێشتن لەجێگەی خەوەکەی

جێگەی خەو شوێنی دڵپێخۆشبونەو بەجێ هێشتنی شێوازێکی دەرونی یە لە ئەدەب دادان، مێرد دەیگرێتە بەر بۆ ئاگادارکردنەوەی ژنەکەی لەسەر ئەوەی کە لەوەو دوا چارەنووسی بێ بەش بوون دەبێت لە جێگەی خەوەکەی، کە بریتییە لە لوتکەی پەیوەندی هاوسەری لەسۆزو خۆشەویستیو دڵارامی، هەروەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ)[1].

بەڵام پەروەردەی ڕەوشتی ئیسلامی فەرمان دەکات بە مێرد کە پابەندبێت بەم خاڵانەوە:

١- بەجێ هێشتن نابێت مەگەر تەنها لەشوێنی بەتەنیایی ژنو مێرد.

٢- نابێ لەبەرچاوی منداڵەکان دا ژنەکەی بەجێ بێڵێ، بۆ ئەوەی ئەوە کارنەکاتە سەر ڕەفتاریانو لە دەرونیان دا شەڕو خراپەکاری بەجێ بێڵێ، هەروەها نابێت بەجێ هێشتنەکە لەبەردەم کەسانی بێگانەدابێت چونکە، ئەوە ژنەکە زەبون دەکاتو لە شانو شەوکەتی کەم دەکاتەوەو لەڕێزی دادەبەزێنێ، بەو شێوەیە لەیاخی بوونی زیاد دەکاتو بەلەسەتر دەبێت، لەبەر ئەوەی مەبەست لە بەجێ هێشتنەکەی لەسەر جێگەی خەو بۆ چارەسەرکردنی یاخی بوونەکەیەتی، نەك بۆ زەبوون کردنی ژنەکە بێ یاخود بۆ خراپ کردنی منداڵەکان بێت.

٣- ئەگەر ئەم ڕێگایەش شکستی هێنا، بەهۆی ئەوەوە کە ئافرەتەکە دەرونێکی شەڕەنگێزی هەبوو تاوانی ڕەوشتی ئەنجام دەدا، کە پێچەوانەی ئاداب و بەها بوو، ئەوا لەسەر مێردەکە پێویستە پەنا بەرێت بۆ ش ێوازێکی تر کە بگونجێ لەگەڵ دەروونی دا، ئەمەش هەنگاوەکەیە.

---

[1] سوورەتی ڕوم/٢١.

## سێهەم: لێدان

لەمافی بەكارهێنانی لێداندا مەرجە كە ئەم خاڵانە پەیڕەو بكرێن:

١- دەبێ بەنیەتێكی باش بێتو ئامانج لێی چاكسازی بێت نەك تۆڵە سەندنەوە.

٢- نابێ توندوتیژ بێتو شوێنەواری لە ئێسقانو ڕوخساردا دەرنەكەوێتو نەبێتە هۆی ڕوودانی ناتەواوی لەجەستەی ژنەكەدا، بەپێچەوانەی ئەوەوە كاری مێردەكە دەبێتە تاوانو سزا دەدرێت لەسەری، وەكو لێدان لەكەسێكی تری بێجگە لەژنەكەی.

٣- لێدانەكە كاتێكە كە ژنەكە تاوانێكی ئەنجام دا كە یەكی نەدەگرتەوە لەگەڵ ئەدەبو ڕەوشتی چاكدا.

خوای پەروەردگار فەرمانی بە لێدان كردووە، لەبەر ئەوەی مێردەكە لەم بارودۆخەدا لەبەردەم سێ هەڵبژاردن دایە، چوارهەمیان نیە:

أ- یان دەبێت پەنا بەرێتە بەر دادگا، كە ئەم ڕێگەیان ئاشكرا بوونی نهێنییەكانی خێزانەكەی تیادایە.

ب-یاخود تەڵاق دان كە هەڵوەشاندنی خێزانەكەی تیادایە.

ت-یاخود لێدانی سوكەڵە (نە ئازاری شوێنی ناسكی بداتو نە ئێشی پێ بگەیەنێ وە نەبرین داری بكات)، كەواتە لێدانەكە باشترە.

هەندێ كەس وای ڕادەگەیەنێ كە شێوازی لێدان هەڵبژاردنێكی دانایانە نی یە، جا منیش پێیان دەڵێم:

بەڵێ لێدان بە تێگەیشتنی ناسازی ئەوان دانایی نیە، بەڵام ئەو ڕێگایە جەنگێك نیە لەنێوانی پیاوەكەو ژنەكەدا، كە بەو شێوەیە مەبەستی ئەوبێ سەری ژنەكە بشكێنێ، كاتێ كە تاوانباری دەكات بە ئەنجامدانی شێوازێك كە پێچەوانە بێت لەگەڵ ئادابی گشتیو پابەند بوونی هاوسەری. لەڕاستی دا ئەوانە هەرگیز لە ئیسلامەوە نی یە بەڵكو لەدابو نەریتی هەندێ سەردەمەوەیە لەگەڵ بەسووك سەیركردنی ئادەمیزاد پەیدابوو.

بەڵام کاروباری ئیسلام لەشێوەو وێنەدلو لە مەبەستو ئامانج دا جیاوازی هەیە، لێدانیش وەکو تەڵاق ناشیرینە، بەڵام سوکەڵەترینی شەڕە لەسێ هەڵبژاردنەکە کە پێشتر باسکرا.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی دڵنیا کردۆتەوە لە فەرموودەکانیدا لەوانە، فەرموویەتی: (لا يجلد احدكم امرأته جلد عبد ثم يجامعها في آخر اليوم)[1] واتە: با کەسێك لە ئێوە قامچی لە ژنەکەی نەدات وەکو قامچی دان لەکۆیلەو پاشان لە کۆتایی ڕۆژەکەشدا لەگەڵیا کۆببێتەوە).

هەروەها لەبارەی ئەو کەسانەشەوە کە لەژنەکانیان دەدەن فەرموویەتی: (ولا تجدون أولئك خياركم)[2]، واتە: ئەوانە لە چاکەکانی ئێوە نین)، هەروەها فەرموویەتی: (ولا يضرب الا اشراركم)[3]، واتە: شەڕ فرۆشەکانتان نەبێ لێیان نادەن.

لەو فەرموودە پیرۆزانەوە ئەوە تێدەگەین کە لێدان نابێت مەگەر سزادانێك بۆ ژنەکە، کارێکی پێچەولنەی ڕەوشتو ئادابی گشتی کدبێت، ئەو سزادانەش ناگاتە تەڵاق، لەبەر ئەوەی پێویستە سزادان شوێنەوارەکەی لەسەر کەسە تاوان بارەکە کورت ببێتەوە، لەکاتێکدا کە تەڵاق دان کاریگەری خراپی هەیە لەسەر ژنو مێردەکەو منداڵەکان، کە خۆیانو خانەوادەی هەردوولا دەی بینین، ئەوەش پێچەولنەی فەرموودەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی: (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ)[4] هەروەها نابێت سزادانەکە لەدادگاوە بێت، لەبەر ئەوەی خۆتێ هەڵقورتاندنی دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە، دوای ئەوەش دەبێتە هۆی خراپ بوونی ناوبانگی خێزانەکە.

---

[1] بڕوانە صحيح مسلم بشرح فتح الباري، پێشەوا حافظ أحمد بن علي بن حجرالعسقلاني (٧٧٢–٨٥٢) باب مايكره من ضرب النساء ٣٠٢/٩.

[2] نيل الأوطار للشوكاني ٢٣٨/٦.

[3] الطبقات الكبرى ١٤٨/٧.

[4] سوورەتی ئەنعام /١٦٤.

پێشینه چاكەكان ئەو ڕاستی یه تێگەیشتبوون، جا شورەیحی قازی ڕەحمەتی خوای لێبێ، كه عومەری كوڕی خەتاب خوای لێ ڕازی بێ دایمەزراندبوو قازی بوو لەسەر بەسره، ماوەی (٦٣) ساڵ قازی بوو، كاتێ كه له (زەینەب)ی هاوسەری توڕه دەبوو، ئەو سیواكەی كه لەكاتی نوێژدا دانەكانی پێ دەسڕی دەیگرت بەدەستییەوەو بەسیواكەكه ئاماژەی بۆ هاوسەرەكەی دەكردو بەهەڕەشەوه پێی دەوت.

رأيت رجالاً يضربون نساءهم فشلت يميني حين أضرب زينبا

واته: پیاوانێكم بینی له ژنەكانیان دەدا دەستم خاوبێتەوه كه له زەینەب بدەم

كەواته ئەو لێدانەی كه له قورئانی پیرۆزدا فەرمانی پێ كراوه، ئەو لێدانه نیه كه نەفامەكان لێكی دەدەنەوه، بوونی مەبەست بۆ ئەو ئەنجامدانی كارانه ڕازی نابێ بەوەی بەسوك سەیركردن‌و زەبوون كردن‌و بێ نرخ كردن بێت بۆ ژنەكە، نابێ ناچاربكرێ لەسەر بژێوی یەك كه ژنەكه پێی ڕازی نەبێت.[1]

ئەو سێ هەنگاوه كه دەیگرێته بەر، ئەگەر یاخی بوونەكه لەژنەكەوه بوو بەڵام ئەگەر هاتوو یاخی بوونەكه له پیاوەكەوه بوو، ئەوا قورئان فەرمان دەكات به پەیڕەو كردنی ئەمخاڵانه:

## چوارەهەم: ئاشت بوونەوه (ئاشتبوونەوش چاكتره)

قورئانی پیرۆز هەردوو هاوسەرەكه ئاڕاسته دەكات بۆ ئاشتبوونەوەو دانوستان‌و لەیەك تێگەیشتن، هەركاتێ دەست پێشخەرییەكانی یاخی بوونی مێردەكه دەستی پێ كرد، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ)[2].

---

[1] بڕوانه في ظلال القرآن ٥/٦٤، سيد قطب.

[2] (وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الْأَنْفُسُ الشُّحَّ وَإِنْ تُحْسِنُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا) النساء١٢٨.

ئەوەش چاكترینی ڕێگایە بۆ ڕێكخستنی كۆمەڵایەتی لە دەوروبەری خێزانەكەدا كاتێ دەترسن لەڕوودانی دیاردەی یاخی بوون لەلایەنی مێردەوە، كە دەبێتە هۆی هەڕەشە كردن لەپلەو پایە ڕێزی ژنەكەو هێمنیو سەقامگیری خێزانەكە.

لەپێش ئەوەدا كاریگاتە جیابوونەوەی دوو هاوسەرەكە لەیەكتری، كە بریتی یە لە ناخۆشترینی حەڵاڵ بەلای خوای پەروەردگارەوە، یاخود وازهێنان لەژن كە لەنێوانی هەردوو بارودۆخی مانەوەو تەڵاق دا بژی، قورئانی پیرۆز هانی مێردەكەی داوە لەسەر لەیەكتری گەیشتنو ڕازی بوون بە ئاشت بوونەوە، كە بۆ خۆشیو بۆ ژنەكەشو منداڵەكانیشیان چاكترە، لەوانەشە ئەو لە نەویستنی ژنەكەیدا بەهەڵەدا چووبێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا).[1]

ئەو چوار هەنگاوە لەكاتێكدا دەگیرێتەبەر كە لایەنی كەمو كوڕی لەهەردوو هاوسەرەكەدا ئاشكرابێت.

بەڵام لەكاتی بوونی ناكۆكی (شقاق) لەنێوانیانداو تاوان باركردنی هەریەكەیان لەلایەنی ئەوی تریانەوە بەكەمو كوڕی هاوكارەكەی، لەم كاتەدا قورئانی پیرۆز فەرمان دەكات بەوەی لایەنی سێهەم بكەونە بەینیانەوە لە خانەوادەو خزمو كەسو كاریان بۆ ئەوەی ئاشتیان بكەنەوە لەڕێگای ناوبژی كردنەوە.

## پێنجەم: ناوبژی كردن

لەكاتی دەركەوتنی سەرەتاكانی دووبەرەكیو جیاوازی دا لەنێوانی دوو هاوسەرەكەدا، لەسەر خێزانەكەیان، لەسەر گەورەكەیان یاخود لەسەر قازی یاخود لەسەر هەر كۆمەڵێكی ئیسلامی پێویستە بچنە نێوانیانەوەو هاوكارو یارمەتی دەریان

[1] (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا) النساء/١٩.

بن بۆ قەدەغەكردنی دوو بەرەكی یەكەیان بەو شێوازەی قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ كردووە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا)[1].

بۆ جێبەجێكردنی ئەو فەرمانە خواییە بۆ لێكۆڵینەوە لەو دوو بەرەكیەی وا لەنێوانی ئەو دوو هاوسەرەدا پێویست دەكات ئەم خاڵانە جێگیر بكرێن:

أ- پێویستە ناوبژیوانێك لەكەس‌و كاری ژنەكە بنێرن كە ئافرەتە كە پێی ڕازی بێت، ناوبژیوانێكیش لە كەس‌و كاری پیاوەكە بنێرن كە پیاوەكە پێی ڕازی بێت.

ب- دەبێ ئەو دوو ناوبژیوانە دادپەروەربن‌و پسپۆڕبن لەكاروباری خێزان‌و گیروگرفتەكانی دا.

ت- دەبێ لە خزم‌و كەس‌و كاری ژن‌و مێردەكە بن ئەگەر توانرا، خۆ ئەگەر كەس‌و كاریان نەبوو كە بەكەڵكی ئەوە بێت لەبەر نەبوونی پسپۆڕی یاخود دادپەروەری یاخود لەبەرشتی تر ئەوا باشتر وایە دراوسێ بن[2]، وە حیكمەتی ئەوەی كە دوو ناوبژی وانەكە لەكەس‌و كاریان بێت، بریتی یە لەوەی كە ئاگادارییان هەیە لەبارەی كێشەكانی ئەو ژن‌و مێردەوەو ناوبانگی هەردوو خێزانەكە دەپارێزن‌و زیاتریش سۆزیان هەیە بۆ مناڵەكان، زۆریەی كاتیش چاوەڕوانی ئەوەیان لێ دەكرێت كە لەكارەكەیان دا سەركەوتووبن.

پ- دەبێ بێ جیاوازی كردن‌و لێك جیاكردنەوەو لادانی بەلای یەكێكیان دا ناوبژیوانی بكەن.

ج- دەبێ دوو ناوبژیوانەكە لەكەش‌و هەوایەكی هێمندا لەگەڵ دوو هاوسەركەدا كۆببنەوە، دووربێ لە هەڵچوونی دەروونی‌و خلتەی هەستیاری‌و حاڵو باری بژێوی یەوەو شتی تریش لەو هۆكارانەی كە پێویستن بۆ بیرخستنەوەی هەڵبژاردنی ژیانی هاوسەری یەوە.

---

[1] سوورەتی نیساء /٣٥.

[2] بڕوانە أحكام القرأن لإبن العربي (أبى بكر محمد بن عبدالله) ١/٤٢٤.

ح- دەبێ هەریەكیان ڕاپۆرتێكی ڕاستی ئەمینی خاوێن بەرزبكەنەوە، كە هۆكارە ڕاستەكانی جیاوازیو دووبەرەكی دوو هاوسەرەكە لەخۆی بگرێتو لایەنی خاوەن كەمو كوڕی تیادا دیاری كرابێ.

خۆ ئەگەر ئەو پێنج هەنگاوە شكستیان هێنا ئەوكاتە ڕوون دەبێتەوە كە بەوشێوەیە ژیانی هاوسەرییان ڕاستو جێگیر نابێت، جا لەوكاتەدا كارێكی دانایی یە كەمل كەچی ڕاستی یەكی تاڵ بىن، یەك تەلاقی ناخۆش، لەسەر ئەوەشەوە كە ئیسلام پێی خۆش نیە لەبەرئەوەی ناخۆشترینی حەلاڵە بەلای خوای پەروەردگارەوە.

## شەشەم: تەلاق بۆ یەكەم جار (واتە یەك تەلاق)

لەكاتی ناچاریەكی زۆردا، ئایینی پیرۆزی ئیسلام ماوەدەدات بۆ پەنابردن بۆ تەلاق كە بەسێ جار دیاری كراوە، لە فەرموودەی خوای پەروەردگاردا كە فەرموویەتی: (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)[1].

واتە: تەلاقێك لەدوایەوە بتوانرێت بەگەڕانەوەی لەتەلاقی ڕەجعی دا دەست بكرێتەوە بەژیانی هاوسەرێتی، بەگرێ بەستو بەمارەیی‌و تازە لە تەلاقی بائین (دووجار)دا، جا لەحاڵەتی گەڕانەوەو گرێ بەستی تازەدا خاوەنەكەی ناتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێت بەپێی فەرموودەی خوای پەروەردگار: (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ).[2]

---

[1] (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) سوورەتی بەقەرە/٢٢٩.

[2] (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ) سوورەتی بەقەرە/٢٣٢.

زۆرێك له‌شه‌رع ناسان‌و موفه‌سیره‌كان وای بۆده‌چن كه‌ مه‌به‌سته‌كه‌ بریتی یه‌ له‌وه‌ی كه‌ ته‌ڵاقی ڕه‌جعی دووجاره‌، له‌دوای هه‌رجارێك (أمساك بمعروف) ژنه‌كه‌ی به‌بێ گرێ به‌ست ده‌گه‌ڕێنێته‌وه‌ (أو تسريح بإحسان) واز له‌ ته‌ڵاق دراوه‌كه‌ ده‌هێنێت به‌بێ گه‌ڕانه‌وه‌، به‌ ته‌واوبوونی (عیدده‌)كه‌ی دیاری (بینونه‌)ی ده‌بێت.

له‌گه‌ڵ ڕێزی زۆرم بۆ پله‌و پایه‌ی ئه‌و زانا به‌ڕێزانه‌، ئه‌وانه‌ هه‌موویان پێچه‌وانه‌ی ده‌قی قورئانن له‌به‌ر ئه‌م هۆیانه‌ی كه‌ هاتوون:

١- وشه‌ی (تسريح) له‌ زاراوه‌ی قورئانی پیرۆزدا بێجگه‌ له‌ ته‌ڵاق مانای تری نیه‌، به‌ به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ سووره‌تی ئه‌حزاب، ئایه‌تی (٢٨)دا هاتووه‌ كه‌ ده‌فه‌رموێت: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا)و ئایه‌تی (٤٩) (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا).

٢- وابه‌بیردا نایه‌ت كه‌ وشه‌ی (السراح) له‌و دوو ده‌قه‌دا واتای بدرێته‌وه‌ به‌واز لێ هێنان هه‌تا عیدده‌ی به‌سه‌ر ده‌چێت، وه‌ به‌شێوه‌یه‌كی تایبه‌تی له‌ده‌قی دووهه‌مدا (ته‌ڵاقه‌كه‌ بائن)ه‌ له‌به‌رئه‌وه‌ی له‌پێش چوونه‌ لایه‌، ئه‌وه‌ی كه‌ ئاشكرایه‌ قورئان هه‌ندێكی هه‌ندێكی تری ته‌فسیر ده‌كرێت.

٣- ڕای جمهوری زانایانی شه‌رع ناس له‌سه‌ر ئه‌وه‌ جێگیر بووه‌ كه‌ (ته‌ڵاق‌و السراح‌و الفراق)و وه‌رگیراوه‌كانیان له‌ داڕشتنه‌ ڕاشكاوه‌كانی ته‌ڵاقن.

٤- (التسريح) كارێكی ئه‌رێنی یه‌، له‌ ئاده‌میزاده‌وه‌ ده‌رده‌چێ به‌ ویستی خۆی، (الترك)یش (وازلێ هێنان) كارێكی نه‌رێنی یه‌و نابێت یه‌كه‌م به‌دووهه‌م مانابكرێت.

٥- ئه‌گه‌ر مه‌به‌ست له‌ (الگلاق مرتان) بریتی بێ له‌ ته‌ڵاقی ڕه‌جعی، كه‌واته‌ حوكمی (بائن) كوا؟ ئه‌ی بڕیار چی یه‌ ئه‌گه‌ر ته‌ڵاقه‌كه‌ له‌پێش چونه‌لای بێت.

٦- قورتوبی ده‌ڵێ: (ئیبن عومه‌ر وتی: كۆی زانایان له‌ سه‌رئه‌وه‌ن كه‌ فه‌رمووده‌ی خوای په‌روه‌ردگار (أو تسريح بإحسان) ته‌ڵاقی سێهه‌مه‌ له‌دوای دوو ته‌ڵاق دان،

ئەوەشە مەبەستی فەرمودەی خوای پەروەردگار (فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)[1].

٧- ئەوەی پشتگیری ئەوە دەکات لە (أحكام القران)ی (جصاص)، وە (احكام القران)ی (ئیبن العربی).

کەواتە، فەرموودەی خوای پەروەردگار (أو تسريح بإحسان) ڕاستی یەکە لە تەڵاق دانی سێهەمدا، بەڵگەش نیە لەسەر لادان لەمانا ئەسڵیەکەی، فەرموودەی خوای پەروەردگار (فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ) ڕوونکردنەوەی ئەو بڕیارەیە کە لەسەر تەڵاقی سێهەم ڕێك دەخرێت نەك خۆی، ئەو چارەسەرەش ئەوەیە کە بۆمێردی یەکەمی حەڵاڵ نابێتەوە هەتا شوودەکاتەوە بە پیاوێکی تر و لەسەر پەیڕەوی شەریعەت دەچێتەلای، جا ئەگەر بە مردن یاخود بە تەڵاق دان یاخود بەلێك جیاکردنەوەی دادوەری لەیەکتری جیا بوونەوەو ماوەی عیددەی تەواو بوو ئەوسا ئەگەر مێردی یەکەمی دەتوانێ مارەی بکاتەوە ئەگەر بیانەوێت.

## پابەند بوونەکانی تەلآقدەر لە کاتی تەلآق داندا

ئەگەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام ماوەی داوە بەمێرد کەپەنا بەرێتە بەر تەڵاق وەکو چارەسەری کۆتایی لەبواری پەند داداندا، بەڵام ماوەی نەداوەتە پیاوەکە لەومافەدا کەی و چۆن بیەوێ ڕەفتار بکات، بەڵکو ناچاری کردووە کە پابەندبێت بەم خاڵانەوە:

١- جیاکردنەوە لەنێوان سێ تەڵاقەکەداو دابەش کردنی بەسەر سێ جاردا، ئەوەش دەقی فەرموودەی خوای پەروەردگاری لەسەر هاتووە کە فەرموویەتی: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)، بەڵگە نەویستیشە کە بوارنیە بۆ ئیجتیهاد کردن لە هاتنی دەق دا، ئەو دەقە قورئانیەش کەباس کرا بەڕۆشنی و بەڕاشکاوی سێ تەڵاق دانەکەی دابەش کردووە بەسەر سێ جاردا.

[1] سورەتی بەقەرە٢٣٠

(الجصاص) دەڵێ: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (الطلاق مرتان) ئەوەش پێویست بە جیابوونەوە دەكات بێ هیچ گومانێك، ئەگەر هەردوو تەڵاقەكەی بەیەكەوە دا، دروست نی یە كە بڵێ دووجار تەڵاقی داوە، وەك چۆن ئەگەر پیاوێك دوو درهەمی دا، نابێ بوترێ دووجار پارەی داوە، هەتاكو پێدانەكە جیا بكرێتەوە، ئەو كاتە ئەوەی پێ دەوترێت[1].

٢- دیاری كردنی كات: لەسەر مێردەكە پێویستە كە لەتەڵاق دانەكەیدا پابەندبێت بەكاتی دیاری كراوەوە كە لە قورئانی پیرۆزدا بۆی دیاری كراوە، لەم فەرموودەیەی خوای پەروەردگاردا: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)[2] وتارەكە بۆ پێغەمبەری خوایە ﷺ لەم ئایەتەدا بۆ جولاندنی گرنگی پێدان، وێناكردنی گرنگی پێدان،و كاتی (عدە= چاوەڕێی ئافرەتەكە) كە سونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری كردووە، بێجگە لەم كاتانە:

أ- كاتی بێ نوێژی (الحیض): دروست نیە لەكاتی بێ نوێژی دا ژن تەڵاق بدرێت.

ب-كاتی زەیسانی: دروست نیە ئەگەر لەكاتی زەیستانی دابێ.

ت-كاتی خاوێنی كە تیایدا مێردەكە تێكەڵیی لەگەڵ ژنەكەیدا كردبێت، نابێ لەدوای تێكەڵ بوون تەڵاقی بدات لەبەر ئەگەری ئەوەی كە ژنەكە سكی پڕ بێت.[3]

---

[1] أحكام القرآن للجصاص، سەرچاوەی پێشوو ٢/٧٣-٧٤.

[2] (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا) سوورەتی تەڵاق /١.

[3] بۆ زانیاری زیاتر سەردانی الفتح الباری بشرح جمع البخاری، سەرچاوەی پێشوو ٩/٣٤٥ بكە كتێبی الطلاق بەشی فەرموودەی خوای پەروەردگار (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ) هەروەها سەردانی زاد المعاد فی هدی خیرالعباد محمد خاتم النبیین وإمام المرسلین لە نوسینی ←

پ- پێشتر تەڵاقی (ڕەجعی)و (بائن)یش نەدرابێت، چونکە تەڵاقدانی تەڵاقدراو بەهەمهێنانی بەرهەمهێنراوە، کە ئەمەش بەکۆڕای زانایان موستەحیلە جا ئەگەر ویستی تەڵاقی دووەمجار یان سێهەمجاری بدات دەتوانێت بیهێنێتەوەو پاشان ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات، نابێ ئەو ژنانە لەماڵی هاوسەرێتی دەربکرێن، ئەگەر تەڵاقەکە ڕەجعی بوو هەتا ئەوکاتەی (عیدەکەی= ماوەی چاوەڕوانی) تەواو دەبێت، ئەوەی کە پێویستێتی بۆی دابین بکرێت لە خواردن و پۆشاکو خواردنەوەو جێی نیشتەجێبوون، لەبەر ئەوەی لەماوەی چاوەڕوانی (عیدە) دایە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا).[1] لەفەرمان کردن بە لەخوا ترسان لەپێش فەرمان کردن دایە بەوەی دەریان نەکەنە دەرەوە لەماڵ، ئاگادارکردنەوەیە کە ئاڕاستەی مێردەکان کراوە هەروەها لە: (وتلك حدود الله) پاشان دەربڕینی: (من بيوتهن) بۆ دڵنیاکردنەوەی مافی ئەو ژنانە لەمانەوە لەماڵەکەدا لەماوەی (عیدە= چاوەڕێ کردن دا).

وە لەبڕگەی کۆتایی دا: (لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا)[2] بیانووی نەکردنە دەرەوەیان لەماڵ، بۆ ئەوەی ماوەو ڕێپێدان هەبێت بۆ گەڕانەوەو پێداچوونەوەی سۆزو خۆشەویستیو بەزەیی، بەبیرکردنەوە لە ئەنجامەکانی جیا بوونەوەو یادەوەرییەکانی ژیانی هاویەش، لەکاتێکدا کە ژنەکە دوورە بە بڕیاری تەڵاق بەڵام لەچاوەوە نزیکە، وە لەماوە (عیدە= چاوەڕوانی دا) بۆ

---

پێشەواو زانای بەڕێز ئیبن قەییمی جوزی بکە ٣/٤٣و دوای ئەو لەژێر ناونیشانی (حكم رسـول الله ﷺ في تحريم طلاق الحائض والنفساء والموطوءة فی طهرها وتحريم اليقاع الثلاثة جملة).

[1] سوورەتی تەڵاق /١.

[2] سوورەتی تەڵاق/١.

پیاوەکە هەیە ژنەکەی بگێڕێتەوە بەبێ گرێ بەستی تازە بەکردەوەو بەوتە لەلای هەندێ لەزانایان، وە تەنها بەوتنی وەکو (راجعتك= واتە: تۆم گەڕاندەوە)، لەلای هەندێ زانای تر بەو وتەیە، وە بەکردەوە وەکو مامەڵەکردن لەگەڵیا لەگەڵ نێتی گێڕانەوەی، وە کاتێ کە (عیدە= ماوەی چاوەڕوانی یەکە) تەولو بوو، بۆی نیە بیگێڕێتەوە مەگەر بەگرێبەستی تازە.

٤- شایەتی گرتن لەسەر تەڵاق دانو گەڕانەوە، لەسەر مێرد پێویستە بە شایەتی دووپیاو ژنەکەی تەڵاق بدات یاخود ژنەکەی لەبەردەم دووشایەت دا بگەڕێنێتەوە، بۆ ئەوەی دووربێ لەشوێنی گومان پێ بردن، بۆ شایەتی دان لەو دوو بارەدا دەقی قورئانی پیرۆزی لەسەر هاتووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ)[1] وە فەرمان کردن بە ئامادەبوونی دوو شاهیدی دادپەروەر بۆ پێویستی، لەبەر ئەوەی پێویستی بریتی یە لە ناوەڕۆکی فەرمانەکەی خوای پەروەردگار ئەگەر بەڵگە لەسەر پێچەوانەی ئەوە نەبێت.

٥- زۆر لەژنەکە نەکرێت بۆ ئەوەی شتێك لەمارەیی یاخود خەرجی یەك کە مێردەکەی بۆی خەرج کردووە لەکاتی ژیانی هاوسەرێتی دا بۆ مێردەکەی بگێڕێتەوە لەبەرامبەر تەڵاقی ژنەکەدا، ئەگەر ژیانیان پێوەکە نەدەگونجا، بەڵام ئەگەر شتێك لەوەی ڕووی دا بە ڕەزامەندی ژنەکە بۆ مێردەکە لەبەرامبەری تەڵاق دا، لەبەر ئەوەی ژنەکەی نەی دەویستو دەیویست ڕزگاری بێت لێ ی، ئیتر هەرچەندە تێ بچێت ئەوا ئازادە لەوەدا، لەزارلوەی زانایانی شەریعەت دا بەو تەڵاقە دەوترێت (الخلع= تالۆق).

---

[1] (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا) سوورەتی تەڵاق /٢.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ).[١].

ئەو دەقە قورئانییە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیسلام تا چ ڕادەیەك سوورە لەسەر پاراستنی ژنەکە لەو ستەمکردنەی لەدوای تەڵاق دان توشی دەبێت، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ ژیانی هاوسەرگیری لەدوای تەڵاقی یەکەم، پاشان جیاوازی و دووبەرەکیو بەخراپ لەیەك تێ گەیشتن ڕووی دا، ئەوا لەسەر مێردەکە پێویستە ئەو پێنج هەنگاوەی پێشتر باس کرا لەپێش تەڵاق دانی یەکەمدا پەیڕەوی لێ بکات بەهەمان تەرتیبو یەك لەدوای یەك، جا ئەگەر هەوڵەکانی شکستیان هێنا، ئەوا دروستە بۆمێردەکە بۆجاری دووهەم تەڵاقی بدات.

### حەوتەم: تەڵاق دان جاری دووهەم:

لەسەر مێردەکە پێویستە لەم جارەدا ڕەچاوی هەموو ئەو پابەندییانە ببێت کە لەتەڵاق دانی یەکەمدا لەجیابوونەوەو کات دانانو شایەتەکانو نەکردنە دەرەوەی ژنەکە لەسەری کراوەتە ئەرك، هەتا ئەوکاتەی ماوەی (عیدە= چاوەڕوان کردنەکەی) تەواو دەبێت.

ئەگەر دوو هاوسەرەکە گەڕانەوە بۆ ژیانی هاوسەرێتی یان لەدوای تەڵاقدانی دووهەم یاخود بە (الرجعي= گەڕانەوە) لەوکاتەدا کە تەڵاقەکە (ڕەجعی) بێت، یاخود بەگرێ بەستێکی تازە کە ئەگەر (بائن= ڕوونو ئاشکرابێ)، پاشان گەڕانەوە بۆ هەمان ناڕەحەتیو خەمو خەفەت، ئەوا لەسەر مێردەکەش پێویستە کە پێنج هەنگاوەکەی

---

[١] سوورەتی بەقەرە/ ٢٢٩ لەبارەی پێویست بوونی شایەتەکان، سەریدە لە التفسير الكبير الإمام فخر الرازي ٣/٣٤ احكام القرأن للقرطبي، سەرچاوەی پێشوو وە تفسير الطبري ١٣٧/٢٨.

یەكەم پەیرەو بكاتەوە، خۆ ئەگەر سوودی نەبوو ئەوا بۆی هەیە پەنا بەرێتە بەر تەلاقی سێ هەمو كۆتایی.

## هەشتەم: تەلاق دانی جاری سێهەم:

ئەگەر هەرسێ تەلاقەكە تەواو بوو ئەوا ئەم بڕیارانەی بەسەردا ڕێك دەخرێت:

١- دروست نیە ژنەكە لەماڵی مێردەكەدا بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی تەلاقەكە بوەتە تەلاقێكی (بائنة بینونة الكبری= لێكپچڕانی گەورە) لێی حەرام دەبێت.

٢- لە تەلاقی لێكپچڕانی گەورەدا دروست نیە ژنەكە بگەڕێتەوە بۆلای مێردەكەی نەبە (ڕەجعەی)و نەبە( گرێ بەستێكی تازە).

٣- بۆ ژنەكە هەیە لەدوای تەواوبوونی (عدة= چاوەڕوان كردن)ەكەی، مێردێكی تر هەڵبژێرێت كە بیكاتە هاوبەشی ژیانی هاوسەرگیری.

٤- دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆلای مێردی یەكەمی بەم مەرجانەی خوارەوە:

أ- كە شوو بكات بە پیاوێكی تر، بەشوو كردنێكی شەرعی سروشتی نەك لەڕێگای (مارەبەجاشەوە)وە، چونكە (مارەبەجاشەوە) بەتاڵە، دەبێت مێردی دوهەمی بەشێوەی شەرعی لەگەڵیا سەرجێی كردبێت.

ب-دەبێ جیابوونەوەیان (لەگەڵ مێردی تازە) بەمردن یاخود تەلاق یاخود بە جیاكردنەوەی دادوەری بێت.

ت-دەبێ ماوەی (عیدە= چاوەڕوان كردن)ی لەو جیابوونەوەیە كۆتایی بێت.

ئەگەر ئەو مەرجانە هەبوون، ئەوا بۆ مێردی یەكەم هەیە كە ئەگەر بیەوێت مارەی بكاتەوە، لەبەر ئەوەی هەریەكێ لەو دوو هاوسەرە بەتاقی كردنەوەی تاڵ دا تێپەڕیان كردووە، جا چاوەڕوان دەكرێت كە هاوسەرگیری لەپاش ئەو تاقی كردنەوەیە سەركەوتن بەدەست بێنن.

**دانایی لەو بەجێ هێنانەدا:**

١- تەڵاقی سێهەم دادەنرێت بە ئەنجامێکی حەتمی بۆ بەکارهێنانی نەیاری لەنێوانی دوو هاوسەرەکەدا، کردنەوەی دەرفەت بۆیان لەلایەن یاسادانەری حەکیمەوە زیاتر لەوە (تەڵاق دان جا وەرگرتنەوە ئەمجا جیابوونەوە ئەمجا گەڕانەوە دیسان تەڵاق دان) ژیانو بەدەوامبونی نەگبەتیو نارەحەتیەکی بێ کۆتاییە.

٢- دروستی گەڕانەوە (لەپاش تەڵاقی سێهەم) پابەندە بە شووکردنی ژنە تەڵاقدراوەکە بەمێردی دوهەم، پابەند بوونێکی تر کە بۆی زیادکراوە لەیاسادانەرەوە بۆ پابەندبوونەکانی تر لەسەر خۆویستی لە تەڵاق دا بۆ تەسك کردنەوەی بازنەکەیەتی.

٣- ئەزموونی ژنەکە لەگەڵ مێردە تازەکەی، هەموو ڕاستی یەکان لەبەردەمی دا ڕۆشن دەکاتەوە، جا چاکەکانی لە هەڵەکانی جیادەکاتەوە لەنێوانی بەراوردکردنی دا لەنێوانی هەردوو ژیانەکەی دا لەگەڵ دوو مێردەکەی دا، بەهەمان شێوەش سەبارەت بە مێردەکە.

لەکۆتایی ئەو جێباسەدا دەگەڕێمەوەو بە ئەهلی فتوادانو کەسانی تریش دەڵێم:

ئەوە بنەما گشتی یەکانە لە ڕێ شوێنگرتنەبەری پەند دادان کە قورئانی پیرۆز بەڕۆشنی بڕیاری لەسەر داوە، ئەو بڕیارانەش ژیرانەو سەلامەتە، ماوە نادانە مێرد کە پەلە بکات لەکۆتایی پێ هێنان بە پەیوەندی هاوسەرێتیو بۆ یەکەم جار هەڵیوەشێنێتەوەو لە هۆکارەکان دا هەڵە بکات،و ئەو پەیوەندی یە پیرۆزە گیانی یە لەپاش هەوڵدانو نائومێد بوون نەبێ وازی لێ نەهێنێ، خوای پەروەردگار بانگی پیاوان دەکاتو پێیان دەفەرموێت: (وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا)[1] بەڵام جیاوازی زۆر هەیە لەنێوانی ئەو

[1] (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا) سوورەتی نیساء/١٩.

فەرمانەی کە قورئانی پیرۆز تیایدا هاتووەو لەنێوانی ئەوەدا کە زۆربەی موسڵمانان لە جیهانی ئیسلامی دا ئەنجامی دەدەن.

بەخەمەوە دەڵێمو هەمووشتان لەگەڵمابن: (ئەم دەستورە گەورەو مەزنە ئەمرە لەجێبەجێکردنەوە بەسەر زیندووەکان دا گۆڕاوە بۆ گۆرانی سەر قەبرانەکانو لاواندنەوەی مردووەکان)!!!

# جیٚ مەبەستی دوهەم:
# پەروەردەو ئەدەب دادانی منداڵان

هەرکەسێك لە شەریعەتی ئیسلامدا قوڵ ببێتەوە، لەوەدا کە پەیوەندی هەیە بە پەروەردە کردنی تاکەوە، پەروەردەیەکی تەندروستی دوور لەڕەفتاری خواربوونەوە، دەبینیٚ کەوا لەسەدا نەوەدو پێنجیش پشتی بەستووە بە هۆکارە خۆپاراستنەکانو لەسەدا پێنج پشتی بەستووە بە هۆکارە چارەسەری یەکان وەکو سزادانو ئەدەب دادان.

بەڵگە نەویستیشە کە خۆپاراستن چاکترە لە چارەسەرکردن لەلایەنی ڕەفتاریو تەندروستی یەوە، بەڵام ئەو چارەسەرەی کە خۆی لەسزادان یاخود ئەدەب دادانێکی باش دا دەبینێتەوە کە مەبەستی هێنانەدی قەدەغەکردنو دامرکاندنەویە، لەگەڵ ئەوەشدا مانای پاراستنی تیادایە، بەڵام بە یاساو ئەو دادوەریی یە کە جیٚبەجیٚ دەکات خۆپاراستن لە تاوانەکان بە واتای تەواو نایەتە دی، لەبەر ئەوەی قەدەغەکردن لەڕەفتاری تاوانکاری لەوکاتەدا ناگەڕێتەوە بۆ وازهێنانی کەسی لەسەر ئەو ڕەفتارە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ترسان لەسزادان لە بنەڕەت دا، بەشێوەیەك ئەگەر سزادانەکە کەمتر توندبوو یاخود لەوانەیە کەمتر بێت، ئەوا ئەگەری تاوانکردنو لادان زیاترو دروستترە.

لەلایەکی تریشەوە قەدەغەکردنو دامرکاندنەوە لە ئەنجامی سزادان یاخود ئەدەب دادان دا بەرهەم هاتبیٚ، سەرچاوەکەیان ئەنجام دانی پەروەردەییو ئاڕاستەکردن نیە بۆ (دەربازبوون) نەك لادانی منداڵ، بەڵکو گەڕانەوەیە بۆ ترسان لەسزاو ترسی ئازاردانە.

بێجگە لەوەش مەزەندەکردنی تازەپێگەیشتووەکان لەترس لەسەر قەدەغەکردنی لادانو ڕەفتاری هەڵەو تاوان، لەکاتێکدا کە تاکو ئێستا پێوانێکی بابەتیانەی ئاشکرا

نیه بۆ زانینی ڕێژه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه قه‌ده‌غه‌كردن‌و دامركانه‌وه قه‌ده‌غه‌ی ئه‌نجام دانی تاوانیان لیّ ده‌كات، ئیتر ئه‌وانه له گه‌وره‌كان بن یاخود له منداڵان بن، پاشان قه‌ده‌غه‌كردنی تازه پێگه‌یشتوو له سزادان یاخود له ئه‌ده‌ب دادان ڕۆڵی كاریگه‌ریان نیه سه‌باره‌ت به‌و كه‌سانه‌ی كه تاوانكردن یاخود ڕه‌فتاری تاوان كارییان كردۆته پیشه‌یان.

كاتیّ كه تاوان كاری پیشه‌یی یاخود تاوانباری ڕاهاتوو له‌سه‌ری حیسابی بۆخۆی كردووه‌و خۆی بۆ هه‌موو مه‌ترسی یه‌ك ئاماده‌كردووه كه چاوه‌ڕوانی ده‌كرێت.

ئه‌مانه هه‌موویان خۆپاراستنن كه له‌ئه‌نجامی په‌روه‌رده‌ی كه‌ش‌و هه‌وایه‌كی ئازادو ئاراسته‌كردنێكی مه‌عنه‌وی ڕاست دا هاتۆته به‌ر، ئه‌ویش له‌به‌رئه‌م هۆكارانه:

أ- خۆپاراستن واته نه‌هێشتنی ئه‌و هۆكارانه‌ی كه ده‌بنه هۆی تاوانه‌كان‌و لادان‌و وه‌رگرتنی ڕه‌فتاره نادروسته‌كانْ له‌ناو كۆمه‌ڵگه‌دا.

ب- سیاسه‌تی خۆپاراستن پشت ده‌به‌ستیّ به بناغه زانستی‌و كرداریه‌كان، ئیتر ئه‌وانه له‌شه‌ریعه‌تی ئیسلامی دا بن یاخود له‌یاسادابن، به‌و شێوه‌یه سه‌ركه‌وتوو ده‌بێت له هێنانه‌دی ئه‌و مه‌به‌ستانه‌ی كه گومانیان تیایدا نیه.

ت- خۆپاراستن له‌كاتێكی زووه‌وه به‌كارده‌هێنرێت، واته له بارودۆخێكدا كه تاكه‌كه‌س وه‌كو هه‌ویرێكی زۆر نه‌رم وایه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شێوه‌ی قاڵبی ئه‌و ڕه‌فتاره چاكه وه‌رده‌گرێت‌و ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆسه‌ر ئه‌و ڕاهێنانه‌ی كه له‌سه‌ری كراوه‌و به‌و ڕۆشتنه ڕازی ده‌بێت كه‌وا له‌سه‌ر ڕێگای ڕاسته.

پ- له‌كۆن‌و نویّ دا وتراوه: (زانست له منداڵی دا وه‌كو نه‌خشی سه‌ر به‌ردوایه)و ئاشكراشه كه په‌روه‌رده‌ی منالّ‌و هۆشیاركردنه‌وه‌و ئاراسته‌كردن‌و وه‌رگرتنی ڕه‌فتاری دروست هه‌موویان له‌بابه‌تی زانستن (فێربوون‌و فێركردن).

له‌وژێری یه‌وه شه‌ریعه‌تی ئیسلامی فه‌رمانی كردووه به ئه‌نجامدانی بنه‌ڕه‌ت‌و هۆكاره‌كانی خۆپاراستن له‌سه‌ر لاربوونه‌وه‌ی منالان نه‌ك له‌پێك هاته‌كه‌یداو به‌س

بەڵکو لەپێش ئەوەشەوەو لەو هۆکارانەش کە دەگەڕێتەوە بۆ پێش بەدی هێنانەکەی وەکو ئادەمیزادو گۆڕینی لە تووێکەوە بۆ گۆرپەلەیەك لەسکی دایکی دا.

وە لەبەر تیشکی شەریعەتی ئیسلامی دا دەتوانین ئەو دامەزراوە ئایینییانە کە لەسەر دروست کردنی ئاڕاستەی منالآن لە تاوانەکانو لاریبوونەوەکان کار دەکەن، دابەش بکەین بۆ ئەمانە:

١- خێزان

٢- قوتابخانە

٣- مزگەوت

٤- الحسبە (حیسبە)

هەوڵ دەدەین توێژینەوە لەو دامەزراوانە بکەین کە پاراستن دێننە ئاراوە لە تاوانەکان بە توێژینەوەیەکی کورت وەکو ئەوەی کە دێت:

## یەکەم: ڕۆڵی خێزان:

بەڵگە نەویستە ئەو خێزانەی دەستی بە ئیسلامەوە گرتووە لە پاراستن لە تاوانەکانی منالآن لە خانەی یەکەم ئەژمار دەکرێت بۆ پێك هێنانی پەیکەری ئەو کۆمەڵگەیەی کە لە کۆمەڵێك خانەی خێزانی پێك هاتووە.

جا خێزانیش ڕێگایەکە بۆ گەشەکردنی کۆمەڵگە، یاخود ئەو کۆمەڵگە بچوکەیە کە تاکەکەس پێش کەش دەکات بە کۆمەڵگە گەورەکە، لەبەرئەوە هەر شتێك کە تاکەکەس لە کۆمەڵگە بچوکەکەی دوور دەخاتەوە، شوێنەوارەکەی لە کۆمەڵگە گەورەکەدا ڕەنگ دەداتەوە ئەگەر خراپ بێ یاخود چاك بێت.

گرنگی خێزان لە بەهێزکردنی ڕەفتاری ئەندامە منالەکانیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مندالٚ پێشوازی لێ دەکات لەو کاتەدا کە هێشتا هەویرێکی نەرم بووە کە هەموو ئەو قەبارانە وەردەگرێ کە خێزان دایڕشتووە لەسەری، یاخود منالٚ ئەو تابلۆ هەستیارەیە کە شوێنەوارەکانی شوێن پەنجەکانی بەقوڵی لەسەر بەجێ دەمێنێ.

پاشان خێزان بریتی یە پێشانگایەکی فراوان کە هەموو ڕەنگەکانی تیادا دەخرێتەروو لە ڕەنگەگانی هۆکارە کۆمەڵایەتیەکان لەویژدانیو ڕەوشتیو ڕۆشنبیریو ئابووری.

لەخێزان دا چنراوی پەیوەندییە ویژدانی یەکان پێك دێن کە تاکەکەس دەبەستێتەوە بەژیانی دەرەکی یەوە کە ئەو چنراوە خەریکە ڕەنگی کۆتایی وەردەگرێت لەچەند ساڵی یەکەمدا لەو ژیانەدا کە تاکەکەس تیایدا مانایەکی دیاری کراو بۆ کۆمەڵگەو ژیان تێ دەگات، کە تیایدا چاکە لە خراپە جیادەکاتەوە،و پاك لەپیسو سوودبەخش لەزیان بەخشو خێر لەشەڕ.

منداڵ لە خێزاندا برسی دەبێو تێردەبێو چاوچنۆك دەبێو ڕازی دەبێ، لەسەر ڕازی بوون یاخود بە بوغزوقین دەپێچرێتەوە، لەبەر ئەوە دەتوانرێت خێزان وەکو دەفرێك تەماشا بکرێت کە تیایدا گیانی کۆمەڵایەتی پێ دەگات یاخود دەسوتێت.

بۆ هەموو ئەو شتانەی کە باسمان کردو بۆ زیاتریش لەوانە، شەریعەتی ئیسلامی گرنگی زۆری بەڕۆڵی خێزان داوە لەپاراستنم لەلاربوونەوەی منداڵان، بۆیە داوای چەند شتێکی لەخێزان کردووە کە لەپێویستی یەکانی ئەو پاراستنەن، چۆنیەتی مامەڵەکردنی هەریەك لەو دوو هاوسەرە لەگەڵ یەکتری دا،و لەوانە دەگەڕێتەوە بۆ منداڵەکە خۆی وەکو شیر پێ دانو دایەنگا.

### ئەوەی کە پەیوەستە بە سروشتی هاوسەرگیریەوە:

ئایینی پیرۆزی ئیسلام فەرمانی کردووە بە ئادەمیزاد کە لە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانی دا گرنگی بدات بەلایەنی دینو ئەخلاق، لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ کە فەرموویەتی: (تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ)[1] واتە: (ئافرەت لەبەر چوار هۆ مارە دەکرێت: بۆ سامانەکەیو بۆ

[1] صحيح بخاري ٥٠٩٠، صحيح مسلم ١٤٦٦.

بنەچەكەی‌و بۆ جوانیەكەی‌و بۆ دینەكەی، تۆ بۆ دینەكەی بیهێنە دەستت دەچێت بەخێرو بەرەكەت دا).

واتە: ئەو هۆكارانەی كە پاڵ دەنێ بە پیاوەوە بۆ هەڵبژاردنی هاوسەرێكی دیاری گراو وەكو هاوبەشی ژیانی یان لەبەر سامانەكەیەتی یاخود لەبەر جوانیەكەیەتی یاخود لەبەر پلەوپایەی كۆمەڵایەتی یەكەیەتی یاخود لەبەر دینەكەیەتی (ڕەوشتی)، جا ئیسلام فەرمان دەكات بەوەی كە پێوەری كۆتایی وەربگرێت، بۆ ئەوەی نەكەوێتە ناو زەلكاوەوە، جا ئەگەر سیفاتەكانی تریشی تیادا كۆبوونەوە ئەوە ڕوناكی یە لەسەر ڕوناكی بەهەمان شێوەش لە هەڵبژاردنی ژن دا بۆ پیاو كە ئەو پیاوە دەبێتە هاوبەشی ژیانی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (تخيروا لنطفكم فإن العرق نزاع).[1]

لە گێڕانەوەیەكی تردا: (تزوجوا فى الحجر الصالح فإن العرق دساس)[2] لەو فەرمودە پیرۆزەدا بۆمان دەردەكەوێ كە پێغەمبەری خوا ﷺ زانابووە بە كاریگەری بۆماوەیی لەسەر ڕەفتارەكان، لەپێش دۆزینەوەی ئەو كاریگەریانەدان بەسەدان ساڵ، بەڵكو قورئانی پیرۆز ئاماژەی كردووە بۆ كاریگەری كورپەلەی بۆماوەیی بە ئاشكرا لەم فەرموودەیەدا: (فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا (٢٧) يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا).[3]

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إياكم وخضراء الدمن، فقيل: يارسول الله، وما خضراء الدمن؟ قال: المرأة الحسناء في المنبت السوء)[4] جا منداڵ لەسەرەتای تەمەنی دا هەڵە لەڕاست جیاناكاتەوە، بەڵكو لەسەر بناغەی چێژو ئازار بڕیار لەسەر شتەكان دەدات، جا چێژو لەزەتەكە پاڵی پێوە دەنێ كەبەرەو ئەنجام دانی كارێك بڕوات، تەنها ئازاریشە كە پاڵی پێوە دەنێ بۆ قەبارەی هەڵەكەی بەبێ هیچ لێك

[1] الحديث عند ابن ماجه وقد النفرد به عن اصحاب الكتب السعة.

[2] العراقي، تخريج الإحياء ٢/٥٣.

[3] سوورەتی مەریەم /٢٧–٢٨.

[4] الدار قطني، المقاصد الحسنه /١٦٤.

دانەوەیەكی تر، هەروەكو ئەوەی ئەو منداڵە خاوەنی هێزی شی كردنەوەو هۆكارو دەرئەنجامەكان نەبێت، بەڵكو ئەو ڕۆڵی لە چاولێكردنی دایكو باوكیو كەسانی تردا كورت دەبێتەوە لە هەڵبژاردنی ئەوەدا كە كامە خێرو چاكەیەو كامە شەڕو خراپەیە بەڵكو لەبەر زیاتر لەوە، خوای پەروەردگار مێردی ژنانی دواندووە كە دەفەرموێت: (وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ)[1] لەبەر ئەوەی چاكیو خراپی مامەڵە كردن كاریگەری چالاكی هەیە لەسەر ڕەفتاری منداڵ لە داهاتوودا.

ئەوەی پەیوەندی هەیە بەشیر پێ دانو دایەنەوە شەریعەتی ئیسلامی فەرمانی كردووە بەوەی كە دەبێ شیرپێدان لەلایەن دایكی منداڵەوەبێت بەو مەرجەبێ كە دایكی منداڵەكە خاوەنی ڕەوشتو ئاكاری چاكو بەرز بێت، بۆ ئەوەی كاریگەری چاكی لەسەر منداڵەكە هەبێتو لەپاشەڕۆژی ژیانی دا ڕێگای ڕاست بگرێت، هەروەكو داواش كراوە لە دایەنی منداڵ بە سیفاتی چاكو شكۆدار ڕازابێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو منداڵەی كەوا لەباوەشی دا پەیڕەوی لێ بكاتو ببێتە ئەندامێكی چاك لە كۆمەڵگەدلو بەچاكیو دروستی مامەڵە بكات لەگەڵ كەسانی تردا كە دەچێتە ناو جەنگی ژیانەوە.

## دووەم: ڕۆڵی دامەزراوە زانستی یەكان

دامەزراوەی زانستی ڕۆڵی گەورە دەبینێ لە ڕەفتاری منالاندا، لەبەر ئەوەی منداڵ، وەكو باسمان كرد خاوەنی هێزێك نی یە كە بەهۆیەوە هەست بەشتەكان بكات لەسەر ڕاستێتیان، بەڵكو ڕۆڵی ئەو منداڵە لەسەر چاو لێكەری كردن كورت دەبێتەوە لەناو خێزانەكەیداو لە قوتابخانەكەیداو كاریگەری چالاكی هەیە لەسەر فێرخوازە منداڵەكە، چاك بێت یاخود خراپ، جا ڕۆڵی مامۆستا كورت نابێـەوە لەسەر فێركردن، بەڵكو لەسەری پێویستە ئاڕاستەكردنو هۆشیاركردنەوەش زیاد بكات، لەسەر مامۆستا پێویستە پێشڕەوێكی چاك بێت بۆ بەهاكان تا شوێن كەوتوانی پەیڕەوی لێ

[1] سوورەتی نیساء/١٩.

بكەن، وە پێویستە هێمایەك بێت بۆ ڕەوشتی بەرزو دەفرێك بێت بۆ بەهاكان تا شوێن كەوتوانی پەیڕەوی لێ بكەن.

## سێهەم: رۆڵی پەرستن لەرەفتاری تاكی منداڵدا یاخود گەورەدا

هەموو ئەو پەرستشانەی كە داوا لە ئادەمیزاد كراوە ئەنجامیان بدەن هۆكاری پاراستنن بۆ قەدەغەكردنی ئەو كەسانەی كە خوا پەرستیەكان ئەنجام دەدەن لە خراپەكاری‌و لاریبوونەوە، خوای پەروەردگار لەرۆڵی نوێژكردن دا لەپاراستن دەفەرموێت: (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ)[1] ڕستەی (إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ) ڕوونكردنەوەیە بەڕوونكردنەوەی ئەو دەقە، بەپێویست بوونی نوێژكردن‌و فەلسەفەو دانایی یەكەی، جا ئەگەر نوێژ خوێن بەشێوەیەكی ڕاست‌و دروست نوێژەكەی ئەنجام دا، ئەوا بەربەستی دەست كەوتووە لەدژی هەموو میكرۆبەكانی تاوان كردن.

خوای پەروەردگار لە پاراستنی ڕۆژوو گرتن دا فەرموویەتی: (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)[2].

دەستەواژەی (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) ڕوونكردنەوەیەكی فەلسەفی یە بۆ دانایی پێویست بوونی ڕۆژووەكە ولتە: بۆ ئەوەی هێزێكی گیانی بەدەست بێنن كە لەشەڕ بتان پارێزێ.

## چوارەم: حیسبە

ڕۆڵی پاراستن لە فەرمان كردن بەچاكەو قەدەغەكردنی خراپە كاریگەرە لە پاراستن لە تاوانە گەورەكان‌و تاوانە بچوكەكان، ئەگەر بەشێوەیەكی ڕاست ئەنجام بدرێت.

[1] سوورەتی عەنكەبوت /٤٥.
[2] سوورەتی بەقەرە /١٨٣.

ئەوەی پەیوەندی هەیە بەم بابەتەوە، لەپێشتردا باسمان کرد، پێویست بەدووبارە کردنەوە ناکات.

ئەمانە هەموو مانای ئەوە نی یە کە ئەدەب دادانی منالە پێنەگەیشتووەکان کاریگەری نیە بۆیان لەرەفتارە چاکەکانیان‌و دوورخستنەوەیان لەتاوانە بچوکەکان بەڵکو لەسەر خاوەنەکەی پێویستە کە هەستیٚ بە ئەدەب دادان هەرکاتیٚ دیاردەی لاریبوونەوە دەرکەوت‌و سەرەتاکانی تاوانی بچوك لای منالان دۆزرایەوە، لەبەر ئەەی چارەسەر لەگەڵ پاراستن دا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینیٚ لە چاکسازی منالٚ دا (لەلادانیان) لە تاوانە بچوکەکەی.

لەسەر سەرپەرشتیار پێویستە ئەدەبی منالەکان دابدات کەوان لەژێر سەرپەرشتی کردنی دا، پێویستە وریابی‌و پێش بینی بکات لەو ئەدەب دادانەداو دەبیٚ بەژیرانە ڕەفتار بکا، لەبەر ئەوەی لەوانەیە ئەدەب دادانەکە ببێتە ئەنجامێکی پێچەوانە، لەکۆن‌و تازەدا وتراوە: (ئادەمیزاد سوورە لەسەر کردنی ئەو شتەی کە قەدەغەی لیٚ دەکرێت).

## جێباسی دوهەم:
## کارە وەرزشی یەکان

لەپێشتردا ڕونمان کردەوە کە یاسادانراوەکان سزادان هۆکارەکانی ڕێپێدانی لەسێ جۆردا کورت کردوەتەوە کە بریتی بوون لە مافی بەرگری شەرعی تایبەتی‌و بەکارهێنانی ماف‌و ئەنجامدانی ئەرك، بەپێچەوانەی ئەوەوە کە شەریعەتی ئیسلامی لەسەرێتی لە فراوان کردنی هۆکارە گشتی یەکانی ڕێپێدان، ئەوانەی باسمان کردو بێجگە لەوانەش.

لەدەروازەی بەکارهێنانی ماف لەبەرگری شەرعی ئیسلامی، ئەنجام دانی یارییەکانی ئەسپسواری‌و مەلەکردن‌و تیر ئەندازی‌و هاوشێوەیان لەکارە وەرزشی یەکانی فیکری‌و جەستەیی دوور لە توندوتیژی‌و زیان گەیاندنی جەستەیی بەکەسانی تر.

بەلگە نەویستە کە وەرزش بەشێوەیەکی ڕەها لە هۆکارە پەروەردەیی‌و خۆشەکانەو پێویستی جەستەیی یە بۆ پارێزگاریی کردن لە تەندروستی‌و چالاکی، ئەگەر لە سنووری شیاوی خۆیدا بێت، دووربێت لەزیادەڕەوی نادروست، لەکۆن‌و تازەدا زانراوە: (عەقلّی ساغ لە لەشی ساغ دایە).

لەبارەی بەکارهێنان‌و بەکارنەهێنانی توندوتیژی یەوە لەسەدەی نوێدا یاری یە وەرزشی یەکان دەکرێن بەدوو بەشەوە:

یەکەم: جۆرێکیان پێویستی بە بەکارهێنانی توندوتیژی نی یە وەکو ڕومبازی‌و تێنس‌و تۆپی پێ‌و مەلەکردن‌و پێش برکێی ئەسپ سواری، یاخود ئۆتۆمبێلەکان یا پاسکیل سواری یان لەشجوانی هاوشێوەی ئەوانە، کە بەکارهێنانی توندوتیژیان

له‌سه‌ر ڕێكناخرێتو ئازاردانی تیادا نیه بۆ جه‌سته‌ی ئاده‌میزاد، ئه‌و جۆره جیاوازی نی یه دروستیو ڕێپێدانی دا، ئه‌گه‌ر مه‌رجه‌كانی تیادابێتو ڕه‌چاوی ڕێساو بنه‌ماكانی بكرێتو به‌ربه‌سته‌كانی نه‌مێنێت.

دوهه‌م: گریمانی ئه‌وه‌ی تیادایه كه توندوتیژی به‌كار بهێنرێت له‌سه‌ر جه‌سته‌ی ڕكابه‌ر وه‌كو بۆكسێنو زۆرانبازیو كاراتیو بێجگه له‌وانه‌ش، كه به‌كارهێنانی توندوتیژی تێدایه‌و زیانی جه‌سته‌ییش ده‌گه‌یه‌نێت هه‌ردوولای ڕكابه‌ر، له‌به‌ر حه‌زكردن به‌سه‌ركه‌وتن به‌سه‌ریاو زاڵ بوون به‌سه‌ر ئه‌وی تردا، ئه‌و جۆری دوهه‌مه یاساییه‌كان جیاوازییان هه‌یه له‌دروستیدا له‌به‌رئه‌و زیان پێگه‌یاندنانه‌ی كه تیایدا هه‌یه له‌زیانی جه‌سته‌یی به‌یه‌كت ده‌گه‌یه‌نرێت.

ئه‌وه‌ی شایه‌نی باسه ئه‌و جیاوازی یه له شه‌ریعه‌تی ئیسلامی دا نای بینین له‌به‌ر ئه‌وه‌ی جیاوازی نی یه له‌ناڕه‌وایه‌تی دا.

## بنه‌مای ڕێپێدانی یاری یه وه‌رزشی یه‌كان

ئه‌م بنه‌مایه‌ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی كه‌وا یاریزان مافێكی خۆی به‌كارده‌هێنێ كه یاسا بۆی بڕیارداوه‌و نه‌ریتی نێوده‌وڵه‌تی یه‌كان دانیان ناوه به‌ڕه‌وایه‌تی ئه‌نجام دانی ئه‌و مافه‌دا كه ڕه‌چاوكردنو ڕێك خستنی یاری یه وه‌رزشی یه‌كانی له‌ئه‌ستۆ گرتووه‌و سه‌رپه‌رشتی یان ده‌كه‌ن.

ڕێپێدانی كاره وه‌رزشی یه‌كان ناگه‌ڕێته‌وه بۆ تیانه‌بوونی مه‌به‌ستی تاوانكاریو ناشگه‌ڕێته‌وه بۆ ڕه‌زامه‌ندی ده‌ستدرێژی بۆ سه‌ركراو كه توشی ئازاردانی جه‌سته‌یی ده‌بێت.

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی دواكه‌وتنی ڕه‌گه‌زی نیازی تاوانكاریی، ئه‌گه‌ر له‌تواناى دا هه‌بوو كه لێپرسراوێتی سزادان لابه‌رێت، ئه‌وا ڕێ به‌كاره‌كه نادات له‌پاش ئه‌وه‌ش نكوڵی ناكات له لێپرسراوێتی شارستانیو داواكاری توش بوو به‌قه‌ره‌بووكردنه‌وه‌ی ئه‌و توش بوونه‌ی كه زیانی لێ داوه.

هاوشێوەی ئەوەش كەمە كە تاوان لەسەركراو ڕازی بێ بەوكارە، لەبەر ئەوەی ڕەزامەندی ئادەمیزان بەوەی دەستدرێژی بكرێتە سەر سەلامەتی جەستەی پێچەوانەیە لەگەڵ سیستمی گشتی دا، لەبەر ئەوەی ژیانی هەر ئادەمیزادێك كە ئەندامێكی لە كۆمەڵگەیەدا، هاوبەشی هەیە لەنێوانی ئەوو ئەو كۆمەڵگەیەدا، ئەوەش مافێكی تایبەتی نی یە بەخۆی، هەتا لەسەری ڕازیبێت، بە بەڵگەی ئەوەی بەشەرعو بەیاساو بەدابو نەریتیش خۆ لەناوبردن حەرامە.

## مەرجەكانی ڕێپێدانی یاری یە وەرزشی یەكان[1]

بە مەرجگیراوە بۆ ڕێپێدانی كارە وەرزشیەكان كە چەند خاڵێك هەبێت، كە دەتوانرێت لەمانەدا كورت بكرێنەوە:

١- نیازپاشی یاریزان لە جوڵەی وەرزشی دا كە توانای هەبێت زیان بەلای ڕكابەری بگەیەنێت، پێویستە نێتی یاریزانەكە ئاڕاستە بكرێت بۤ بەدەستهێنانی مەبەستێكی ڕەوا، كە یاسا مەبەستێتی بۆ دلنیپادان بەڕێپێدانی یاری یەكە.

خۆ ئەگەر یاریزانەكە نێتو مەبەستی خراپ بێت لەكاتی ئازار گەیاندن دا بە یاریزانە ڕكابەرەكەی تر، ئەوا لەبواری سزاداندا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەكرێت لەسەر ڕووداوەكە ئەگەر تاوانەكە لە كەشو هەوایەكی ئاسایی دا دلنرا، هەروەكو لەبواری مەدەنیدا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەكرێت، ئەگەر ڕووداوەكە زیانێكی

---

[1] بڕوانە: د.محمود نجیب حسنی، شرح قانون العقوبات المصری، بەشی گشتی چاپی ١/١٩٦٧، لاپەڕە/ دوای ئەویش.

د.محمود مصطفی، شرح قانون العقوبات المصری، بەشی گشتی چاپی ١/١٩٨٣، لاپەڕە/١٧٦و دوای ئەویش.

د.عباس الحسنی، شرح قانون العقوبات العراقی الجدید، بەشی گشتی، چاپی ١/١٩٧٠، لاپەڕە/١١٨و دوای ئەو لاپەڕەیە.

استاذ پارێزەر محسن ناجی، الأحكام العامة فی قانون العقوبات العراقی، چاپی ١/١٩٧٤، لاپەڕە/٢١٦و دوای ئەو لاپەڕەیەش.

هەبوو، پێویستی دەکرد قەرەبوو بکرێتەوە، ئەگەر لە دەرەوەی ئەنجام دانی یارییەکە رووی بدایە.

٢- دەبێ یاری یەکە لەو یاری یانە بێت کە نەریتی وەرزشی دانی پیادا نابێت، بەوەی ڕێسای هەبێتو پێی ئاشنابنو دابو نەریتی هەبێتو ئەوانەی کە هاوبەشی دەکەن لەیاری کردنەکان دا، ڕێز لەو ڕێسایانە بگرن.

٣- کارەکانی توندوتیژی یاخود ئەوەی کەبۆتە هۆی لێدان لەسەلامەتی جەستەی ڕکابەر، ئەگەر لەکاتی پێش برکێی وەرزشی دا ڕویدابێت خۆ ئەگەر لەپێش دەستپێکردنیان لەدوای تەواو بوونی بێ، یاخود لەدوای وازهێنانبێ لێی، ئەوا لە هۆکارەکانی ڕێپێدان ئەژمار ناکرێن.

٤- دەبێ بەشداریکردنی وەرزشەوانەکە بە بژاردەو ڕەزامەندی تەواوی خۆی بێت، خۆ ئەگەر ناچار بکرێت بۆ بەشداریکردن، ئەوا ئەو یاریە لە هۆکارەکانی ڕێپێدان ئەژمار ناکرێت، بەڵکو لەسەر زیان گەیاندنی جەستەیی ڕێکخراوە، مافی ئەوەی هەیە کە داوای قەرەبووی زیانەکەی لێ بکات، هەروەکو کەسێك ڕوداوێکی سزادان ئەنجام دەدات، ئەگەر لەوانە بێت کە لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەنجام بدرێت ئەگەر لە دەرەوەی یاری یەکە بوو.

٥- نابێ یاریزان لەکاتی ڕوودانی زیان گەیاندن بەکەسێکی تر لەو ڕێسایانە بچێتە دەرەوە بەئەنقەستو سەرکەشی کردن لەبەرامبەر ڕکابەرەکەیدا، ئەگینا بەرپرسیار دەبێ لەسەر تاوانە بەئەنقەستەکە لەوەی کە ئەنجامی داوە لەو ئازارەی لەجەستەی ڕکابەرەکەی داوە.

ئەگەر چوونە دەرەوەکەی لەسەر ئەو ڕێسایانە هەڵەو کەمتەرخەمی بێت ئەوا لێپرسراوە لەسەر کردەوەکەی سەرپێکانی کەسێکی تر بەنائەنقەست، خۆئەگەر پێویست بوونی بۆ سزادان نەیەتەدی، ئەوا ناچار دەکرێت بەقەرەبوو کردن لەسەر ئەو کردارە زیان بەخشەی کە بەهۆی هەڵەکەوە رووی داوە، بناغەی لێپرسینەوەش لە پێکهاتەکە بریتیە لە کەمتەرخەمیو ئیحتیات نەکردن.

بەوپێیە ئەگەر یەکێك لە یاریزانەکان ماوەی یاری کردنەکەی، قۆستەوەو ویستی کینەو بوغزی خۆی لە نەیارەکەی جێبەجێ بکاتو توشی نارەحەتیەکی کرد، بنەمای یاری پێ نەدا بەزیاندەر یاخود برینداركاری بەئەنقەست ئەژمار دەکرێت.

## فەلسەفەی رێپێدانی یاری یە وەرزشی یەکان:

١- شیکەرەوە یاساییەکانو شەیدایانی یاری یە وەرزشیەکان لەبینەرانو شیکەرەوە وەرزشی یەکان ئەوە دەبینن کە فەلسەفەکە ئەوەیە کە: بوونی یاری یە وەرزشی یەکان لەهۆکارەکانی نزیك بوونەوەیە لەنێوانی گەلو نەتەوەکان دا، جگە لەوەش لە بارێایەتی کە ببێتە یارمەتی دەرو هاوکارو دەستەبەرکردن لە چارەسەرکردنی گیروگرفتە سیاسیو ئابووریە هاوبەشەکانو شتی تریش لەنێوانی وڵاتو گەلاندا.

٢- وەرزش کردن هۆکارێکە لە هۆکارەکانی خۆشی بەسەربردن، چا هەموو ئادەمیزادێك داوا لێکراوە کە ئەرکێ لە ئەرکەکانی ئەنجام بدات لەوڵاتەکەیدا، ئەمەش پێویستی بەوە هەیە کە پشووی جەستەیی‌و چالاکی فیکری بۆخۆی بگێڕێتەوە، لەکاتی ئەنجام نەدانی کارە جەستەیی‌و فیکری یەکان.

بەڵگەکانیش لەسەر ئەوە، هۆکارە سەرەکییەکان بۆ ئەو وڵاتانەی کە لەبواری شارستانێتی‌و تەکنەلۆجیادا پێش کەوتووە، بریتی یە لە دابەش کردنی کاتەکانی ڕۆژ بۆسێ بەش، سێ یەکی تایبەت دەکرێت بۆ کارکردنی بەردەوام، سێ یەکی دوهەمی بۆ پشووی جەستەیی‌و فیکری‌و چێژ وەرگرتنە لەوەی کە ئادەمیزادێك خووی پێوە گرتووە، هەروەکو سێ یەکەکەی تریشی بۆ خەوتنە.

٣- یاری یە وەرزشی یەکان هۆکارێکن لە هۆکارەکانی پارێزگاری کردن لەسەر تەندروستی جەستەیی، ئیتر جۆری وەرزشەکە هەرجۆرێ بێ، بەڵگە نەویستیشە کە ئەو وەرزشە بە جیاوازی کەسەکانو تەمەنیانو تواناو ڕۆژگاریان جیاوازییان هەیە.

**ڕاوبۆچوونی خۆم لەبارەی یاری یە وەرزشی یەکانەوە:**

١- هەموو یاری یەکی وەرزشی کە ئەنجامدانەکەی لەسەر بەکارهێنانی توندوتیژی بوەستێ وەکو زۆرانبازیی و بۆکسێن و هاوشێوەیان پێویستە لەسەر هەردوو ئاستی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی بەپێی یاسا قەدەغە بکرێن، لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی ئەوەی کە لایەنی ڕکابەر توشی مەترسی دەکات لەسەر سەلامەتی جەستەیی، ناتوانێ بەرژەوەندی لەسەر ئەو خراپە چاوەڕوان کراوە بێنێتەدی، وە لەڕێسا شەرعی و یاسایی یە گشتی یەکان، ئەگەر بەرژەوەندیی و خراپە لەیەك شت دا نەیاربوون، جا ئەگەر هەردوکیان یەکسان بوون یاخود خراپەکە زاڵ بوو، ئەوا پێویستە ئەو بەرژەوەندییە وازلێ بهێنرێ بۆ دوورخستنەوەی خراپەکە.

٢- زیادەڕەوی کردن لە هەموو شتێکدا، ئەگەر چی ڕێپێدراویش بێ لەخۆی دا کارێکی سەرزەنشت کراوەو عەقڵی ساغ و لۆژیکی یاسایی پێی ڕازی نابێت.

٣- گرانترین شتێك کە ئادەمیزاد لەژیانی دا هەیبێت بریتی یە لەژیانی کە تەمەنێتیی و کاتەکەیەتی، جا ئەو دووانە قەرەبوو ناکرێنەوە ئەگەر بەزایە چوون لەکارێك دا کە بەرژەوەندی ڕاستیی و دروستی ماددی یاخود مەعنەوی پێشکەش نەکرد بەتاك و بە کۆمەڵگە.

جا دانانی بینین پێشبڕکێ یاخود هەر یاری یەکی تر لەکاتەیەك لەدوای یەکەکان بە بەرژەوندییەکی مەعنەوی بەتێکەڵوپێکەڵکردن حسابە هەڵەکردن و (السفطة)، کاتێك ئەو بەرژەوەندییە بپێورێت بە تەمەن و کاتی بەنرخی بەزایەدان.

٤- ئەو کەسەی لەهۆکاری پاڵنەرەکەی قوڵ ببێتەوە بۆ گرنگی پێدانی زیاتری بێ سنوور بەیاری یە وەرزشی یەکان لە گەلەکانی جیهانی سێهەم و وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان، دەبینرێ کە لەدوای ئەو پاڵ پێوەنانە ناپەسەندەوە، وزەیەکی شاراوەی ئاژاوە گێڕی هەیە کە گرنگی پێدەدات، ئەویش ماسۆنییەتی

جیهانی یە بۆ سەرقالكدنی گەنجان بۆ ئەوشتەی بیٚ نرخەو كەس لەبرسێتی تێرناكات.

٥- زۆرێك لەو كەسانەی كە عەقڵیان سڕ دەبێت بەبینی یاری یە وەرزشی یەكان، ئەركە بنەڕەتی یەكانی خۆیان پشت گویٚ دەخەن لەپێناوی ئەو تەماشاكردنانەدا، بۆ نمونە ئەم باسە دێنمەوە: لەزانكۆی بەغداد لە كۆلێژی یاسا لە ساڵەكانی هەشتاكان دا هاوڕێیەكم هەبوو، هەركاتیٚ كاتی تەماشا كردنی یاری یەكان بكەوتایەتە كاتی وتنەوەی دەرسەكانیەوە، ئەوا وانە وتنەوەی بە قوتابیەكانی واز لیٚ دەهێنا لەپێناو سەیركردنی یاری یەكاندا.

٦- بەخەڵكی عێراق دەڵێم ئایا سەركەوتنی عێراق لە یاریەكانی پاڵەوانێتی ئاسیا، لەسەرەتای مانگی ئابی ساڵی ٢٠٠٧دا چی پێش كەش كرد بەگەلی عێراق كە نزیك بوەتەوە لە هەڵوەشاندن، وەچی پێشكەش كرد لەسنوردانانێك بۆ خوێنو ئەو هەموو خوێنڕشتە ناحەقیانەی كە دەكرێت؟.

دەسەڵاتە گشتی یەکان کۆمەڵێك سەلاحیەت بەکاردەهێنێت کە دەستورو یاسا بۆی دیاری دەکات.

هەندێ لەو دەسەڵاتانە ڕاستەوخۆ بەریەکتری دەکەون لەگەڵ مافەکان‌و بەرژەوەندی تاکەکاندا، وەکو ئەوەی لەبەکارهێنانی دەسەڵاتی هەردوو دەسەڵاتدارێتی دادوەری‌و جێبەجێ کاریدا ڕوودەدات، یاخود بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ وەکو لە دەسەڵاتی یاسادانان دا هەیە، بەشێوەیەکی تایبەتیش لەیاسادانانی سزادان دا، لەهەمان کاتیشدا ئەو مافانەش کە ڕەنگە لای ئەو دەسەڵاتانەوە کە بەدەستوردانراوە دارێژرابێت، جا چۆن ئەو جیاوازی‌و ناکۆکی یەکە لادەبرێت.

پاشان فەرمانبەری گشتی‌و بەتایبەتیش دەسەڵاتی جێبەجێ کردن، لەوانەیە لە سنوورەکانی ئەو دەسەڵات پێ دانەی زیادەڕەوی بکات‌و بچێتە ناو ئەو مافانە، کە دەوڵەت پەیوەست دەکرێ بە پارێزگاری لێ کردنی، ئەو فەرمانبەرەش وا دەزانێ کە هەروا لە چوارچێوەی تایبەت مەندرێتی یەکەیدایە، ئایا لەو حاڵەتەدا بە خاوەن بیانوو ئەژمار دەکرێت؟ دوای ئەوەش لە بەرپرسیارێتی سزادان لێی ڕزگاری دەبێت؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە، لێکۆڵینەوە لە بابەتەکانی جێبەجێ کردنی ئەرکەکان دلبەش دەکرێ بۆ سێ جێباس، کە یەکەمیان بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانە لە دەسەڵاتی یاسادانانی سزادان، دوهەمیان لە دەسەڵاتی دادوەری، سێهەمیان لە دەسەڵاتی جێبەجێ کردن.

# جێباسی یەکەم:
# ئەرك ئەنجامدان لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانی سزاییەوە دەبێت

هەر لەبەدیهێنانی بوونەوەرەوە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، جیهانی مرۆڤایەتی دابەش بووە بۆ دوو سەربازگە: سەربازگەی خێرو سەربازگەی شەڕ، ڕۆژێك لەڕۆژان خێر سەرنەکەوتووە بەسەر شەڕدا، تەنها لەبەر ئەوەی خێرە، بەهەمان شێوەش لەهیچ چەرخێکدا شەڕ لەبەردەم خێردا نەبەزیوە، لەبەر ئەوەی خۆی لەخۆی دا شەڕە.

ئەم نەریتەش لەژیانی مرۆڤایەتیدا وا پێویست دەکات لە هەمووکاتو، شوێنێکدا وەلە هەموو سیستمێکی ڕژێمێکی یاسایی هەبێت کە ئەو کەشتی یە قەرەباڵغە خێرایە بەرەو کەناری دڵنیاییو خێر بەرێ بکات.

جا لەم سۆنگە تێکوپێکدانە دژیەیەكو مل ملانێیەی ژیانی خێزانی مرۆڤایەتی هەر لەدێر زەمانەوە فەیلەسوفەکان لە دیاری کردنی سروشتی ئادەمیزاد جیاوازییان هەبووە کە ئایا هەر خۆی لەخۆیدا شەڕانی بووە یاخود خۆی لەخۆی دا خێردار بووە؟

أ- هەیانە دەڵێ سروشتی ئادەمیزاد لەسەر خاوێنیو خێر هاتووەو هەڵبژاردنی ڕەفتاری شەڕ لەلای ئەو کەسە لەوەوە هاتووە، کە کاریگەری هۆکاری دەرەکیو بەربەستە کوتو پڕەیەکان هاتوون بەسەر سروشتی دا، لەلایەن

گرانی ئەو ئاڕاستەیەش (سوقرات)[1]ی فەیلەسوفی یۆنانی یە، ئەو ئاڕاستەیە ڕەخنەی لێ گیراوە بەوەی پێچەوانەی زۆرێك لە سەلمێنراوە کرداریو ڕاهاتنە ماددیەکانە، لەبەر ئەوەی ئەگەر هەموو خەڵکی بەڕاستی چاکبوون، ئەی کەواتە کێ فێری شەڕی کردوون.

ئەگەر هەندێ کەس فێری شەڕی کردوون، کەواتە هەموو کەسێك هەرچاك نەبوون، خۆ ئەگەر لەخۆیانەوە فێربوون لەبەر ئەوەی ئارەزوویان لێی بووە، ئەوا شەڕیان تیادابووە، ئەوەش زاڵە.

ب- هەندێکی ترو لەناویشیاندا (یەسوعی یەکان)[2] بۆ پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیە ڕۆشتوونو وتویانە: سروشتی ئادەمیزاد لەسەر شەڕ پێك هاتووە، ئەو بەسروشت شەڕانی بووە،و ڕەفتاری خێری بەهۆی هۆکارە دەرەکی یەکانی خۆیەوە وەرگرتووە، وەکو پەروەردەی ماڵو ئاڕاستە کردنی دینیو کاریگەری ڕۆشنبیریو هاوشێوەیان.

ئەو ئاڕاستەیەش کەوتە بەردەم ڕەخنەکان، لەوانەش وەکو ئەو ڕەخنانەی کە لەئاڕاستەی یەکەم گیرا، بەوەی کە ئەگەر هەموویان هەر شەڕانی بن ئەی کێ خێری فێرکردن؟ ئەگەر هەندێکیان فێریان کردوون کەواتە هەموویان شەڕانی نین، ئەگەر لەخۆشیانەوە فێربوون لەبەر ئەوەی ئارەزوویان لێی بووە، کەواتە هەموویان بەسروشت چاکن.

بەڵام قورئانی پیرۆز هەردوو بۆچونەکە پوچەڵ دەکاتەوە، وە دەقی قورئانی هەیە لەسەر ئەوەی کە ئادەمیزاد نەبە سروشت چاکەو نەبە سروشت خراپە، بەڵکو

[1] سوقرات (٦٤٩-٣٩٣ پ.ز) لە ئەسینا گەورە بووەو هیچ نوسینێکی بەجێ نەهێشتووە، بەڵام (ئەفلاتۆن)ی قوتابی لە وانەکانیاو (ئەکسانوفون) لە یادەوەریەکانیا فەلسەفەو فێرکردنەکانیان تۆمارکردووە.

[2] ئەوانە کۆمەڵەیەك بوون کە لەساڵی (١٥٢٤ی زایینی)دا بەسەرۆکایەتی ئەخباسیوسی ئیسپانی دامەزرا مەبەستیشیان بریتی بوو لە تەبشیر بەمەسیحییەتو پشت گیری کردن لە کەنیسەی کاسۆلۆکی.

لەهەردوو جۆرەکە (لەخێرو شەڕ)یشی هەڵگرتووە لەیەك کاتدا، ئادەمیزاد جیهانێکە لەنێوانی جیهانی فریشتەدا کە سەرپێچی خوا ناکەن و ئەوە ئەنجام دەدەن کە فەرمانیان پێ دەکرێ‌و لەنێوانی جیهانی گیاندارە دڕندە شەڕانی یەکان دا، وەکو گورگ‌و پڵنگ‌و هاوشێوەیان.

بەڵام لەسەر ئەنجامی کۆتایی ژیانی هەر ئادەمیزادێك دا یاخود ئارەزووی خێری بەسەر شەڕدا سەردەکەوێ، یاخود شەڕی بەسەر خێردا سەردەکەوێ.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا[1] فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا[2] وَتَقْوَاهَا[3] قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا[4] وَقَدْ خَابَ[5] مَنْ دَسَّاهَا)[6].

ئەو هۆکارانەی پاڵ بە ئادەمیزادەوە دەنێ بۆ ئەوەی هەوڵ بدات کە ئارەزووی چاکەی سەربکەوێ بەسەر ئارەزووی شەڕدا، ئەمانە گرنگەکانیانە:

## یەکەم: هۆکاری توندوتیژی

هەروەکو لەباروبۆخی بەرگری شەرعی تایبەتی‌و بەرگری شەرعی گشتی ناوخۆیی‌و بەرگری شەرعی گشتی دەرەکی دا ئەو هۆکارانە لەبەشەکانی پێشوودا بەدرێژی باس کران[7] خوای پەروەدگاریش لەبارەی بەکارهێنانی ئەو هۆیەوە دەفەرموێت: (وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ

---

[1] ئەو توانایەی کە بەدی هێناوە.

[2] ئاماژەیە بۆ ئارەزووی شەڕخوازی.

[3] ئاماژەیە بۆ ئارەزووی خێر.

[4] واتە هەرکەسێك ئارەزووی خێری بەجوانی پەروەردەی دروست بکات، دەبێتە هۆی ئەوەی زاڵ بێ بەسەر ئارەزووی شەڕدا.

[5] وَقَدْ خَابَ واتە زیانی کردووە، مَنْ دَسَّاهَا بەوەی شێ‌وەیەکی بەردەوامی پەیڕەوی ئارەزووی شەڕ دەکەن هەتا بەسەر ئارەزووی خێردا سەردەکەوێ.

[6] سوورەتی شەمس /٧-١٠.

[7] لەبەشی پێنجەم‌و شەشەمدا.

عَلَى الْعَالَمِينَ)[1] هەروەها فەرمودەی خوای پەروەردگار (وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ[2] وَبِيَعٌ[3] وَصَلَوَاتٌ[4] وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنْصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ)[5] واتە هێزی خێر بەسەر هێزی شەڕدا سەردەكەوێت.

## دووهەم: هۆكاری خۆپارێزیی:

ئەو خۆپارێزیەی كە لە خواپەرستیەكان دەست دەكەون بریتی یە لە وزەیەكی گیانی كە ئادەمیزاد لە هەستان بە ئەنجامدانی ئەو خواپەرستی یانە دەستی دەكەوێ كەدلوای لێ كرلوە كە ئەنجامیان بدات وەكو وزەیەكی دەست كەوتوو لەنوێژكردن لەدژی هەموو خراپەو بەدڕەوشتی یەك، هەروەكو قورئانی پیرۆز دەقی لەسەر هێناوە، كە دەفەرموێت: (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ)[6].

وە وەكو وزەیەكی گیانی كە ڕۆژووەوان دەستی دەكەوێ لەڕۆژووەكەی كە دەبێتە هۆی پاراستنی لەهەموو لاریوونەوەو ڕەفتارێكی تاوان كاری، هەروەكو خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)[7].

واتە: تەقوایەكتان دەست دەكەوێ كە بریتی یە لە وزەیەكی گیانی كە لەخوای پەروەردگارتان نزیك دەخاتەوەو لەهەموو ڕەفتارێكی تاوان كاریتان دوور دەخاتەوە.

---

[1] سوورەتی بەقەرە /٢٥١.
[2] پەرستگای یەهودیەكان.
[3] كەنیسەی نەصاراكان.
[4] واتە: ئەو پەرستگایانەی كە دوعایان تێدا دەكرێت.
[5] سوورەتی حەج /٤٠.
[6] سوورەتی عەنكەبوت/٤٥.
[7] سوورەتی بەقەرە /١٨٣.

لەپێشتردا بەدرێژی باسی ئەو بابەتە کراوە لە شوێنی خۆی دا هیچ بەهانەیەك نیە بۆ دووبارەکردنەوەی درێژە پێ دانی.

## سێهەم: هۆکاری چارسەر

لەکۆن‌و تازەدا وتراوە: (خۆپاراستن لەچارەسەرکردن چاکترە) لەبەر ئەوەی شەریعەتی ئیسلامی گرنگی داوە بە نەهێشتنی تاوانەکان لەسەر پاراستن کە ئادەمیزاد لەبیروباوەڕی خواپەرستەکانیەوە دەستی دەکەوێ بەپێچەوانەی یاساوە کە پشت دەبەستێ بەچارەسەرکردن زیاتر وەك لەخۆپاراستن بەشێوەیەکی تایبەتی پشت بەستنی لەسەر خۆپاراستن، نابێ مەگەر لەدوای ڕوودانی تاوانەکە، کە لەوێدا سازاندنی لەسەر خۆپارێزی یە لەدژی تاوان کار.

چارەسەرکردنیش بریتی یە لەو سزایەی کە شەریعەتی ئیسلامی بڕیاری لەسەردەدا، ئیتر ئەوە دنیایی بێت یاخود قیامەتی.

هەروەکو یاساکانی سزادان دیاری دەکات‌و دەسەڵاتی دادوەری ڕێکی دەخاو دەسەڵاتی جێبەجێکار جێبەجێ دەکا هەروەکو لەم دوو جێباسەی داهاتوودا دێت: ئاشکرایە کە دەسەڵاتی یاسادانانی سزایی کەدان پیانانی سزاکان‌و پاداشتە تاوان کاریەکان دەگرێتە خۆو ڕێکی دەخاو لەبەر تیشکی مەترسی تاوانەکەو تاوان کارەکەدا دیاری دەکات لەسەر کۆمەڵگە، بەنزیك بوونەوەی ئەو دیاری کردنە بەڕەچاوکردنی بارودۆخی کەش‌و هەوای دەوروبەردا، بەڕوودا‌وە سزادانی یەکان‌و بارودۆخی ڕەوشتی کەسێتی یەکەو نزیك بوونەوە لە ئەنجام دانی تاوان کاری یەکەو بێجگە لەوەش کەلە بەرژەوەندی تاوان بارەکە یاخود لەدژی بێت، ئەوانە هەموویان دروستکردنی دەسەڵاتی یاسادانانی سزایی ڕۆژگاری یە، کە سەرپەرشتی ئەو دروست کراوە بەپێی دەستوور دەکات.

جا سزادان لەگەڵ ئەوەش دا کە بەر یەککەوتن دەکات لەگەڵ بەرژەوەندی کەسێتی تاوان بارەکەدا هەر وەکو بەریەك کەوتن دەکات لەگەڵ خێزانەکەی‌و

کۆمەڵگاکەی دا بەئازادانو زیان گەیاندن بەڵام ڕێپێدراوە بەڕێکەوتنی شەریعەتەکانی خوایی و یاسا وەزعی یەکان، ئەگەر مەرجەکانی هاتنەدیو بەربەستەکانی نەمان.

جا سزادان لەشەریعەتیشو لەیاساش دا دانراوە بە چارەسەر بۆ چاکسازی کردن لەتاوان باردا دامرکاندنەوەیەکی تایبەتە کە قەدەغەی دەکات لە گەڕانەوە بۆ ڕەفتاری تاوانکاریو دامرکاندنەوەی گشتیە کە قەدەغەی خەڵکی دەکات لەپەیڕەوکردنیو شوێن کەوتنی.

لەوێستگەی کۆتایی دا سزا یاسایی یەکان یاخود دینییەکان، دنیایی یەکان یاخود قیامەتی یەکان، تا ڕادەیەکی زۆر مافەکانی خەڵکی دەپارێزن لەدەستدرێژی کردنێکی تاوان کاریانە.

جا بەو پێیە کارە دەسەڵاتە یاسادانەرەکان لە هۆکارەکانی ڕێپێدان ئەژمار دەکرێنو ئەگەر کارەکە دەستووری بێ ئەوا بکەرەکەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت، نەسزادانیو نە مەدەنی.

هەروەکو لێپرسینەوە ناکرێت لە ئەندامانی لیژنەی ئامادەکاری پرۆژەی هەموو یاسایەکی سزادان لەوەدا کە پێی هەڵدەستن بەپێی ئەو ڕێسا گشتی یەی کە دادوەری دەکا بەوەی هەرکەسێك پارمەتیو ئاسانکاری پێش کەش دەکات بەوکەسەی هەڵدەستێ بەکارە ڕێپێدراوەکان وا ئەژماری دەکات کە کارەکەش ڕێپێدراوە.

## جێباسی دووەم:
## کارەکانی دەسەڵاتی دادوەری

دەسەڵاتی دادوەری کاری تێڕوانینی ئەو کێشە سزاییانەیە کەبۆی بەرز دەکرێتەوە هەوڵی تیادا بدات بۆ گەیشتن بە ئەنجام، ئەو ئەنجامەش یان بەسزاگەیاندنی تاوانبارە یاخود بڕیاردانە لەسەر بێ تاوانی، بەپێی ئەوەی دادوەر پشت دەبەستێ بە بەدەست هێنانی نەزانراوەوە (بەهێنانەدی دادپەروەری) لەو زانیاریانەی کەلای دەست دەکەون لەبیستراوەکان، وەك وتەی شایەتەکانو خوێندنەوەکانی دەستەی داواکاری گشتیو زانیاری یە خوێنراوەکان لەڕاپۆرتەکانی (لێکۆڵەری دادوەری)و پزیشکی دادوەریو هاوشێوەیان، زانیاری یە بیستراوەکان لەبینینی شوێنەواری تاوانەکانو هاوشێوەیان.

ئەوەی شایەنی باسە کە فەلسەفەی دانانی یاسا لەدەسەڵاتی یاسادانان داننانە بەمافەکانو پاراستنیانو دیاری کردنی پابەند بوونەکانو پاداشتی زیان پێ گەیاندنیانە، بەڵام کارەکانی دادوەری بریتی یە لەهێنانەدی دادپەروەری (هەرکەسە مافی خۆی پێ بدرێت)، جێگیرکردنی یەکسانی (هاوسەنگی لەنێوانی مافەکانو پابەندبوونەکان)، جا هەرکەسێك مافی زیاتری پێ بدرێت وەك لە پابەندبوونەکانی، ئەوە بەستەمکارو زەوت کەری مافەکانی گەلەکەیو تاکەکانی کۆمەڵگەکەی ئەژمار دەکرێت، هەرکەسێکیش داوای پابەندبوونی زیاتری لێ بکرێ لەسەر مافەکانی ئەوە فێڵ لێ کراوو ستەم لێ کراوە لە کۆمەڵگەکەدا یاخود ئەو دەوڵەتەی کە نوێنەرایەتی دەکات، ئەگەر ئەو پەیوەست کارە خۆبەخش نەبێت لە هەستان بەو زیادانە.

هەروەکو فەلسەفەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بریتی یە لە چاککردنی تاوانبار بەزیندانیکردنیانو گۆڕینیان بۆ قوتابخانە چاکسازیەکان بەفێرکردنی زیندانی یەکانو حوکم دراوەکانو ڕاهێنان پێ کردنیان لەسەر فێرکردنو بەدەست هێنانی کارو پیشەو ڕۆشنبیریو هاوشێوەیان هەتا ببنە کەسانی چاك لە کۆمەڵگەکەیاندا، لەدوای

تەواوبوونی ماوەی حوكمەكەیان، بەڵام زیندانەكان بەبارودۆخی ئێستایان وا دەكەن لەتاون باری ئاسایی كە ببێتە تاوان باری ڕاهاتوو ببێتە قین لەدڵ تەنانەت لەخۆشی، لەبەر ئەوەی زیندان لەم سەدەی ئێستادا زۆر جیاوازییان نیە لە زیندانەكانی سەردەمە تاریكەكانی ڕابردوو هەروەها لەسەدەكانی ناوەڕاست.

ئەوەش شایەنی باسە كارە دادوەرییەكان هەموویان ڕێپێدراون ئەگەر نزیك نەبن لەكەمو كورتیو كەمتەرخەمی یاخود لایەنگیربوون لەسەر حیسابی دادپەروەریی.

لەبەر ئەوەی لەوئەركانەیە كە دەستورو یاسا لە هەموو وڵاتەكانی جیهان دا سەپاندویانە، جا لێپرسینەوە لەو كەسە ناكرێت كە هەستاوە بەكارە دادوەرییەكان نەسزاییو نە مەدەنی، مەگەر لەهەڵەیەك كە بەئەنقەست پێی هەستابێت بۆ دوورخستنەوە لەنێوانی بەرپرسیارێتیو ئەنجامدانی ئەركدا.

هەموو سزادانێكیش لەسزاكانی لاشەیی یاخود قەرەبوو كردنەوەی دارایی كە دادوەر بڕیاری لەسەردەدا دەبێتە ئەركێك كە دەستوورو یاسا دەی سەپێنێ بەسەریاو دوای ئەوەش لە هۆكارەكانی ڕێپێدان دەژمێردرێت.

جا ئەركی سەرشانی دادوەر لەهەموو ڕۆژگارو شوێنێكدا هێنانەدی دادپەروەریو یەكسانی یە ئەوەش ڕێژەیی نی یە هەروەكو زۆرێك لەزانایانی یاسا وای ڕادەگەیەنن، لەبەر ئەوەی ناوەڕۆكەكەی پێدانی هەركەسێكە بەوەی كە شایانێتی لەپاداشتی چاكە یاخود لەسزادان.

بەڵام لەلایەنی جێبەجێكردنەوە دەگونجێت كەداد پەروەری یەكە ڕێژەیی بێت، ئەگەر دادوەر بڕیاری دا بەسەر كەسێكدا بەزیاتر لەوەی كەشایانێتی لەپاداشت دانەوە یاخود بەكەمتر لەشیاوی خۆی لەسزادان، دادوەر خاوەنی دەسەڵاتی هەڵسەنگاندنە لەوزیادەیە یاخود لەوكەمە، ئەو كەمەش دەگونجێ دادپەروەرییەكی ڕێژەیی بێت لەتێڕوانینی زانایانی یاساوە، ئەگینا ئەو كارە لەدادوەرەكەوە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی نەنراوە دادپەروەری، بەڵكو دەستەواژەیەكی تری لێ ناوە، كە (الإحسان)ە، هەروەكو لەقورئانی پیرۆزدا دەقی لەسەر هاتووە، خوای پەروەردگار تیایدا فەرموویەتی: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ).

# جێباسی سێهەم:
# کارەکانی دەسەلاّتی جێبەجێکردن

کارەکانی دەسەلاّتی جێبەجێ کردن و ئەنجامدانیان بۆ دەسەلاّتەکەی لەسنووری یاسادا بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی کە دەستورو یاسا سەپاندویەتیو دادپەروەری داوای دەکات، ئەگەر جێبەجێ کار فەرمانبەرێك بێت یاخود ڕوولێنراوێك بێت بۆخزمەت کردنی گشتی بەشێوەیەکی بەردەوام یاخود کاتی لەبەرامبەر موچەیەکدا یاخود بەبێ موچە.

کارەکانی دەسەلاّتی جێبەجێکردن لە هۆکارەکانی ڕێپێدان ئەژمار دەکرێتو لێپرسینەوەی لەگەلّ ناکرێت، نەلەبواری سزادانو نەلە بواری مەدەنیدا، ئەگەر لەکاتی کاری جێبەجێ کردن دا ئەم مەرجانەی تیادابوو:

یەکەم: ئەبێت کارەکە لەلایەن کەسێکەوە دەرچێت لەلایەن کەسێکەوە کە سیفەتی فەرمانبەری گشتی یاخود تەکلیفی بەسەردا جێبەجێببێ بۆ خزمەت کردنی گشتی جێبەجێکاری بەوەی کەیاسا فەرمانی پێ کردووە، یاخود بەفەرمانی سەرۆکێك لە گوێڕایەلّی کردنی پێویست بێ، گەرچی ئەوە بەپێی ڕاوبۆچوونی جێبەجێکار بێ.

ئەوەی شایانی باسە کە یاساکانی سزادان[1] بەپێی ئەوەی کە زانیاریمان هەیە، باس نەکراوە بۆ پێناسەی فەرمانبەرێکی گشتی لەسەر بناغەی ئەوەی کە دەبێ بەزاراوەیەکی یاسایی پێناسە بکرێت لەکارێکی فیقهی یاسایی نەك هەر یاسا خۆی. دادوەری گرنگی داوە بەپێناسەی، بۆ نمونە دادگای بەرپەچ دانەوەی میسری[2]

---

[1] بەپێچەوانەی یاسای کارگێری.

[2] بڕوانە: د.محمود نجیب– سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە /١٧٣.

بەوە باس لەفەرمانبەری گشتی دەكات كە (هەركەسێك برێكی پێ سپێردرا لەدەسەڵاتی گشتی بەشێوەیەكی هەمیشەیی یاخود كاتیو بەپێی ناوەرۆكی یاساكان یاخود بەرنامەكان ئەو سیفەتەی پێ دەدات ئیتر ئەگەر لەگەنجینەی گشتی موچە وەربگرێت یاخود نا).

لەوپێناسەوە، ئەوە وەرگیراوە كە مەرجە بۆدانانی كەسێك بەكارمەندی گشتی كە بەكرداری هاوبەشی بكات، گەرچی بەبێ ڕەزامەندی خۆشی بێت، لەخزمەتێكی كارتیاكردنێكی گشتی دابێت كە دەوڵەت بەڕێوەی بەرێت، گەرچی ئەو هاوبەشی كردنەش خۆبەخشی بێت لەبەرامبەریدا موچەیەك وەرنەگرێت.

دوهەم: كە جێبەجێ كار دەسەڵاتی هەڵسەنگاندنی هەبێت، ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە كە یاسای كارگێڕی لایەكی گەورەی دەسەڵاتی هەڵسەنگاندنی تێدایە، هەروەكو یاسای بنەماكانی دادگایی كردنەكانی سزادان لەهەموو ولاتێكدا دەسەلاتی هەڵسەنگاندنی داوەتە ئەندامانی ڕێك خستنی دادوەریو دەستەی نوێنەرانی داواكارە گشتی یەكان لە كاتی ئەنجامدانی كارەكانی پشكنینو دەستگیركردنی تاوانبارانو پشكنینی ماڵەكانیانو هاوشێوەی ئەوانە.

سێهەم: دەبێت هۆكارێكی ڕەوای بێگومان هەبێت بەهانەبێت بۆ بەكارهێنانی دەسەلاتی هەڵسەنگاندن، لەبەرئەوەی ئەو كارەی ئەو فەرمانبەرە پێی هەڵدەستێ لەخۆی دا ڕەوا نیە، كە زیان دەگەیەنێ بەمافی خەڵكی، جا نە ڕەوایەو نە ڕێپێدراوە، ئەگەر پاڵ نەدات بەهۆكارێكی شەرعیو یاسایی كە ببیتە بەهانە بۆی، بۆ ڕەچاوكردنی بەرژەوەندی گشتی كە لەگەڵ بەرژەوەندی تایبەتی تاوانبار لەوبوارانەدا دژیەكن، لەبەر ئەوە یەكەم دەخرێتە پێش دوهەم.

چوارهەم: دەبێ ئەوكارەی كە دەسەڵاتی جێبەجێكردن ڕاستەوخۆ دەچێتە ناویەوە، پڕاوپڕی هاوشێوەی باری یاسایی بێت لەلایەنی شێوەو بابەتەوە.

پێنجەم: دەبێ فەرمانبەرەكە لەكارەكەیدا مەبەستی هێنانەدی ئامانجێك بێت، كە یاسا بۆ ئەو مەبەستە دەسەڵاتی پێدابێت، واتە: دەبێ ئامانجەكە ڕەوابێت، بۆ ئەوەی هۆكارەكەش بەو پێیە ڕەوابێ.

ئەوەی شایانی باسە ئەو مەرجە لەڕەگەزە مەعنەویەکانن لەیاسادا، جا پێویستە ویستی فەرمانبەرەکە بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستەبێ.

پوختەی قسە ئەوەیە: پێویستە فەرمانبەرەکە نێتی باش بێت، مەبەستی بەدی هێنانی ئامانجی یاساکەبێ، ئامانج لە ڕێپێدانی دەستگیرکردنی دەستدرێژکاران، دڵنیابوونە لە رانەکردنیان، ئامانجیش لەچوونە ناو ماڵێك یاخود شوێنێك بۆ فریاکەوتنی خێرا، زامنکردنی ژیانی ئەو کەسانەبێت کە بەهاواریانەوە دەچن.

ئەوەی شایانی باسە، نیەتباشی ئامانج ناپێکێت ئەگەر بکەرەکە دەسەڵاتی کەسانی تری زەوت کردبێت، جا لێکۆڵەر یاخود ئەفسەری پۆلیس یاخود کارپێ سپێردراوی بنکە، کە فەرمان دەکات بەڕوخاندنی دیواری ماڵێك یاخود شوێنێك، کە ناکرێت بەڵگەی نیەتباشی بکرێتە بیانوو، لەبەر ئەوەی کارێکی لەوجۆرە پەیوەندی نیە بە ئەرکەکانی یەوە هەتا بۆی دروست بێت کە لەسنووری ئەو ئەرکانە زیادەڕەوی دەکات بیانووی نیەتباشی بهێنێتەوە.

شەشەم: کارەکە لەگەڵ یاسادا گونجاوبێت، بەوەی دەبێ کارەکە لەچوارچێوەی ئەرکە جێبەجێکاریەکەی دابێت، یاخود وای بۆبچێتو بۆچونەکەشی لەسەر هۆکارە شیاوەکان دانرابێت، واتە بسەلمێت کە فەرمانبەرەکە یاخود تەکلیفکراوە کە بە خزمەتی گشتی لەکاتی جێبەجێکردنی کارەکەیدا هەوڵی دابێت، وەك چۆن کەسێکی ڕاهاتوو لەسەر کارەکەی و لە هەمان باردا هەوڵ دەدات.

ئەوەی شایانی باسە تایبەتمەندێتی لەیاسای گشتیدا بەرامبەرە بەشیاوی لەیاسای تایبەتی دا، جا پێویستە لەسەر فەرمانبەری ڕێگە پێ دراو کەلە ڕێپێدانەکەی دا زیادەڕەوی نەکات، ئەگەر مۆڵەتی پێ درا بۆ پشکنینی ماڵێك ڕێگەی پێ نەدراوە پشکینین بۆ خاوەنی ماڵەکە بکات، وە مۆڵەت پێ دانی بە پشکنینی خاوەنەکەی، مۆڵەتی پێ نەدراوە بیگرێت.

ئەو کەسەی قەدەغەی خۆپیشاندانەکانی پێ سپێردراوە، ئەگەر بە بەکارهێنانی هێزیش بێت، بۆ پاراستنی هێمنیو سەقامگیری گشتی، نابێتە بەهانە بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی، کە مەبەست پێی تێرکردنی ئارەزووی تۆڵەسەندن بێ، یاخود هێنانەدی بەرژەوەندی حیزبی بێت.

حه‌وته‌م: وه‌رگرتنی وریایی پێویست، بۆ به‌خشینی فه‌رمانبه‌ر له‌ لێپرسراوێتی ئه‌وه‌نده‌ به‌س نییه‌ كه‌ نیازی باشبوه‌و مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ نه‌بوه‌ زیان به‌كه‌سانی تر بگه‌یه‌نێ، وه‌ده‌بێ ئه‌و هۆكارانه‌ی كه‌پاڵی پێوه‌ ده‌نێ بۆ هه‌ستان به‌كاره‌كه‌، هۆكاری شیاون، ئه‌گه‌ر له‌كاتی ئه‌نجامدانی كاره‌كه‌یدا وریایی پێویستی وه‌رنه‌گرتبێ، له‌و باروبۆخه‌دا كاره‌كه‌ی ناڕه‌وایه‌و نایاسایی یه‌، به‌هۆی ئه‌وه‌وه‌ كه‌ كاره‌كه‌ی ده‌ستدرێژی كردنی تێدایه‌ بۆسه‌ر به‌رژه‌وه‌ندی‌و مافه‌كانی تاكه‌كه‌س.

پێم باشه‌ له‌كۆتایی ئه‌م جێباسه‌دا ئاماژه‌ بۆ دووخاڵ بكه‌م:

یه‌كه‌میان: ڕوونكردنه‌وه‌ی هه‌ڵه‌یه‌ك كه‌ یاسادانه‌ری عێراقی تێی كه‌وتووه‌، له‌كاتێكدا له‌ده‌قی بڕگه‌ی چوار له‌ مادده‌ی (٤١) له‌ یاسای سزادانی جێگیر[1] هاتووه‌ كه‌ (كاره‌ توندوتیژیه‌كان كه‌ ده‌كه‌وێته‌ سه‌ر ئه‌وكه‌سه‌ی تاوانێكی گه‌وره‌(جنایه‌) یاخود بچوكی(جنحه‌) ئاشكرای ئه‌نجام داوه‌، به‌مه‌به‌سته‌وه‌ بێت تاوانه‌(جنحه‌)) له‌بابه‌تی به‌كارهێنانی ماف، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا كه‌ له‌جۆره‌كانی ئه‌نجامدانی ئه‌ركه‌، هه‌روه‌كو ئاشكرایه‌ لای هه‌موو ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ كه‌مترینی شاره‌زاییان هه‌یه‌ به‌سروشتی ئه‌و كارانه‌ی ده‌چنه‌ ناو هۆكاره‌كانی ڕێپێدانه‌وه‌.[2]

دووهـه‌م: وا ده‌بیـنم حوكمـه‌كانی ئـه‌رك بـه‌جێهێنان له‌یاسـادا به‌سـه‌ركاری (حسبه‌)شـدا ده‌چه‌سـپێت، له‌بـه‌ر هۆكـارێكی هاوبـه‌ش كـه‌ پاراسـتنی به‌ژه‌وه‌نـدی گشتیه‌، ئه‌گه‌ر له‌ (حسبه‌)دا ڕه‌چاوی پایه‌و مه‌رجه‌كانی بكرێت وه‌ك له‌پێشتربه‌درێژی باسمانكرد.

---

[1] ژماره‌ ١١١ی ساڵی ١٩٦٩.

[2] له‌بابه‌تی مه‌رجه‌كانی ڕێپێدانی كاره‌كانی ده‌سـه‌ڵاتی جێبـه‌جێ كـاری سـه‌ردانی ئـه‌م سه‌رچـاوانه‌ بكه‌: شرح قانون العقوبات، قسم العام نوسینی دكتۆر محمود نجیب حسنی، لاپه‌ڕه‌/١٦٩و دوای ئه‌و لاپه‌ڕه‌یه‌ش.

شرح قانون العقوبات القسم العام، نوسینی دكتۆر محمود محمد مصـطفی لاپـه‌ڕه‌/١٦٣و دواتـر، مبادیء القسم العام من تشریح القضائی نوسینی دكتۆر رؤوف عبیـد لاپـه‌ڕه‌/١٥١و دواتـر، شـرح علی متون النصوص الجزائیة نوسینی استاذ محسن متجی لاپه‌ڕه‌/١٩٨و دواتر.

# بەشی هەشتەم

## ئەندازەی ڕەوایەتی كارە پزیشكیەكان

مەبەست لەكارە پزیشكیەكان ئەوانەن بەبێ دەستێوەردانی پزیشكە پسپۆڕەكان جێبەجێ نابن، جا لەبەر زۆری ئەم كارانەو نەبونی پرنسیب بۆیان، لەم فەسڵەدا تەنها لەسەر لێكۆڵینەوەی سێ بابەتی سەرەكی لەسێ شوێندا دەوەستین:

یەكەمیان: تایبەتدەكەین بۆ بنەماكانی رەوایەتی كارەپزیشكیەكان

دووهەم: بۆ ئەندازەی ڕەوایەتی بڕین و چاندنی پارچەی مرۆڤ

سێ هەم: حوكمی تەشریحكردنی جەنازەو حیكمەتەكەی.

# جێباسی یەکەم:
# بنەماکانی ڕەوایەتی کارە پزیشکی یەکان

بەڵگە نەویستەکە پێشکەوتنی ژیان بۆتە هۆی دۆزینەوە زانستی یەکانو پزیشکی یە نوێکان، ئەوانەش حوکمیان بڕیارەکانیان دەکەن بەئیجتیهادکردنی زانا تایبەت مەندەکان.

کارێکی بێ سوودە لەکتێبەکانی شەریعەتی کۆندا پشکنین بەدوای ئەو بڕیارانەدا بکەین، لەبەر ئەوەی ئەم شتە تازانە لەسەدەکانی پێشەواکانی شەریعەتدا بوونیان نەبووە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) هەتا لەڕێگەی ئیجتیهادەکانیانەوە بەدوای حوکمەکانیاندا بگەڕێن.

هەروەها ئاشکرایە کە قورئانی پیرۆز کۆتا دەستووری خوایی یە کۆکەرەوەیە بۆ هەموو دەستوورەکانی تری پێشووی خوای پەروەردگار.[1] وەك چۆن کاری دەستوورە دانراوەکان لە دەوڵەتانی جیهان دا بریتی یە لەپلانو نەخشەدانان بۆ ڕێکخستنی ژیانو کورت کردنەوە لەسەر ڕێساکانی هەمووەکیەکانو بنەما گشتی یەکان، و دەسەڵاتدان بە دەسەڵاتی یاسادانان بۆ دانانی یاساکان تا هەریەکێکیان چارەسەرکردنی لایەکی دیاری کراو لە پێویستی یەکانی ژیان بکات، بەو مەرجەی ئەو یاسایانە تێکنەگیرێن لەگەڵ ڕێسا دەستووریەکان.

---

[1] چەندین بڕیار هەن بەگۆڕانی ڕۆژگارو شوێنەکان ناگۆڕێنو جێگیرنو بێجگە لەوان هەڵدەوەشێنەوە (نسخ) هەروەکو لە دلیکانی بڕیارە تازەکاندا هاتووە کە لەگەڵ بەختەوەری خێزانی مرۆڤایەتی دا دەگونجێت هەتا ژیان لەسەر هەسارەی زەوی بەردەوام بێ.

هەروەها دەستووری خوایش بۆ كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی قسە لەسەر بەشەكانی بابەتەكان ناكات و ناچێتە ناو وردەكاریەكانەوە، بەڵكو لەسەر رێسا گشتی یەكان راوەستاوەو ژیری مرۆڤایەتی سەرپشك كردووە كە شتە وردەكان لە هەموو رۆژگارو شوێنێكدا بگەرێنێتەوە بۆ ئەو گشتیانە لەبەرتیشكی پێویستی یەكانی ژیاندا.

بازنەیەك لەرەفتاری بۆ ئادەمیزاد داناوە و لە زیاتر لە (٥٠) ئایەتی قورئانی دا فەرمانی كردووە بە جوڵاندنی ژیری مرۆڤایەتی بەپێی پێویستی یەكانی ژیان لەهەموو سەردەمێكدا، وە لە هەموو شوێنێكداو بەرەو پێش بردنی بەرەو چاكتر لەهەموو بوارەكاندا، بەمەرجێ ئەو جوڵەی ژیری یە لەناو ئەو بازنە رەفتاری یە دابێت.

وە ژیریش بەردەوام بێت لەسەر گۆرینی ئەو حوكمانەی لەسەر بەرژەوەندیەكانی مرۆڤایەتی دروستكراوە، هەر كە ئەو بەرژەوەندییانە گۆرا. هەوەكو رێسای گشتی شەرعی كە لەسەری رێك كەوتوون بریار دەدات كە (نكوڵی لەوە ناكرێ كە بریارەكان بەپێی گۆرینی رۆژگار بگۆرێن)[1]، ئەوەش حوكمە (الأعتقادية= بیروباوەرییەكان)و حوكمەكانی (العبادات= خواپەرستی یەكان) ناگرێتەوە، هەروەها ئەو حوكمانەش ناگرێتەوە كە دەقی قورئانی لەسەری هاتووە بە بەڵگەی سەلمێنراو و بێگومان.[2]

جا بەپێی ئەو راستی یانە هەرشتێك پەیوەندی هەبێت بەژیانی دنیایی، و لەسەر بەرژەوەندیە رەواكانی مرۆڤایەتی دامەزراوە، حوكمەكانی بەپێی گۆرینی ئەو بەرژەوەندیانەو پێش كەوتنی ژیان دەگۆرێن.

حوكمی كارە پزیشكی یە تازەكانو ئەوەی لە داهاتوودا روودەدات، یان لەرێسای دەقە گشتی یەكان (الكلية العامة) لە دەقەكانی قورئانی پیرۆزو سونەتی جێگر هەڵدەهێنرێت، یاخود لەكاتی نەبوونی بنەمای دەقیدا لە بنەما ئیجتیهادیەكان

---

[1] ماددەی /٣٩ لە گۆڤاری الأحكام العدلية.

[2] هەروەكو لە فەرموودەی خوای پەروەردگاردا هاتووە (يوصيكم الله في أولادكم للذكر مثل حظ الأنثيين) سوورەتی نیساء/١١، جا ئەو بریارە بە ئیجتیهادكردن هەموار كرنەوە وەرناگرێ، لەبەر ئەوەی بە نیشانەی بێگوامانو بەدەقی بێگومانی جێگی دەقی لەسەرە.

هەڵیاندەهێنین.

لە بنەما شەرعی گشتی یە دەقیەکان لە قورئانی پیرۆزدا: (فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ)[1].

لە بنەما دەقی یەکان لەسونەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ: (لا ضرر ولا ضرار).

لاضرر، واتە: نابێ بەبێ بوونی بەهانەیەکی شەرعی زیان بەکەس بگەیەنرێت.

ولا ضرار: واتە زیان بەزیان پێ گەیاندن لا نابرێت.

هەروەها لەو فەرموودانەی بەڵگەن لەسەر واجیبونی تیمارکردن: (تداووا عباد الله فإن الله لم يضع داءً الاوضع له دواء الا الهرم)[2]. واتە: ئەی بەندەکانی خوا خۆتان تیمار بکەن لەڕاستی دا خوای پەروەردگار هیچ دەردێکی دانەناوە کە دەرمانی بۆ دانەنابێ بێجگە لەپیری.

هەروەها فەرموودەی (من نفس عن مؤمن كربة من كرب الدنيا نفس الله عنه كربة من كرب يوم القيامة).[3] واتە: هەرکەسێك لەدنیادا خەمو خەفەتێك لەسەر باوەڕ دارێك لابەرێت، ئەوا خوای پەروەردگار یەکێك لەخەمو خەفەتەکانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر لادەبات.

لە بنەما ئیجتیهادیەکانیش کە زانایان لەسەری ڕێك کەوتوونو لە پێشەکی (مجلة الاحكام العدلية)دا هاتووە:

١- زیان لادەبرێت(ماددەی /٢٠).

٢- ناچاریەکان قەدەغەکان جائیز دەکەن (ماددەی /٢١).[4]

---

[1] سوورەتی بەقەرە /١٧٣.

[2] سنن ابن ماجه ٢/١١٣٧، ژمارەی فەرموودە /٣٤٣٦.

[3] صحيح مسلم ٤/٢٠٧٤.

[4] بنەڕەتی ڕێسای بەناوبانگ (الضرورات تبيح المحضورات= ناچاریەکان قەدەغەکان دەگونجێنێت)، بەڵام ئەو هەڵەیە باوە لەبەر ئەوەی ناچاری لەبەریەستەکانی بەرپرسیارێتی تاوان کاریەو لە هۆکارەکانی ڕێپێدان نیە، جا بەرپرسیارێتی تاوان کاریەو لە هۆکارەکانی ڕێپێدان نیە، جا بەرپرسیارێتی لاشەیی هەڵناگرێ، جا ڕاستی یەکەی (تجين)ە لەجیاتی (تبيح)و ←

٣- ناچارییەکان بەپێی ناچارییەکە دەپێورێت، واتە پێویستە لەو بڕەدا کورت بکرێتەوە کە پێویستە بۆ لابردنی ناچارییەکە.

٤- زیان بە هاوشێوەی خۆی لانابرێت (ماددەی /٢٥).

٥- زیانی تایبەت بەرگەدەگیرێت بۆ ڕێگەگرتن لە زیانی گشتی (ماددەی /٢٦).

٦- زیانی توند تر بەزیانی سوکەڵەتر لادەبرێت (ماددەی /٢٧).

٧- ئەگەر دوو خراپە بەرهەڵستی یەکبون، ڕەچاوی گەورەکەیان دەکرێت بۆ ئەنجام دانی سوکەڵەکەیان. (ماددەی /٢٨).

٨- لەنێوان دوو خراپەدا سوکەکەیان هەڵدەبژێررێت (ماددەی /٢٩).[١]

٩- دوورخستنەوەی خراپەکان لەپێشترە لە هێنانی کەڵکەکان (ماددەی /٣٠).

١٠- ئەگەر بەرژەوەندیەکی گشتیو بەرژەوەندیەکی تایبەتی بەریەکتری کەوتن یەکەمیان پێش دەخرێ بەسەر دوهەمیاندا.

١١- ئەگەر بەرژەوەندیەکی چەسپاو لەگەڵ بەرژەوەندیەکی نەچەسپاودا بەریەك تری کەوتن یەکەمیان پێش دەخرێ بەسەر دوهەمدا.

١٢- بەپێی توانا بەرپەچی زیان دەدرێتەوە (ماددەی /٣١).

١٣- پێویستی جێگای ناچاری گشتی یاخود تایبەتی دەگرێتەوە (ماددەی/٣٢).

١٤- ناچاری مافی خەڵکی بوچەڵ ناکاتەوە (ماددەی /٣٣).

١٥- ئەوەی کە پێویست(واجب)ی لەسەر بوەستێ، پێویستە(واجبە).

---

گونجاندنی لەکاتی ناچاری دا، دەبێتە مۆڵەت ئەگەر کەسێك سامانو دارایی کەسێکی لەژێر فشاری ناچاری دا خواردو پێویستە لەسەری قەرەبووی بکاتەوە، لەبەر ئەوەی ناچاری لەقەرەبوو کردنەوەدا مافی کەسانی تر پوچەڵ ناکاتەوە.

[١] ڕێسایەك لەدژی کە سوودبەخشە بۆ ناوەڕۆکی ڕێسایەك کە لە پێشیەوەیەتی وە لە ڕێکخستنەکانێتی، لەباربردنی منداڵ بۆ مەبەستی ڕزگارکردنی ژیانی دایکی کۆرپەلەکەو برینی ئەندامی کەسێکی توشی بوو بە شێر پەنجە بۆ پەرپەرچ دانەوەی بڵاو بوونەوەی.

١٦- هەر شتێك سوودی تاکەکەس یاخود کۆمەڵگە یاخود هەردوو لایانی تێدابێت، یان سوودەکەی لە زیانەکەی زیاتربوو ئەوە دروستە، ئەگەر ئەو سوودە لەسەر حسابی زیانی کەسانی تر نەبوو.

١٧- هەرشتێك زیانی تاکەکەس یاخود کۆمەڵگە یاخود هەردوو لایانی تێدابێت، یاخود زیانەکەی زیاتربێت لە سوودەکەی، ئەوە قەدەغەیە، ئەگەر ئەو زیانە سوودی گشتی تیادا نەبێت.[١]

ئەوەی شایانی باسە کە پێوەری جیاکەرەوە لەنێوانی سوودو زیان دا لەهەردوو بنەماکەدا، پێویستە بەپێی تەرازووی شەریعەتی ئیسلامو سیستمی گشتی دانرابێتو بەپێوەری کەسی ئەژمار ناکرێت.

[١] سزادانی تاوان بار زیانی خۆیو خێزانەکەی تێدایە، بەڵام ڕێگەی پێ دراوە، لەبەر ئەوەی هێمنیو پاراستنی ژیانو ماڵو سامانو ئابڕووی بێ تاوانانی تیادایە.
وە ئەو دوو ڕێسایەی دوایی لەبەرهەم هێنانی خۆمە لەگیانی شەریعەتی ئیسلامیو ئەو ژیری بە سەلامەتە دەرم هێناوە کە خوای پەروەردگار کردویەتیە هۆکار بۆ پێسپاردنی ئادەمیزاد بە بڕیارەکانی.

# جێباسی دووەم:
# بڕین و چاندنی ئەندامی ئادەمیزاد
# چەندە دروستە؟

ئەو کەلێنانەی دێنە بەرچاو بۆ بڕین‌و چاندنی ئەندامەکانی جەستەی ئادەمیزاد ئەمانەن:

یان دەگونجێ ئەو ئەندامانە دەستکرد بن‌و لەبێ گیانەکان دروست کرابن وەکو چاندنی ئەندامێکی دروستکراو لەمادەی پلاتین‌و کانزلیەکان بۆ نمونە لە جەستەی ئادەمیزاد دا، وەکو لە حاڵەتی شکاندن‌و شتی تریشدا ڕوودەدەن، یان لە بوونەوەرێکی زیندوو وەرگیراوبێت، ئەو بوونەوەرەش یان ئاژەڵە یان ئادەمیزادە، ئاژەڵەکەش یان گۆشتی دەخورێ یاخود نا، لەهەردوو حاڵەتەکەشدا یان زیندووە یاخود مردووە، یاخود لەحوکمی مردوواندایە، وەکو ئەو کەسەی بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەرچووە.

لەحاڵەتی ژیانیشدا یاخود ئەندامەکە لەهەمان کەس دا دەچێنرێت کە لێی وەرگیراوە، یاخود لە جەستەی کەسێکی تردا دەچێنرێت، وا لەو خوارەوە بڕیارەکانی ئەو کەلێنانە ڕوندەکەینەوە:

**یەکەم:** ئەگەر ئەندامەکان لەبێگیانەکان دروست کرابێتن لە کانزاو شتی تری وەکو پلاتین‌و هاوشێوەی، ئەوا چاندنەکە ڕێگەی پێ دراوە لە جەستەی ئادەمیزادێکدا کە پێویستی بەو چاندنە هەبێت، لەبەر ئەوەی کارێکی سوود بەخشە، دەبێتە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی ئادەمیزادێك یاخود دەبێتە هۆی پارێزگاری کردن لەسەر سەلامەتی

جەستەی یاخود جوانی یەکەی،و لەو چاندنەشدا هیچ زیانێك نیە بەکەسێکی تر بگات بەهۆیەوە، لەبەر ئەوە بەرێ پێ دراو دادەنرێ لەشەریعەتیش و لەیاساشدا.

بەڵام بەو مەرجەی کۆمەڵێك پزیشکی پسپۆڕ هەڵسن بەو کارە،و هەموو کارە پێویستی یەکانیشی بۆ گیرابێتە بەر بۆ قەدەغەکردنی زیانی لاوەکی و ئەنجامی نەرێنی.

دوهەم: ئەگەر ئەندامەکان وەرگیرابێتن لە بوونەوەرێکی زیندووی بێجگە لە ئادەمیزاد، ئەوا کارەکە بەدەر نیە لەیەکێك لەم دوو حاڵەتە:

حاڵەتی یەکەم: دەگونجێ ئاژەڵەکە لەدوای سەربڕینی گۆشتی بخورێت، لەو حاڵەتەدا بڕینی ئەندامێکی و چاندنی لە جەستەی ئادەمیزادێکدا کە پێویستی پێی بێ، لە بارێکدا کە هێشتا ئاژەڵەکە زیندوویێ، یاخود لەدوای سەربڕینی، کارێکی رێ پێدراوو رەوایە بەپێوەری ئەوەی کە خواردنی حەلاڵە.

بەڵام ئەگەر مردار بێت، ئەگەر ئەندامە وەرگیراوەکە لێی ئێسقانێك بێت یاخود گۆشت بێت یاخود لەحوکمی ئەمانەدا بێت وەکو شاخ و ددان، ئەوەش حوکمەکەی رێپێدان دەبێ، لەبەر ئەوەی حوکم لەسەر ئەو ئەندامە نادرێ بە پیسی. خۆ ئەگەر ئێسقان نەبوو لە بڕیاری ئەویشدا نەبوو، ئەوا رێ بە چاندنی نادرێت، ئەگەر ناچاری نەبێت، وەکو رزگارکردنی ژیانێك یاخود پاراستنی سەلامەتی یاخود گەڕاندنەوەی جوانی بۆ ئەو بارەی کە لەسەرەتاوە لەسەری بووە لە دەستکاری خوا، بەپێی ئەو ئایەتەی دەفەرمووێت: (فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ[1] فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ).

ئایەتی تریش هەیە لە قورئانی پیرۆزدا کە لەکاتی ناچاری دا قەدەغەکراوەکانی رێگە پێ دراوە.

حاڵەتی دوهەم: دەگونجێ ئاژەڵەکە گۆشتەکەی حەڵاڵ نەبێ، لەوکاتەدا دروست نیە چاندنی هیچ ئەندامێکی بەزیندویی یاخود بەمردویی لە جەستەی ئادەمیزادێك دا

---

[1] لەبری ناچاری تێ پەڕ ناکات، لەبەر ئەوەی ناچاریەکان بەبڕی پێویست مەزەندە دەکرێن.

لە حاڵەتەكانی فراوانی دا یاخود بوونی جێگرەوەیەكی دا، بەپێوەری ئەوەی خواردنی حەرامە.

بەڵام لە بارودۆخی ناچاری دا بۆ ڕزگاركردنی ژیانی كەسێك یاخود سەلامەتی جەستە، حوكمەكەی بریتیە لە دروستی، لەبەر ئەو ئایەتە پیرۆزەی كە باس كراو لەبەر فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی: (لاضرر ولا ضرار)و بەڕێسای (ناچاری دەچێتە شوێنی پێویستی گشتی یاخود تایبەتی) لەگەڵ ڕەچاوكردنی ڕێسای (ناچاریەكان بەبڕی خۆیان مەزەندە دەكرێن).

سێیەم: ئەگەر ئەندامەكان لە ئادەمیزادێكی زیندوو وەرگیرابوون ئەوا ئەو ئەگەرانەی كە دێن بەبیردا ئەمانەن.

١- ئەگەر ئەو ئەندامەی كە لە جەستەی ئادەمیزادێك وەردەگیرێ لەهەمان جەستەدا بچێنرێت، وەكو وەرگرتنی پارچەیەك لە پێستی لە شوێنێكی جەستەی بۆ پینەكردنی شوێنێكی تری بۆ پارێزگاری كردن لەو جوانیە خواییەكەی، یاخود وەرگرتنی خوێنهێنەرێك لەقاچی بۆ ئەوەی لەدڵیدا بیچێنن، یاخود هاوشێوەی ئەوە، ئەوا حوكمەكەی ڕێپێدانە لەبەر نەبوونی بەربەستێكی شەرعیو یاسایی. وە بەبوونی سوودو نەبوونی زیانێكی خودی یاخود دەرەكی، وە بەتایبەتی ئەگەر ئەو كارە بۆ ڕزگاركردنی ژیانی بوو یاخود بۆ پارێزگاری سەلامەتی جەستەی، یاخود گەڕانەوەی ئەو جوانی یەی كە بەهۆی ڕوداوێكی لابەلاوە شێواوە.

٢- ئەگەر مەبەست لەبڕینی ئەندامی ئادەمیزادێك بۆ ئەوە بێت كە لەجەستەی ئادەمیزادێكی تردا بچێنرێت، حوكمە شەرعیو یاسایی یەكەی بەم شێوە ڕێكدەخرێن:

أ- ئەگەر ئەو ئەندامە هاوتای نەبوو كە لەدوای بڕینی هەستێ بەكارەكەی، وەكو دڵو سپڵ و زراوو هاوشێوەیان، حوكمی ئەوانە بریتی یە لەوەی بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی پێ نادرێت، تەنانەت ئەگەر خاوەنی ئەندامەكەش ڕازی بێ

یاخود ڕازی نەبیّ، لەبەردوو هۆ:

یەکەم: ژیانی هەر ئادەمیزادێك تەنها بەتایبەتی مولکی خۆی نیە، هەتا مافی ئەوەی هەبیّ کە دەستی لیّ هەڵبگریّ، لەبەر ئەوەی ئەو بڕینەوەیە دەبێتە هۆی کۆتایی هێنان بەژیانی، ئەوەش وەکو خۆ کوشتن وەهایە، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ، ئەوەش بەشەرعو بەیاسا حەرامەو پێچەوانەی سیستمی گشتی یە.

هۆکاری دوهەمیش ئەوەیە کە کەسێك لەکەسێکی تر چاکتر نیە هەتا ئەندامی کەسێکی کەم بەها بگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی باشتر لەو، دروست نیە ژیانی یەکەم کەس بکرێتە قوربانی لەپێناوی ڕزگارکردنی ژیانی دوهەمدا. وە لەبەر ئەوەی بنەمای شەرعیو یاسایی بەوە دادوەری دەکا کە زیان بەزیان لاناچێت.

ئەوەی شایەنی باسە کە بڕینەوە لەدوای مردن، بەمەرج نەگیراوە کە دەبیّ ئەندامە کە هاوتای هەبێت کە بەکاری ئەو ئەندامە هەستیّ کە دەبڕدرێتەوە، لەبەر ئەوەی هۆکاری ئەو مەرجە بریتی یە لە پاراستنی ژیانی ئەو کەسەی کە ئەندامەکەی بەخشیوەو ژیانی بەخشەرەکەش نەماوەو بنەمای شەرعی گشتی دادوەری دەکات بەوەی کە (حوکم لەگەڵ بوونو نەبوونی هۆکارەکەیدا دەسوڕێتەوە).[1]

---

[1] ئەوە ڕێپێدانێکی شەرعی یە یاسا نویّ یەکان دانیان پیادلناوە، لەوانە یاسای ئەردەنی بۆ کەڵك وەرگرتن لە چاوەکان بۆ مەبەستە پزیشکی یەکان (٤٣)ی ساڵی ١٩٥٦ مادەی دوهەم کە دەق هاتووە لەسەر ئەوەی (بۆ هەرکەسێك هەیە کە خاوەنی جەستەیەك بێت بەشێوەیەکی ڕەوا کە مۆڵەت بدات بە لەڕەگەوە دەرهێنانی بیلبیلەی چاوەکەی لیّی، لەماوەی سیّ کاتژمێردا لەدوای مردنی، بەمەبەستی چاندنی بۆ نەخۆشێك کە پێویستی یەکی زۆری پیّی هەبێت، یاخود بۆ مەبەستی پاراستنی لە بانکی چاودا بۆ ئەو کاتەی پێویستی یان پیّی دەبێت.

ب– ئەگەر ئەندامەکە هاوتایەکی لە لەشدا هەبوو کە شوێنی بگرێتەوە، بە ئەنجامدانی ئەرکەکەی وەکو گورچیلە، ئەوە حوکمەکە بریتی یە لە ڕێپێدان بەم مەرجانەی خوارەوە:

١– دەبێ ناچاری یەك هەبێ کە پێویست بە بڕینەوەو چاندن بکاتو جێگرەوە(بدیل)ێکی نەبێ، لەبەر ئەوەی کارەکە لەخۆی داو لەباروبۆخێکی ئاسایی دا ڕەوا نی یە، مەگەر بۆ حاڵەتێکی ڕێزپەڕ لەبەر بەرژەوەندی نەخۆشەکە ڕێی پێ دەدرێت، بەپێی بنەمای (ناچاریەکان ڕێگە بە قەدەغەکراوەکان دەدەن).[1]

٢– دەبێ بڕینەوەکە بە ئەندازەی پێویستی ناچاریەکە بێت، لەبەر ئەوەی ناچاریەکان بە ئەندازەی خۆیان مەزەندە دەکرێن.

٣– دەبێ وازهێنان لە ئەندامەکە بەڕەزامەندی خاوەنەکەی بێت، خاوەنەکەشی پێگەیشتوو ژیرو بە ئارەزووی خۆی بێتو شیاوی پێبەخشینی هەبێت.

٤– پێویستە ڕەزامەندی نەخۆشەکە یاخود خاوەنی نەخۆشەکە یاخود سەرپەرشتیارەکەی وەریگیرێت، بەڵام لەباروبۆخی ناچاری داو نەخۆشەکە مەترسی مردنی لەسەر بێت یاخود توشی کەموکورییەکی بەردەوام بووبێ، ئەوا پزیشکی پسپۆڕ مافی ئەوەی هەیە کە بەبێ چاوەڕوانی ئەو ڕەزامەندیە خۆی تێهەڵبقورتێنێ، بۆی هەیە کە نەخۆشەکە ناچار بکات لەسەر چارەسەرکردنی، لەباروبۆخە ناچاریەکانداو لەکاتی مەترسی دا،

---

ئەوەش بەمەرجی ئەوەیە کە نەسەلمێنێ ئەوەی کە نیشانەبێ لەسەر ڕازی نەبوونی مردووە کە لەژیانی دا لەسەر ئەوەو هەروەها مەرجە کە ئەو کەسانەی کە پەیوەندی دارن پێوەی لەدوای مردنی ناڕازی نەبنو پزیشکی تایبەت مەندیش هەستن بەکاری نەشتەرگەری یەکە.

[1] یاسای چاندنی ئەندامەکانی ئادەمیزادی عێراقی ژمارە /٨٥ی ساڵی/١٩٨٦ دەق لەسەر ئەو مەرجە هاتووە، لە ماددەی یەکدا کە دەقەکەی دەڵێ: (دروستە ئەنجامدانی نەشتەرگەری چاندنی ئەندامەکانی ئادەمیزاد بۆ نەخۆشێك بەمەبەستی بەدی هێنانی بەرژەوەندیەکی چارەسەری پەسەند بۆیان کە بۆ پاراستنی ژیانی پێویست بێ).

لەبەر ئەوە رێپێدان ئەوەندە، بەسە کە یاسادانەر مۆڵەتی داوە ئەو پێش بوونی هەیە لەباروبۆخی ناچاریو بوونی مەترسی دا.

٥- نابێ هیچ مەترسی یەك هەبێت لەسەر خاوەنی ئەندامەکەو سەلامەتێتی لە بۆچوونی بەشی زۆری لیژنەی پزیشکی پسپۆڕ کە کاری نەشتەرگەریەکە ئەنجام دەدەن، بەپێی ئەو رێسا شەرعیو یاسایی یەی کە بڕیار بەوە دەدا کە (زیان بە هاوشێوەی خۆی لانابرێت).[1]

٦- دەبێ کاری برینەوەو چاندنەکە لەلایەن لیژنەیەکی تایبەتمەندەوە ئەنجام بدرێت، لەپاش پشکنینی نەخۆشەکەو دڵنیابوون لەوەی کە مەترسی نی یە لەسەر ژیانی ئەو کەسەی ئەندامەکە دەبەخشێ.[2]

٧- هەموو کارە پێویستی یەکان بگیرێتە بەر بۆ رێگەگرتن لە دەرئەنجامە خراپەکانی، دەبێ نەشتەرگەرییەکە لە نەخۆشخانەیەکی تایبەتی دا ئەنجام بدرێت، کە ئامێری تازەی تیادا بێت، کە توانای ئەوەیان هەبێت هۆکاری یارمەتی دەرین لەسەرکەوتنی نەشتەرگەریەکەدا، بە بەڵگەی ئەو بۆ رێسای سەرەتایی کە دەڵێ: (ئەوەی پێویستی لەسەر دامەزرێ پێویستە).

---

[1] بەڵام لەهەندێ لەیاساکان دا ئەگەر رەزامەندی بەخشەرەکە هەبوو، بەخشەرەکەش کەسێکی پێگەیشتووی ژیربوو ئەوا دروستە کاری چاندنو برینەوەکە ئەنجام بدرێت، لەگەڵ ئەوەشدا مەترسی لەسەر ژیانی بەخشەرەکە هەبێت، هەر وەکو دەق هەیە لەسەر ئەوە، لەیاسای سزادانی (ئیتالی)دا لە ماددەی (٥٠)دا (سزادان نی یە لەسەر ئەو کەسەی دەستدرێژی دەکاتە سەر مافی کەسانی تر یاخود دەیخاتە مەترسی یەوە، ئەگەر ئەو کارە بەڕەزامەندی خاوەن مافەکە بوو وە دروست بوو کە رەفتار لەمافی دا بکات).

[2] دەق هەیە لەسەر ئەو مەرجە، لە برگەی دووی ماددەی دوودا لەیاسای سووری ژمارە /٣٢ی ساڵی ١٩٧٢/دا لەبارەی چاندنی ئەندامی ئادەمیزادی یەوە کە دەڵێ: (لیژنەیەك کە لەسێ پزیشك پێك هاتبێ هەڵدەستن بە پشکنین بۆ ئەندام بەخشەکەو مەزەندەکردنی ئەوەی کە ئەگەر مۆڵەت دان هەبێ بە گواستنەوەی ئەندامێك لە جەستەیو مەترسی دروست ناکات لەسەر ژیانی).

٨- بەدیلی تری ڕەوا نەبێت، لەبەر ئەوەی بڕینەوەكە پێچەوانەی ئەسڵەو ئەم ئەسڵەش لەبارێكەوە نەگوڕێت بۆ بارێكی تر، مەگەر لەباروبۆخی ناچاریو جیاوازدا.

٩- دەبێ هۆكاری پاڵنەر بۆ كاری بڕینەوەو چاندنەكە، بریتی بێ لە چاك بوونەوەی نەخۆشەكەو ڕزگاركردنی ژیانی، یاخود پاراستنی سەلامەتی جەستەی.

ئەوەی شایانی باسە، پابەندبوونی پزیشك لە چارەسەركردن دا بەهێنانەدی چارەسەرەكە، پابەندبوونە بە هەوڵدانو چاودێری كردنی ورد، نەك بەهێنانەدی ئامانجەكە، لەبەر ئەوەی هەموو پێویستی یەكانی ئەو ئامانجە ناچێتە ژێر ویستی ئەو پزیشكەوە، جا ئەگەر نەشتەرگەریەكە سەركەوتوو نەبوو وە مەبەستەكەش نەهاتەدی، ئەوا بەرپرسیارێتی تاوانكاریو مەدەنی ناچێتە ئەستۆی پزیشكەكەوە ئەگەر كەمو كورتیو كەمتەرخەمی پزیشكەكە نەسەلمێنرێت.

١٠- نابێ وازهێنانی خاوەن ئەندامەكە لەبەرامبەری قەرەبوكردنەوەیەكدا بێت[1] بەڵكو پێویستە بەخشین بێت، لەبەر ئەم هۆیانەی كە دێت:

أ- لەقەرەبووكردنەوەدا جۆرێك لە بەسوكو بێ بەها زانینی تیادایە بۆ ئادەمیزادو زیانگەیاندنە بەو ڕێزەی كە خوای پەروەردگار بەخشیوێتی بە ئادەمیزاد، هەروەكو خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ

---

[1] ماددەی سێ لەیاسای نەشتەرگەری چاندنی ئەندامەكان لە عێراق دا دەق هەیە لەسەر ئەوەی (قەدەغەیە فرۆشتنو كڕینی ئەندامەكان بەهەر هۆیەك بێت، وە پزیشكی تایبەت مەند كە زانیاری هەبوو بەوە قەدەغەی ئەو كاری نەشتەرگەریەی لێ دەكرێت). هەروەها یاسای جازائیری بۆ پاراستنی تەندروستیو پێش خستنی ژمارە /٨٥ی ساڵی ١٩٨٥ ماددەی شەش.

مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا).[1]

ب- ئەندامەکانی ئادەمیزاد سامانێك نیە کە شایستە بیٚ بۆ مامەڵە پیٚ کردن، وە لە مەرجە دروستەکانی گۆڕینەوە بەشەرعو بەیاسا دەبیٚ هەریەکە لەدوو گۆڕێنراوەکان شایستەی مامەڵە پێوەکردن بیٚ.

ت- رێگەگرتن بەقەدەغەکردنی هۆکارێك کە دەگونجێت ببێتە ئەنجامێکی ناڕەوا بە کردنەوەی دەرگا کە لەبەردەم خەڵکی دا بۆ بازرگانی کردن بە ئەندامەکانی ئادەمیزادەوە بکاتەوە، رێکخراوی تەندروستی جیهانی بۆ دامەزراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان پشتگیری لەو راستی یە دەکەنو بانگەواز دەکەن بۆ قەدەغەکردنی فرۆشتنی ئەندامەکانی ئادەمیزادو وازهێنان لەو کارە، بەپیٚی ئەوەی لە بەکارهێنانی خراپو ناشیرین بۆ بازرگانی کردن پێوەیو ناردنە دەرەوەی لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو کردنی بە هۆکارێك بۆ پارەپەیداکردن بڵاوبۆتەوە، بە شێوەیەکی تایبەتیش لەوڵاتە هەژارەکان دا، کە ئەو بازرگانە دوور لە رەوشتو ئاکارانە بونیان هەیەو کردویانە بە بازاڕێکی هەرزان بۆ فرۆشتنی ئەندامەکانو پاشان ناردنیان بۆ نەخۆشخانەکانی جیهان، جا قەدەغەکردنی لەرێگای قەرەبووکردنەوە، بیروبۆچونێکە کە شەرعو یاساو ئاراستەی نێودەوڵەتی جێگیریان کردووە.

بەڵام قەدەغەکردنێکی شەرعی یاخود یاسایی نیە لەوەی کە ئەو کەسەی ئەندامەکەی پیٚ بەخشراوە، وەڵامێکی جوانی بداتەوەو خزمەتێکی دارایی یاخود جەستەیی پێشکەش بەو کەسە بکات کە ئەندامێکی جەستەی خۆی پیٚ بەخشیوە، ئەوەش جیاوازە لەرێسای قەدەغەکردن لەرێگای قەرەبووکردنەوەوە بەشەرعو یاسا بارودۆخێکی

[1] سوورەتی ئیسراء /٧٠.

ناچاری یه‌، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ڕزگاركردنی ژیانی نه‌خۆشه‌ كه‌ له‌سه‌ر چاندنی ئه‌و ئه‌ندامه‌ وه‌ستابوو نه‌ی ده‌توانی له‌سه‌رچاوه‌یه‌كی تره‌وه‌ ده‌ستی بكه‌وێ له‌ڕێی پێبه‌خشینه‌وه‌و خاوه‌نی ئه‌ندامه‌كه‌ش سوور بوو له‌سه‌ر ڕازی نه‌بوونی مه‌گه‌ر له‌ڕێگه‌ی قه‌ره‌بوو كردنیه‌وه‌، بێت له‌و كاته‌دا بڕیاره‌كه‌ ده‌گۆڕێ، له‌ قه‌ده‌غه‌كردنه‌وه‌ بۆ ڕه‌وایه‌تی، به‌كارپێكردنی ڕێسای ناچاریه‌كان ڕێ به‌قه‌ده‌غه‌كان ده‌ده‌ن.

١١- ده‌بێ باری ته‌ندروستی نه‌خۆشه‌كه‌ له‌ ئه‌نجامدانی نه‌شته‌رگه‌ریه‌كه‌ قبوڵبكات.[1]

**چواره‌م:** ئه‌گه‌ر ئه‌ندامه‌كه‌ كه‌ له‌ ئاده‌میزادێكی مردوو وه‌رگیرابوو بۆ ئه‌وه‌ی له‌ جه‌سته‌ی ئاده‌میزادێكی زیندوودا بچێنرێت، ئه‌وا بۆ ئه‌وه‌ی به‌ شه‌رعو به‌ یاسا ڕێ بدرێت پێویسته‌ ئه‌م مه‌رجانه‌ی تیادابێ.

١- ده‌بێ مردنه‌كه‌ی به‌ ڕاپۆرتی پزیشكی جێگیر كرابێ.

٢- ده‌بێ ناچاربوونێك هه‌بێ بۆ وه‌رگرتنی ئه‌ندامێك له‌و ئاده‌میزاده‌ مردووه‌ به‌ مه‌به‌ستی چاندنی له‌ ئاده‌میزادێكی زیندوودا.

٣- نابێ ئه‌ندامه‌كه‌ له‌و ئه‌ندامانه‌بێ كه‌ ده‌بێته‌ هۆی تێكه‌ڵ كردنی ڕه‌چه‌ڵه‌كو گواستنه‌وه‌ی بۆماوه‌ییه‌كان له‌كه‌سی یه‌كه‌مه‌وه‌ بۆ كه‌سی دووه‌م وه‌كو هێلكه‌دانو گون.

---

[1] برگه‌ی (٤) مادده‌ی یه‌كه‌م له‌یاسای ئادابی پزیشكی ژماره‌ (٢٨٨) كه‌ له‌ڕۆژنامه‌ی ڕه‌سمی ژماره‌/٩ له‌ ١٩٩٤/٣/٣دا بلاوكراوه‌ته‌وه‌ به‌دوو مه‌رج، ده‌و یازده‌، وه‌كو ئه‌مه‌: (٤- ده‌گونجێ دانی ئه‌ندامه‌كه‌ له‌ڕێگای به‌خشینه‌وه‌، به‌ خۆڕایی بێو مه‌رج دار نه‌بێ.
نابێت كاری نه‌شته‌رگه‌ری بۆ ئه‌و كه‌سه‌ ئه‌نجام بدرێت كه‌بارودۆخی ته‌ندروستی، ڕێگه‌ی پێ نادات، یاخود له‌بارودۆخی ئه‌وه‌دایه‌ كه‌ له‌ئه‌نجام دانی نه‌شته‌رگه‌ریه‌كه‌دا مه‌ترسی یه‌كی تازه‌ هه‌ڕه‌شه‌ له‌ته‌ندروستی بكات.

٤- نەشێواندنی جەستەی مردووەکەو فراوان نەکردن لەدابڕینی ئەندامەکانی لەبەر ئەوەی بنەڕەت لە گواستنەوەدا قەدەغەیە، بۆ جیاوازی یەك کە ناچاری بێ ڕێی پێ دراوە، ناچاریش بەبڕی خۆی مەزەندە دەکرێ.

**پێنجەم:** بڕینی ئەندامەکانی ئەو کەسەی کە لە حوکمی مردوودایە وەکو حاڵەتی مردنی دەماغ.

ئاشکرایە کە دەماغ لەسێ بەش پێك هاتووە کە ئەمانەن:

١- (مۆخ) کە بنکەی بیرکردنەوەو هۆش‌و هەست کردنە.

٢- (المخیخ) دەشوترێ (موخەیخ= مێشکۆکە): کاری ئەم بەشە بریتی یە لە هاوسەنگی جەستەیی.

٣- (جزع المخ= شانەی مێشك) بریتی یە لەبنکەی بناوان بۆ هەناسەدان‌و (تحکم) فەرمان کردن بە دڵ‌و سوڕانی خوێن.

ئاشکراشە ئەگەر مێشك‌و مێشکۆلە لەبەشەکانی دەماغ مرد، ئەوا ئادەمیزادەکە دەتوانێ بژی بە ژیانێکی نائاسایی، ئەوە پێی دەوترێ ژیانی ڕووەکی یاخود قۆناغی دوای لەهۆش خۆچوون.

بەڵام مردنی (جذع الدماغ= شانەی دەماغ) ڕای بڵاو لەلای زۆربەی پزیشکە تایبەت مەندەکان، بریتییە لە کۆتایی ژیان کە تیایدا دڵ‌و هەناسەدان لەدوای لابردنی ئامێری بوژانەوەی دڵ بەتەواوی دەوەستن.

## حوکمی بڕینی ئەندامی ئەوکەسەی کەلە حوکمی مردوودایە لەپێش مردنی کۆتایی دا:

حوکمەکەی دروستنەبونەلەبەر دوو هۆ:

یەکەمیان: مردن لەشەریعەتی ئیسلامی دا بریتی یە لە جیابوونەوەی گیان لە جەستە، ئەوەش لەوبارەدا نایەتە دی، هێشتا ئەو کەسە خاوەنی ئەندامەکانی لاشەی‌و ماڵ‌و سامان‌و هاوسەری خۆیەتی، نابێ میراتییەکەی دابەشبکرێ‌و ژنەکەی

(عیده= چاوەڕوانی) بكێشێ‌و مێردی تر بكاتەوە، هەرچەندە ئەو بارودۆخەی درێـژە بكێشێ.

دوهەمیان: لەبەر ئەوەی بڕینەوەی ئەندام زیان بە شـكۆی كەسـەكە دەگەیـەنێ، لەبەر ئەوە بەبێ مۆڵـەت وەرگـرتن لـە خاوەنەكـەی یـاخود لـەمیراتگرەكانی ڕێگـەی پێنـادرێ، جـا مۆڵـەتی خـۆی ئـەژمار نـاكرێ لەبـەر ئـەوەی هۆشـی نییـە كەواتـە شایستەییشی نییە، هەروەها مۆڵەتی میراتگرەكانیشـی ئـەژمار نـاكرێ لەبەرئـەوەی خاوەنی ئەوە نین كە ڕەفتار لەماڵ‌و سامانیان بكەن، ئیتر چۆن دەتـوانن ڕەفتـار لـە ئەندامەكانی لاشەیدا بكەن.

لێرەدا پرسیارێك لەسەر دێتە ئاراوە، ئەوەش ئەوەیە ئەگەر مێشك مرد، بەڵام دڵی هێشتا بەئامێری دەست كرد كاردەكات، ئایا دەبێ لای بەرێ؟ وەڵام ئەمەیە كەدێت:

١- ڕێگە دەدرێ ئامێرەكە لابرێت ئەگەر نەخۆشەكە بەویستی خـوای پـەروەردگار تەندروستی چاكبوەوە، چونكە خوای پەروەردگار توانای هەیە بەسـەر هـەموو شتێكدا، كەواتە لابردنی ئامێرەكـە لـەپێش ئـەوەدا، لابردنەكـەی بـەبێ بەهانـە دادەنرێت بە كوشتنی بوونە هۆكار.

٢- لابردنی ئامێرەكە بۆ ڕزگاركردنی ژیانی كەسێكی تر ڕێگەی پـێ نـادرێ لـەپێش دڵنیابوون لەمردنی لەبەر نەبوونی جیاوازی لەنێوان ئادەمیزادێك‌و ئادەمیزادێكی تردا لەبەر ئەوەی ژیانی هەریەكەیان بەشەرع‌و بەیاسا پارێزراوە.

٣- لەبارودۆخی نائومێدبوون بەبڕیارێك لە لیژنەی پزیشـكی تایبەتـەوە، و لەوێشـدا نەخۆشێكی تر هەیە كە ڕزگاركردنی ژیانی لەسەر ئەو ئامێرە وەستاوە‌و ئامێری تری لەو جۆرەش نیە، لەوكاتەدا ڕێگە پێدراوە كە لەلایەن پزیشكە تایبەتی یەوە لابرێـت بـەپێی ئـەو ڕێسـایەكی شـەرعی‌و یاسـایی كـە دەڵـێ: (ئەگـەر دوو

بەرژەوەنـدی پێکیایانـدادا، یـەکێکیان بـەدیهاتووە(محقق) ئـەوی تریشـیان گومانهەڵگرە(احتمالیە)، ئەوا یەکەمیان پێش دەخرێت.[1]

## بریاری برینەوەی ئەندامی کەسێک کە بریاری لەسێدارەدانی بۆ دەرچووە:

ئەو کەسەی فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرچووە لەبەر هۆکاری شەرعیو یاسایی، کە ئەوە پێویست دەکات و، سەرۆکی وڵاتیش حوکمەکەی پەسەند کردووەو ڕۆژی دیاری کراویش دانراوە بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکە، ڕێگەنادرێ بەبرینەوەی هیچ ئەندامێك لە ئەندامەکانی، گەرچی پێش جێبەجێکردنی بریارەکە بەماوەیەکی کەمیش بێت، مەگەر بەرەزامەندی ڕاشکاوی نوسراوی خۆی، لەسەر بناغەی وەسێتکردن بۆ ئەو ئەندامە، چونکە ڕێگە دەدرێت وەسیەت بکات لە بێجگە لەدارایی، گەرچی ئەندامێکی لەشیش بێت لە ئەندامە ناسەرەکی یەکان، سەرەڕای ئەوەی حوکمی مردووی هەیە، لەبەر ئەوەی گەرچی حوکم دراوەکە بەئەنجامدانی تاوانێك ژیانی خۆی بەزایەداوە، بەڵام خۆ ئەو ڕێزەی کە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوە بەزایەی نەداوە.

جا بۆڕێزگرتن لەو قەدرەی کە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوە، ڕێگە نادرێت بەبرینەوەی هیچ ئەندامێك لێی، مەگەر بە ڕەزامەندی ڕاشکاوانەی خۆی، بەو مەرجەی دەبێ لەکاتی ڕەزامەندی یەکەیدا پێگەشتو ژیرو هۆشیاربێتو بەویستی خۆی بێ‌و ناچارنەکرابێ لەسەر ئەو ڕەزامەندییەی.

---

[1] لەجێبەجێ کردنی ئەو ڕێسایەدا ڕێگە دراوە بریار بدرێت بە مردنی ون بووەکە . بەرژەوەندی ژنە جێگیرەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەیاری دەکات لەگەڵ بەرژەوەندی مێردەون بووەکەیدا، لەبەر ئەوەی لەوانەیە لەژیاندا مابێت، لەبەر ئەوەی ئەو بەرژەوەندییە لەرانەیی یە هەروەها ڕێگە دراوە بۆ لەباربردنی کۆرپەلەیەك لەپێناوی ڕزگارکردنی ژیانی دایکی دا، لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی ژیانی دایکەکە جێگیرەو بەرژەوەندی ژیانی کۆرپەلەکە لەوانەیی یە.

## ڕاسپاردن بە ئەندامەکانی ئادەمیزاد

لە شەریعەتی ئیسلامیدا ڕێگە دراوە بە وەسیەت کردن بەدارایی‌و بێجگە لەداراییش، ئەگەر مەرجە شەرعی یەکان هەبوون بۆ وەسیەت کردن بەوەی کە وەسیەت کار شایستەبێ بۆ بەخشین، وەسیەت پێ کراوەکەش شەرعی بێت‌و وەسیەت بۆکراوەکەی شایستەبێ بۆ ئەو وەسیەت بۆکردنە.

یاسا شێوەییەکانیش[1] مەرجیان داناوە بۆ ئەو وەسیەتە لەلایەنی چەسپاندنەوە، نەك لەلایەنی تەندروستی یەوە.

## حوکمی گواستنەوەی خوێن لەجەستەی کەسێکەوە بۆ جەستەی کەسێکی تر

حوکمەکە بریتی لەڕێپێدان بەم مەرجانە:

١- ڕەزامەندی خاوەنی خوێنەکە، کە ئەو خاوەنی بەخشینەکە.

٢- پێشەکی پشکنین بۆ خوێنەکە بکرێت‌و دەسەڵاتی پێدرابێ بۆ گواستنەوەی بۆ جەستەی ئەو نەخۆشەی کە پێویستی پێیەتی.

٣- دەبێ بەبێ بەرامبەر بێ، مەگەر لەبارودۆخێکدا کە دەست نەکەوێ مەگەر بە بەرامبەرێك.

٤- پێویستی ناچاری بەو خوێنە هەبێت.

٥- نابێ خوێنێکی ڕژاوبێ، ڕژاو ئەوەیە کە ئەو خوێنە لەشوێنی جێگیری خۆی بێتە دەرەوەو بکەوێتەبەر هەوا، لەبەر ئەوەی لە پزیشکی تازەدا سەلماوەکە خوێن

[1] لەو یاسایانەش یاسای چاندنی ئەندامی عێراقی (ماددەی /٢/١) ئەو کەسەی بەخشینی پێ دەکات یاخود ڕاسپاردەی پێ دەکات لەکاتی ژیانی دا، مەرجەکە شایستەی تەواوی هەبێت لەکاتی بەخشین، بەخشین یاخود (الأیصاء) بەدان پیانانی نوسەر.

بەپیت ترینی ناوەندە بۆ گەشەکردنی میکرۆب، بێجگە لەوەی دەرهاویشتەی زەهراوی هەڵدەگرن، جا ئەگەر ئەو خوێنە نەرژابێ ئەوا رێپێ دراوە کە ئادەمیزادێك لەگەڵ گۆشت یاخود ئێسقان بیدات، یاخود بەوەی لە جەستەی کەسێکەوە رابکێشرێت بۆ شوشەیەك و لەوێوە بۆ کەسێکی تر، هەروەکو ئەوەی لەسەدەی نوێ دا لەنەخۆش خانەکاندا پەیرەو دەکرێت.

## حوکمی جوانکاریی

نەشتەرگەری جوانکاریی بەرێکەوتنی شەرع زانانی بواری شەریعەتی ئیسلامی رێگەی پێدراوە، ئەگەر گۆرین بۆ دروست کراوی خوای پەروەردگار تیایدا نەبێت.

جا لابردنی برۆو دانانی برۆی دەست کرد لەشوێنی دا یاخود بێجگە لەوەش بەپێی شەرع رێگەی پێ نەدراوە لەبەر ئەوەی گۆرینی تێدایە بۆ دروست کراوی خوای پەروەردگار بۆیاخکردنی لێوو نینۆکەکان حەرامن و رێگەیان پێ نەدراوە، ئیتر هەر هۆکارێك پاڵنەری بێت، لەبەر ئەوەی داپۆشەری قەدەغەی گەیاندنی ئاو دەکات بۆ جەستە، هەرکەسێك خۆی شۆرد بۆ لابردنی لەش گرانی و دەست نوێژ گرتن، ئەوا بەتاڵەو دانامەزرێ و نوێژەکەش بەتاڵە.

بەڵام ئەگەر مەبەست لە نەشتەرگەری جوانکاریەکە چاکسازی کردن بێت لە ئەندامێکی جەستەدا بۆ پێدانەوەی شێوە سروشتی یەکەی، وەکو جیاکردنەوەی دوو پەنجەی بەیەکەوە نوساو، یاخود لابردنی پەنجەی شەشەمی زیادە ئەوەش لەراستی یەکەی دا بریتی یە لەکارە چارەسەری یەکان لەولایەنەدا کە رزگارکردنی جەستەیە لە روداوێکی ناسروشتی.

هەروەها رای جیاواز نی یە لەرێپێدان بۆ جوان کاری بۆ لابردنی شوێنەواری سوتاوی و شتی تر، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار جوانەو جوانیشی خۆش دەوێ.

# جێباسی سێهەم:
# حوكمی توێكاری مردوو و فەلسەفەكەی

بنەما ئەوەیە كە ڕێگە پێ نەدراوە، لەبەر ئەوەی توێكاری مردوو سروشت و ڕێگاكەی هەرجۆرێك بێ زیان گەیاندنی تیایدایە بە شكۆداری یەكەی، ئادەمیزاد لەهەردوو باروبۆخی ژیان و مردنیشی دا وەكو یەك لەلای خوای پەروەردگارەوە ڕێزی لێ گیراوە، جا پێویستە لەدوای مردنیشی شكۆدارو ڕێزدار بكرێ، وەكو چۆن لەدنیادا شكۆدارو ڕێز لێ گیراو بووە.

بەڵام شەریعەتی ئیسلامی لەزیاتر لە (٥٠) ئایەتی قورئانی پیرۆزدا فێرمان دەكات كە ژیری و هاوسەنگی بەكار بێنین لەنێوانی ئەو بەرژەوەندییانەدا كە بەر یەكتری دەكەون و پێش خستنی گرنگترینیان بەسەر گرنگەكەیان داو ڕێ كردن لەگەڵ كاروانی شارستانی یەتی مرۆڤایەتی دا، لەبەرچاو گرتنی گرنگی پێ دانی تازەكاری یەكان لە زانستیداو نەوەستانەوە لەدژی هەر تازە گەری یەك مەگەر لەدوای بەراوردكردن لەنێوانی زیانەكانی و سوودەكانی داو سەلمێنرا كە زیانەكانی زۆرترە لە چاكەكانی، جا ئەگەر لە تاقیكردنەوە زانستی یەكانەوە دەركەوت كە دۆزراوە زانستی یە تازەكە سوودەكانی زیاترن لە زیانەكانی ئەوا لەسەر موفتی (فتوادەر) پێویستە بێ دوودڵی فەتوا بدات بەڕێپێدانی، بەمەرجی پابەند بوون بە دیسپلین و ڕەچاوكردنی پەیوەستەكانی و ئەو مەرجانەی كە بە تەرازووی شەریعەت دیاری دەكرێن.

## مەرجەکانی توێکاری پزیشکی

بۆ ڕەوایەتی کاری توێکاری چەند مەرجێك هەن، ئەمانە لە گرنگەکانن:

١- دەبێ زۆر پێویست بێتو بەرژەوەندی ڕەوا هەبێ بۆ پێویست بە کاری توێکاری لاشەی مردووەکە.

٢- لەکاتی ژیانی ئەو مردووەدا ڕەزامەندی وەرگیرابێت، یاخود لەدوای مردنی ڕەزامەندی کەسو کاری، ڕەزامەندی یەکی ڕاشکاوو ئاشکراو دوور لەزۆر لێ کردنی ئەدەبی ماددی.

٣- پێویستە پزیشکانی تایبەتمەند هەستن بەو کارەو پێویستە لەسەریان ڕێگای زانستی پەیڕەو بکەن لەو کارەدا.

٤- دەبێ هۆکاری پاڵ نەر بۆ ئەنجامدانی توێکاریەکە.خزمەت کردنی بەرژەوەندی یەکانی خەڵکی زیندووبێ.

٥- پێویستە توێکاری یەکە بەپێی پێویستی بێت، لەبەر ئەوەی ڕێپێدانی ناچاریە (الأستثناء) ناچاریش واپێویست دەکات کە بە ئەندازەی پێویست بێت.

## حیکمەتی ڕەوایەتی توێکاریی:[1]

توێکاری پێویستە بۆ هەموو بارودۆخەکانی مردنی گوماناوی چەسپاندنی بۆ ئەم مەبەستانە:

### ٢- جیاکردنەوەی هۆکاری ڕاستەوخۆ لەناڕاستەوخۆ بۆ مردن

لە هۆکارە ڕاستەوخۆکان: دەبێ زیانو قەبارەی برینەکەی ئەوەندەبن کە خاوەنەکەی بمرێت وەکو خوێن بەربوونی مێشك یاخود تەقینی هاوشێوەکانیان، بۆ نمونە: ئەگەر گریمان کەسێك ئامرازێکی تیژی کرد بەکەسێکی تردا، ئەویش بەهۆی

[1] لەو بابەتەدا بڕوانە: الطب العدلی علماً وتطبیقاً. نوسینی دکتۆر وصیفی محمد علی، چاپی المعارف، چاپی یەکەم /١٩٧٢، لاپەڕە ١/٧٦و دواتری.

ئەوەوە مردو لەدوای توێكاری ڕوون بویەوە كە ئامڕازە بەكارهاتووەكە زیانی گەورەی گەیاندووە لەدەستدرێژی یەكەدا، ئەوەش دادەنرێ بەهۆكاری ڕاستەوخۆ لە مردنی دەستدرێژی بۆ سەركراوەكە.

لە هۆكارە ناڕاستەوخۆكاندا هەموو تێكدانێك كە لەجەستەدا ڕوودەدات، بەشێوەیەك بەتەنیا بەس نەبێت بۆ ڕوودانی مردنەكە، بەڵكو بەهۆی ڕودانی حاڵەتێكی نەخۆشی كەسی یەوە بوە كەتوش بووەكە لەپێش ڕوودانی تاوانەكەدا هەیبوە، بوەتە هۆی مردنی، هەروەها هۆكاری تری ناڕاستەوخۆ وەكو دەرخستنی پەیوەندی هۆكاری لەنێوان كاریتاوانەكەو ئەنجامەكەیدا، وەكو دەرخستنی پەیوەندی هۆكاری لەنێوان كاری تاوانەكەو ئەنجامەكەیدا، وەكو كەمتەرخەمی لە چارەسەرو دەرئەنجامی خراپو بەپێی ئەوە لەسەر پزیشكەكە پێویستە كە وردبێت لە جیاكردنەوە لەنێوانی هۆكاری ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆدا بۆ جیاوازی قەبارەی ئەو سزایەی بەپێی شەرعو یاسا لە هەردو بارەكەدا مەزەندە دەكرێت بۆ تاوان كارەكە.

**٢- دیاری كردنی ئەندازەی بەرپرسیاریتی بكوژەكە:**

لەڕێگای توێكاری یەوە پزیشك دەتوانێ حاڵەتی تایبەتی پێشكەش بكات بە بەڵگەی زانستی، بۆ ڕوون كردنەوەی لێكۆڵینەوە، ئەو بەڵگانەش ئەو پەڕی گرنگی یان هەیە لەو لایەنەوە كە دادوەر بەرچاوی ڕۆشن دەبێ بۆ دەركردنی حوكمی دادوەری، وە ئەو بەڵگە هونەریانە یارمەتی دەرن لەسەر بەسزادان بۆ تاوان بار یاخود بێ تاوان كردنی ناڕەوا یاخود سوكەڵە كردنی حوكم لەسەری.

هەروەكو پزیشكەكە توانای ئەوەی هەیە كە هەستێ بە نەشتەرگەری توێكاری دیاری كردنی هەر ئامێرێكی بریندارکەر بەتەنیا، ئەگەر چەند ئامڕازێك بەكار هاتبوو، وە لەلایەنی زیاتر لەیەك كەس كە هاوبەشی یان كردبوو لە تاوانەكەدا، پاشان دیاری كردنی پەیوەندی زیانی هەر ئامێرێك بە تەندروستی كەسە توش بووەكە یاخود بەهۆی مردنی یەوە، بەدوادا چوون بۆ بارودۆخی ئەوەی كە ڕووی داوەو سروشتی تاوانەكە بكات.

**٣- کەم تەرخەمی چارەسەریی**

پزیشکەکە بۆ دادوەری لێکۆڵینەوە هەموو کەمتەرخەمی یەکی چارەسەری، ڕوون دەکاتەوە، پاشان بڕیاردەدا لەسەر ئەندازەی پەیوەندیەکەی بەهۆی مردنەکەوەو بەو پێیە هەندێ لەولآتان[١] یاسایان داناوە کە قەدەغەی پزیشکی دادوەری دەکات لە ئەنجامدانی پیشەکەی بەشێوەیەکی لەبەر بەریەککەوتنی تایبەت بۆ سیفەتی ڕاوێژکاری‌و سیفەتی چارەسەری.

**٤- شاردنەوەی نیشانەکانی تاوانەکە؛**

ئاشکرایە کە تاوانبار هەوڵ دەدا بۆ سەر لێشێواندنی دادوەری لێکۆڵینەوە بەو هۆکارە جیاوازانەی کە بڵاون‌و هەیە، وەکو ئەوەی ماددەی نەوت بڕێژێ بەسەر جەستەی تاوان لەسەر کراوەکەدلو بیسوتێنێ تاسەر بشێوێنێ لە پزیشکی داوەری لەڕێگای توێ کاریەکەیەوە، بۆ ئەوەی کە سوتاوێ یەکە بەشێوەی فراوان بووەو پەیوەندی نیە بەڕوداوی مردنەکەوە، یاخود بکوژ هەڵدەستێ بەهەڵواسینی جەستەی مردووەکە، بۆ ئەوەی دادوەر وا خەیاڵ بکات کە کەسەکە بە خنکاندنی خۆی خۆی لەناوبردووە، بەڵام پزیشکی دادوەری دەتوانێ جیاوازی بکات لەنێوانی ڕاستی دلو لەوەدا کەتاوان بارەکە پێی هەستاوە لە شاردنەوەی ڕوداوە ڕاستی یەکەو سەرلێشێواندنی لێکۆڵەرەوەکە یاخود دادوەرەکە.

**٥- زیندویتی پێکانەکە**

ئەم حاڵەتە بەزیندویەتی پێکانەکە ناو دەبرێت (یاخود بە چالاکی) ئەگەر لە جەستەیەکی زیندوودا ڕووی دا، وە بەتوێکاری جەستەکە پزیشکەکە دەتوانێ زیندوێتی‌و کاریگەریی چالاکی برینەکە لەنەبوونی دیاری بکات، هەروەها لە هەمان کاتیشدا هۆکاری مردنە ڕاستی یەکە بسەلمێنێ.

---

[١] هەروەکو لە کۆماری میسری عەرەبی هەیە کە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو یاسایەدا کەلە عێراق دا هەیە لەو بارەیەوە.

له نمونەی ئـەم حاڵەتـەدا، ڕوداوێكـی تاوانكـاریی ڕویـدا، دەسـتەی لێكۆڵینـەوەو لەناویشیاندا پزیشكی دادوەری بانگكرا بۆ پشـكنینی تەرمەكـه، دەوتـرا ئـەو كەسـه بەقەزاو قەدەر سوتاوه، بەڵام لەئەنجامی پشكنینی ڕواڵەتی دەركەوت كه سوتاویەكه لەهەندێك بەشی دیـاری كـراوی جەسـتەی قوربـانی یەكـەدا بەزینـدوویی بـووەو، لـه بەشەكانی تردا بەزیندوویی نەبووه، توێكاری پزیشـكی دادوەری بـوونی شـوێنەواری برینی لەناو دەمی دا دەرخست، ئەوەش ڕواڵەتەكەی بەڵگەیه لەسەر ئەوەی شتێكی نەرم بەتوندی خراوەته ناو دەمیەوه وەك پارچـه قوماشـێك، هـەروەها پشـكنینەكه دەری خست بەزیندوویی ئامێری برینداركەر بەر سەری كەوتووه، وەكو تەور. لەدوای پێش كەش كردنی ئەو زانیاریه توێكاریانه بۆ دادوەری لێكۆڵینەوه، كارەكەی بۆ ڕوون بوەوه، ئەوەش لەدوای هەوڵ دانو دۆزینەوەی ئەوەی كه لەڕوداوه ئاڵۆزەكه ئاشكرا دەكات، كاتێ كه بكوژەكه دەست گیر دەكرێت، دان بەوەدا دەنێت كه یەشماخێكی خستۆته ناو دەمی تاوان لەسەركراوەكه بۆ ئـەوەی كـەس نـەتوانێ فریـای بكـەوتن، پاشان چەند جارێك بەتەور كێشاوێتی بەسەری داو، لەئاگردانەكه ئاگری كردۆتـەوه، لەدوای ئەوەی كه گومانی ئەوەی كردووه كه مردووه، سەری كوژراوەكـەی لـه ئـاگر نزیك كردۆتەوه. هەروەها ئەوەش دەركەوت بۆ پزیشكی دادوەری كه لەو كاتەدا توش بووەكه لەبارودۆخی بورانـەوەدا بـووه، ئـەوەش لـەڕێگای بینینـی شـوێنی سـوتاوی بەزیندوویی.

پاشـان دەركـەوتووه كەلـه دوای ڕووداوەكـه كەسـێك چـووەته ژوورەوەو یەشماخەكەی لەدەمی كوژراوەكه دەرهێناوەو هەناسەدانی دەست كردی بۆ كردووه، كه وای گومان بردووه هێشتا لەژیان دا ماوەو نەمردووه، پاشان لەبارەی ڕوداوەكەوه هەواڵی داوەته پۆلیس.[1]

---

[1] بڕوانه الطب العدلی وتطبیق، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕه /١/٧٧.

٦- دیاری کردنی ئاڕاستەی بەرکەوتنەکە

لەوانەیە داوا بکرێت لە پزیشکی دادوەری کە ئاڕاستەی بەرکەوتنەکە لە جەستەدا دیاری بکات، بۆ سوود وەرگرتن لێی بۆ ناسینی ئەو دوو دەستەی کە ئامێرە بریندار کەرەکەیان پێ گرتووە، هەروەکو لەحاڵەتی خۆ کوشتندا یاخود تاوانکاریدا یا لەحاڵەتی داتاشراو (دروستکراو) بۆ تێگەیشتن لە شوێنی تاوان کارەکە، کە ئایا لە ئاڕاستەی بەرزتر یاخود لەئاستی نزم تر لەکوژراوەکە بووە یاخود لەپێشەوە یان لەدواوە، یان لەلا تەنیشتەوە لێی داوە، ئەوەش بۆ جیاکردنەوە لەنێوانی خۆکوشتنو دەستدرێژی کردنە سەری تاوان کارانەدا.

٧- دیاری کردنی ئامێرە بریندار کەرەکە

لەزۆر حاڵەتەکاندا پزیشکی دادوەری دەتوانێ بەپشت بەستن بەسیفاتی زیانەکانو شێوەکانیانو فراوانیو قوڵیو ئاڕاستەکەی ئەوە هەڵێنجێ کە ئامێرە بڕەرەکە یەك دەمی هەبووە یاخود دووان، ئایا ئامێرەکە شێوە لاکێشەیی بووە یاخود بازنەیی شێوەیەکی دیاری کراوی تری هەبووە، ئامێرە ئاگرینەکە یەك شوێنی بۆ تێ گرتنی هەبووە وەکو تفەنگو دەمانچە، یاخود زیاتری هەبووە، وەکو چەکی ڕاوکردن ئاشکراشە دیاری کردنی ئەو ئامێرەی بۆ تاوانەکە بەکار هاتووە ڕۆڵی گرنگی هەیە لەدیاری کردنی قەبارەی لێدانەکە، بەپشتبەستن بە ئەندازەی مەترسیو تاوانبارەکە لە ئەنجامدانی تاوانەکەیدا.[1]

٨- چۆنیتی ڕوودانی بەرکەوتنەکە:

لەزۆربەی ڕووداوەکاندا توێکاری پزیشکی یارمەتی دەرە لە دەرئەنجامی سەرچاوەی زیانەکانو زانینی ئامێرەکەی، بۆ نمونە: لەڕوداوێکی ئۆتۆمبێلدا ئامانجەکە زانینی چۆنیەتی ڕودانی بەرکەوتنەکەیە، ئایا لەئەنجامی خێرایی

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئۆتۆمبێله‌كه‌دا ڕووی داوه یاخود له‌كه‌وتنه خواره‌وه لێوه‌ی، یان ئه‌نجامی فشارێكی قورس بوه بۆ سه‌ر جه‌سته‌ی، كاتی گه‌ڕانه‌وه‌ی ئۆتۆمبیله‌كه بۆ دواوه كه كردویه‌تی به‌ژێره‌وه، هاوشێوه‌ی ئه‌وه، ئه‌وه‌ش بواری به‌رپرسیارێتیو كه‌مته‌رخه‌می شۆفێره‌كه دیاری ده‌كاتو جگه له‌وه‌ش ئه‌ندازه‌ی هۆكاربوونی بۆ مردنه‌كه.

### ٩- مه‌زه‌نده‌كردنی حاڵه‌تی ته‌ندروستی

حاڵه‌تی ته‌ندروستی مردووه‌كه له‌سه‌ر ئه‌وه دیاری ده‌كرێ كه پزیشكی توێكاری پێش كه‌شی ده‌كات له مه‌زه‌نده‌كردنی دا كه كۆمه‌ڵێك تێڕوانینی توێ كاریو پشكنینی تاقیگای له‌خۆگرتووه، كه پشتیان پێ ده‌به‌ستێ، ئاشكراشه ئه‌و حاڵه‌ته سه‌باره‌ت به فه‌رمانگه ڕه‌سمیو نیمچه ڕه‌سمی یه‌كانو كۆمپانیاكانی دڵنیاكردن له‌بابه‌تی پابه‌ندبونیان به پێدانی قه‌زه‌بووكردنه‌وه‌ی دارایی بۆ میراتگره‌كانی مردووه‌كه پێویسته، له‌دوای ئه‌وه‌ی دڵنیابوون له‌وه‌ی مردنه‌كه به‌شێوه‌یه‌كی ڕاسته‌وخۆ یاخود ناڕاسته‌وخۆ له‌ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا بووه كه كرێكاره‌كه ته‌زووی كاره‌با لێی داوه له‌كاتی هه‌ستانی دا به‌چاك كردنی هه‌ندێ له ته‌له‌كان یان شی تر.

له‌و حاڵه‌ته‌دا كه پزیشكه‌كه نه‌خۆشینێكی تری بۆ ده‌رده‌كه‌وێت، له‌سه‌ری پێویسته په‌یوه‌ندی یه‌كه‌ی به‌هۆكاری مردنه‌كه‌وه ڕوون بكاته‌وه.[١]

[١] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانه: سه‌رچاوه‌ی پێشوو ١/٧٢ — ٧٩.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (١٣) ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ(١٤) ثُمَّ إِنَّكُمْ بَعْدَ ذَلِكَ لَمَيِّتُونَ (١٥) ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ).[١]

ئەو دەقە خواییە پێمان دەڵێ: ئادەمیزاد بە نۆقۆناغ دا تێدەپەڕێ:

قۆناغی یەکەم: بنەڕەتێك لەقوڕ، واتە: پوختەیەك لەقوڕ.

دوهەم: تۆو پیتاندن.

سێهەم (العلقة): پارچەیەك خوێنی مەییو- خوێن پارە.

چوارهەم (المضغة): پارچەیەك گۆشت بە ئەندازەی پارویەك.

پێنجەم: قوناغی پێك هاتنی ئێسك.

شەشەم: داپۆشینی ئێسکەکە بە گۆشت، لەپاش تێپەڕبوونی (١٢٠) ڕۆژ لەسەر پیتاندنەکە، وەکو لەبواری پزیشکیو زانستی نوێ دا سەلماوەو جێگیربوە.

حەوتەم: قوناغی گۆڕان لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر، لەژیانی ڕووەکیو ئاژەڵی یەوە بۆ قۆناغی ئادەمیزادی، ئەو قوناغەش مەبەست لەو فەرمودەیەی خوای پەروەردگارە: (ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ).

قوناغی هەشتەم: مردنە لەدوای ئەو قوناغە دوای هاتووە.

نۆهەم: گەڕانەوەی ژیان لەدوای مردن لەژیانی کۆتایی دا.

ئەم قوناغانەش هەروەکو ئاشکرایە، سیانیان لەدەروەی ڕەحمە، شەشیشیان لەناویەتی، بڕینی ڕۆشتنی لە هەریەکێك لەم قۆناغانە، ئەوەیە کە پێی دەڵێن: لەباربردن یان لەبارخستن.

توێژینەوەکەمان لەو بابەتە دوو جێباسی لەخۆی گرتووە یەکەمیان تایبەت دەکرێ بە پێناسە بۆ لەبارچوونو دوهەمیش حوکمی لەبارچوون.

---

[١] سوورەتی مئمینون ١٢ – ١٦.

# جێباسی یەکەم:
# پێناسەی لەباربردن

لەباربردن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر مەترسیدارە، کە ڕووبەڕووی خێزانەکانی مرۆڤایەتی دەبێتەوەو قوربانیەکانی ئەو دیاریدەیەش، ساڵانە بە ملیۆنەها کۆرپەلەو هەزاران دایك مەزەندە دەکرێن.

لەباربردن گیروگرفتێکە چارەسەرکردنی ڕاجیایی لەسەرە لەنێوانی پیاوانی فیکرو یاساو پزیشكو ڕەوشتو ئاکارو کۆمەڵناسیو ئابوری ڕاجیایی لەسەرە، بەو بۆنەیەوە لەنێوان سەردەمو سەردەمێکی تردا کۆنگرەو کۆڕی ڕاوێژی زانستی بۆ دەگیرێ لەسەر ئەندازەی ڕەوایەتی هەڵوەشاندنەوە یاخود هەموارکردنەوەی یاساکانی قەدەغەکردن یان موقەیەدکاری لەباربردن بەپێی گۆڕان کاریەکانی ژیان.

بێجگە لەوە بیردۆزی تری فەلسەفی هەیە دوودڵە لەنێوانی پەسەند کردنی مافی دایك لە نەویستنی دایکایەتی لەبەر هەر هۆیەك بێت، وە مافی کۆرپەلە لەتەواو بوونو لەدایك بوونیو ژیاندا، مافی کۆمەڵگە لەپێك هاتنی نەوەی تازە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کەوتراونو دەوترێن، لەڕاو بۆچونەکانو ئیجتیهادو پێشنیارەکان لەبارەی لەباربردنەوە، لەباربردن خۆی لەخۆی دا کارێکی ناپەسەندو نەویستراوە لە دینیشداو لەیاساشداو بەپێی عەقڵو ژیریو حیکمەتو سروشتی پاکیش.

ئەی چۆن نا؟ کە هەموو شەریعەتەکانی خوای پەروەردگاری بێ هاوبەشو تەنانەت لەدینە دەستکردە کۆنەکانیشداو لەیاساکانی ئاشووریەکانو بابلیەکانیش دا لەباربردن حەرام دەکەن کە فەرمانیش دەکەن بە کوشتنی کچێکی تاوانبار، ئەگەر لەبار بردنەکە ببێتە هۆی مردنی دایکە سك پڕەکە.

هـه‌روه‌ها ڕێنماییـه‌كانی هیندیـه‌كان‌و بـوزی‌و زه‌رده‌شـتیه‌كانیش‌و فه‌لسـه‌فه‌ی ئیغریقییه‌كان‌و پیـاوانی یاسـای ڕۆمـانی‌و ئـه‌و یاسـایانه‌ش كـه كاریگـه‌ری یاسـاكانی كه‌نیسه‌یان به‌سه‌ره‌وه‌یه له‌باربردنیان به‌حه‌رام داناوه.

(ئه‌بو قراط)ی پزیشكی یونانی دكتۆره‌كانی په‌یوه‌ست ده‌كرد، لـه‌پێش ئـه‌نجام دانی كاری پزیشكی یان دا سوێندیان ده‌خوارد كه ڕێنومایی هیچ كه‌سـێك نه‌كـه‌ن بـۆ له‌باربردنی كۆرپه‌لـه‌و ده‌رمـانی لـه‌باربردنیش نه‌ده‌نـه كـه‌س‌و لـه‌و باره‌شـه‌وه گـوێ بیستی كه‌س نه‌بن، جا له‌دوای ئه‌و پێشه‌كی یه ئایا هه‌ڵوێستی شه‌یعه‌تی ئیسـلامی‌و خۆرئاوا چی یه له‌سه‌ر ئه‌و كه‌سانه‌ی هه‌ڵده‌ستن به‌كاری له‌باربردن.

هه‌وڵ ده‌ده‌م وه‌ڵامـی ئـه‌و پرسـیاره بده‌مـه‌وه به‌خسـتنه‌ڕووی كورته‌یـه‌ك لـه‌ڕاو بۆچـوونی شـه‌رع زانـانی مه‌زهه‌بـه‌كان شـه‌رعیه ناسـراوه‌كان‌و یاسـاكانی سـزادانه عه‌ره‌بیـه‌كان، بـه كـورت كردنـه‌وه له‌سـه‌ر خاڵـه گرنگـه ده‌وه‌سـتم كـه بایه‌خـدارن‌و لێكچون‌و جیاوازیی نێوان ئه‌و مه‌زهه‌ب‌و یاسایانه‌ش ڕونده‌كه‌مه‌وه.

## مه‌به‌ست له له‌باربردن چیه‌؟

لـه‌باربردن (له‌بارخسـتن) زاراوه‌یه‌كـه ئـاڵۆزی لـه‌خۆی ده‌گرێـت، له‌بـه‌ر ئـه‌وه‌ی هاوبه‌شێكی مه‌عنه‌وی یه له‌نێوانی هه‌موو قوناغه‌كانی كاروانی ژیانـدا لـه‌پێش لـه‌دایك بوونه‌وه به‌ده‌ست پێ كردنی له تۆوێكی پیتێنراوه‌وه تـا كۆتـایی هـاتنی بـه قونـاغی ئاماده‌بوون بۆ له‌دایك بوون.

له‌به‌ر ئه‌وه زانایانی شه‌ریعه‌ت‌و پیاوانی یاساو زانایانی پزیشكی، یه‌ك وته نـین بـۆ وه‌ڵام دانه‌وه‌ی ئه‌و پرسیارانه: كه‌ی حه‌مل (سك) داده‌نرێـت بـه كۆرپه‌لـه؟ وه كـه‌ی ده‌بێته شوێنی تاوان كردن؟ ئایا یـه‌ك جـۆر سـزادان هه‌یـه بـۆ وه‌سـتاندنی كـاروانی سروشتیی سك پڕی له هه‌موو قوناغه‌كان دا؟ یاخود هه‌تا ماوه‌كه له‌دایك بوون نزیكتر بێته‌وه سزادانه‌كه‌ش زیاتر ده‌بێت؟

زانایانی شه‌ریعه‌تی ئیسلامی تیایاندا هه‌یه جیاوازی كردووه له‌نێوانی پێش هاتنی گیان‌و دوای گیان كردن به به‌ریداو وتویانه كۆرپه‌له له‌پێش ئه‌وه‌دا كه گیانی بكرێ به

بەردا گیان دار (نفس) نیە تاکو ئەو فەرموودەیەی خوای پەروەردگار بیـان گرێتـەوە کە فەرموویەتی: (وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ).[1]

هەشیانە جیاوازی نەکردووە لەنێوانی ئەو دوو حاڵەتەدا لە ڕووی حەرام کردنەوە، مەگەر بە قەبارەی تاوانەکەو سزادانەکە نەبێت، هەروەها پیـاوانی یاسـاو پزیشـکیش هەمان هەڵوێستیان هەیە، تیایاندایـە تێگەیشـتنێکی فراوانـی گشـت گیریـان داوەتـە زاراوەی لەباربردن بۆ پێش گیان بەبەردا کردن‌و دوای گیان بە بەردا کردن‌و وتویانە: لەباربردن بریتی یە لەدەرهێنانی کۆرپەلە لـەپێش کـاتی خـۆی دا، ئـیتر ئـەو منداڵـە کەڵکی لەژیان ببێ یاخود نا، جا دەرکردنی هێلکەی پیتێنراو لەبارچوونە.

هەشیانە وتویەتی بریتی یە لـە دانـانی کۆرپەلـە لـەپێش هـاتنی کـاتی خـۆی دا، بەکارێکی تاوان کاری لەپاش ئەوەی ژیانی تیادا جێگیر بوو.

**لە قەناعەتی ئەو بەندەی خوایەدا.**

مانای زاراوەی بۆ کۆرپەلە دوور نی یە لەمانای زمانەوانی یەوە لەهەموو شتێکەوە دووە، لەبەر ئەوی وەرگیراوی ماددەی (جن) بەکار ناهێنرێت مەگەر لەو شتانەدا کـە نابینرێن وەکو (جن)و (الجنە)و (الجنـان)و (القلـب)و هاوشـێوەی ئەوانـە، جـا مانـای زاراوە بۆ (الجنین= کۆرپەلە) ئەوەیە کە لەسکی دایکدایە لەهەموو قۆناغەکانیا ئـەوە پێی دەڵێن (جنین).

(لەباربردن) بریتیە لەوەستاندنی کاوانی سروشتی بۆ سك پڕی (حمل) کـە ببێتـە هۆی لەناوچوونی کۆرپەلەکە.

بکەرەکەشی لێی دەپرسرێتەوە لەدینیشەوەو لەدادگاشەوە لەبەر ئەوەی کوشتنی کەسێکە، ئیتر بەهەڵە بێت یاخود بەئەنقەست بـێ، حـاڵی وەکـو حـاڵی دوای لـەدایك بوون وایە، بەڵام سزاکە لەدوو حاڵەتەکەدا دەگۆڕێت، لەپێش ئەوەدا کە گیانی بەبەردا بکرێت تەنها لەدین دا لێی دەپرسرێتەوە، ئەگەر دەستدرێژی کاری یەکە ڕاستەوخۆبێ

[1] سوورەتی ئەنعام/١٥١.

یاخود بەهۆكار بێت، ئەوەش لەبەردەمی خوادایە، لەبەر ئەوەی بەبێ بەهانە بەكارێكی ناڕەوا هەستاوە، ئەوەی ڕوخاندووە كە خوای پەروەردگار بەبەردی بناغە بۆ دروست كردنی ئادەمیزادێك دایناوە، بەلاّم بەسزادانی دیاری كراوی دنیایی سزا نادرێت كە لە قورئانی پیرۆزدا لەتۆڵە سەندنەوەو خوێن بایی و كەفارەت، دایناوە لەبەر ئەوەی كەسێكی نەكوشتووەو گیانێكی لەجەستە دەرنەكردووە، بەڵكو دەگونجێ سزا بدرێت بە سزایەكی ڕوشكێنی ئەگەی كارەكەی بەهانە دار نەبێ بە بەهانەیەكی شەرعی.

## سەرچاوەكانی حەرام كردن و سزادانی لەباربردن:

سەرچاوەكان لە شەریعەتی ئیسلامی دا:

### ١- قورئانی پیرۆز:

أ- سەبارەت بەوەی لەپێش ئەوەدا كە گیانی بەبەردا بكرێت، ڕوخاندنی بەدیهێنانی خوای پەروەردگارە.

(ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا) ئاشكرایە كە بەدیهێنانی لەخوای پەروەردگارەوە بۆ گاڵتە كردن نیە، هەوەكو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا).[1]

ب-سەبارەت بەو كۆرپەلەیەی كە لەدوای ئەوە گیان دەكرێ بەبەریاو جێگیر دەبێ، لەبار بەرەكەی ئەو ئایەتانە دەی گرێتەوە كە باس لە كوشتن و تۆڵە سەندنەوەو خوێن بایی دەكەن، لەوانە فەرموودەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ)[2] هەروەها فەرموودەی خوای پەروەردگار: (وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ

---

[1] سورەتی موئمینون /١١٥.

[2] سورەتی ئەنعام /١٥١.

وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ)[1] وە فەرموودەی خوای پەروەردگار: (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى).[2]

**٢- سونەتی پێغەمبەر ﷺ:**

لەسەر زمانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەی صەحیح زۆرە، لەبارەی حەرام کردنو سزای لەباربردنەوەو، لەوانە: ئەو فەرمودەیەی کە ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویێتی یەوە کە (قضى رسول الله ﷺ في جنين إمرأة من بني لحيان سقط ميتاً بغرة (اى عبد أو أمة[3])[4] هتروقها (اقتتلت امرأتان من هذيل فرمت احداها الأخرى بحجر فقتلها وما في بطنها فتخاصموا الى رسول الله ﷺ فقضى أن دية جنيها غرة (عبد أو وليدة) وقضى بدية المرأة على عاقلتها).

دوو ژنی هوزەیلیەکان بو بەشەڕیان، یەکێکیان بەردێکی دا لەویانو خۆیو سکەکەشی کوشت، کێشەکەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ئەویش فەرمانیکرد کە خوێنی کوپەکەی بەندەیەك یان کەنیزەکێکەو فەرمانیشیدا کە خوێنی ژنەکەش لەسەر باوانیەتی.

## سەرچاوەکانی حەرام کردن لەیاسادا

بەپێی ئەو ڕێسایەی کە دەڵێ: (تاوانو سزادان نیە مەگەر بەپێی دەقێك، سەرچاوەی حەرام کردنی لەباربردن لە یاساکانی سزاداندا دەبێت.

---

[1] سوورەتی نیساء /٩٢.

[2] سوورەتی بەقەرە /١٧٨.

[3] پێغەمبەری خوا لەسەر ژنێکی بەنی لحیان کە کورپەلەکەی لەباربرابوو حوکمیکرد بە بەندەیەك یان کەنیزەکێك قەرەبوو بکرێتەوە.

[4] فیل الأوطار للشوكاني /٧/٧٨.

# جێباسی دووهه‌م:
# حوكمی له‌باربردن

بۆ زانینی ئه‌و حوكمه‌ پێویسته‌ جۆره‌كانی له‌باربردن بزانرێت:

له‌باربردن له‌باره‌ی ڕۆڵی ئیداره‌ تیایداو مه‌به‌ستی تاوان كاریه‌كه‌ وه‌ دابه‌ش ده‌بێت بۆ سێ جۆر:

## جۆری یه‌كه‌م: له‌باربردنی سروشتی، یاخود خۆنه‌ویستی:

له‌بارچوونی سروشتی بریتی یه‌ له‌و له‌بارچوونه‌ی كه‌ بۆخۆی ڕووده‌داتو به‌بێ ئه‌وه‌ی كه‌سێك بیه‌وێت ئه‌و حاڵه‌ته‌ ڕوبداتو خۆی تێ هه‌ڵبقورتێنێ كه‌ به‌هۆی چه‌ند هۆكارێكه‌وه‌ ڕوو ده‌دات ده‌گونجێ نادیار بن یاخود ئاشكرابن، له‌وانه‌: نه‌خۆشی دایكه‌كه‌ یاخود كۆرپه‌له‌كه‌ یاخود وێڵاشه‌كه‌ كه‌ ببێته‌ هۆی له‌بارچوون، جیاوازیش نیه‌ له‌نێوانی شه‌ریعه‌تی ئیسلامیو یاسای پزیشكی دا، له‌وجۆره‌ له‌بارچوو ملنانه‌ كه‌ یاساكانی سزادان نایانگرێته‌وه‌، نه‌تاوانه‌و نه‌ سزای هه‌یه‌، به‌ڵكو له‌بارچوونێكی ڕێ پێ دراوه‌.

## جۆری دووهه‌م: له‌باربردنی پزیشكی (چاره‌سه‌ر):

ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ناچار بوون بۆ ڕزگاركردنی ژیانی دایكه‌كه‌ پێویستی ده‌كاتو ئه‌و جۆره‌یان ڕه‌وایه‌، نه‌یاری ناكرێت مه‌گه‌ر كه‌سێك حساب بۆ نه‌یاریه‌كه‌ی ناكرێت، جا ئه‌وه‌ یاخود ڕێ پێ دراوه‌، لێپرسراوێتی سزادانو مه‌ده‌نیش نیه‌ له‌سه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ی هه‌ڵده‌ستێ به‌كاری له‌باربردنه‌كه‌، یان سزای له‌سه‌ر نی یه‌ ئه‌گه‌ر ئه‌م مه‌رجانه‌ی تیادابوو:

١- ئەگەر لەلایەنی لیژنەیەکی پزیشکی تایبەتی یەوە سەلمێنرا کە کۆرپەلەکە مەترسی هەیە بۆ سەر ژیانی دایکەکە.

٢- ئەگەر ئەو مەترسی یە تەندروستی یە کە هاتۆتە ئاراوە بەهۆی بوونی کۆرپەلەکەوە بوو یاخود بەهۆی مانەوەیەوە لەڕەحمەکەدا بێ.

٣- ئەگەر رێگایەکی تر نەبوو بۆ رزگارکردنی ژیانی دایکەکە بێجگە لەباربردنی سکەکە.

٤- دەبێ کاری لەباربردنەکە لەژێر چاودێری پزیشکانی تایبەت مەند دابێت و لەو نەخۆشخانەدا بێ کە پێویستی یەکانی لەباربردنیان تیادابێ و قەدەغەی رووداني دەرئەنجامی خراپیش بکات.

**بەڵگە شەرعی و یاسایی یەکان لەسەر رێپێدانی لەباربردنی چارەسەری:**

لەگەڵ ئەوەشدا کە زانایانی شەرع زانا بەڕاشکاوانە باس لەو جۆرە لەباربردنە ناکەن، بەڵام رێساکانی شەریعەتی گشتی کە لەقورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەری خوا ﷺدا هاتوە بەڵگەیە لەسەر رێپێدانی، هەروەها رێسای (ئەگەر دوو زیان بەریەککەوتن، ئاسانەکەیان هەڵبژێرێت بۆ دوورخستنەوەی مەترسی دارەکەیان).

جگە لەوەش ئەم بەڵگە عەقڵیانەمان هەیە:

١- لەڕاستی دا دایك ئەسڵی کۆرپەلەکەیەو کۆرپەلەکە لقێکە لەو، قوربانیش نادرێت بەئەسڵ لەپێناوی مانەوەی لقەکەدا.

٢- ژیانی دایك راوەستاوەو جێگیرەو چەسپاوە، بەڵام ژیانی کۆرپەلە لەپێش لەدایکبووندا، دەگونجێ بە زیندوویی لەدایك ببیّ و دەشگونجێ بە مردوویی لەدایکببێ، رێسا گشتی یەکەش بریاردەدا لەپێشخستنی بەرژەوەندیە جێگیرەکە بەسەر ئەو بەرژەوەندییەدا ئەگەر هەیە لە حاڵەتی دژیونیاندا.

٣- دایك خاوەنی کەسێتی شەرعی و یاساییەکی چەسپاوە، بەپێچەوانەی کۆرپەلەکەوە.

٤- زۆربەی کات مردنی دایك دەبێتە هۆی مردنی کۆرپەلەکە، ئەگەر لەپێش لەدایك

بوونی كۆرپەلەكە بمرێت.

٥- لەكۆتایی دا ئایا مەرجە ڕەزامەندی دایك وەربگیرێت بۆ لەباربردنی چارەسەریی؟
لەڕاوبۆچوونی بەندەدا، نەخێر لەبەر ئەوەی ڕازی نەبوونی كارێكی خۆكوژی یە بەشێوەی ناڕاستەوخۆ، خۆكوشتنیش لەشەرعو یاسادا قەدەغەو حەرامە، بێجگە لەوەی كە ژیانی دایكەكە تەنها موڵكی تایبەتو تەنهای خۆی نی یە، هەتا ڕەزامەندیو مۆڵەت لێ وەرگرتنی ڕاشكاوی بكرێتە مەرج.

**هەڵوێستی یاسادانانی سزادانانی عەرەبی لە لەباربردنی چارەسەری.**

خەریكە هەموو یاسا عەرەبی یەكانو غەیرە عەرەبیەكانیش لەسەر ئەوە ڕێكن كە لەباربردن بۆ ڕزگاركردنی دایكەكە ڕێ پێدراوەو سزای لەسەر نیە، ئەگەر ئەو مەرجانەی كە باس كران هاتنە دی، بەڵام هەندێ لەیاساكان وایدادەنێن ئەو ناچاریە لەبەربەستەكانی بەرپرسیارێتی سزادانو هەندێكیشیان وای دادەنێن كە لەهۆكارەكانی ڕێپێدانن.

لەو یاسایانەش، یاسای مەغریبی كە لە (ماددەی /٤٥٣)دا دەڵێ: (سزادان نی یە ئەگەر ناچاری پێویستی كرد بۆ لەباربردن)، هەروەها یاسای جەزائیری (ماددەی /٣٠٨) دەڵێ: (سزادان نی یە لەسەر ئەو لەباربردنەی كە ناچاری پێویستی دەكات بۆ ڕزگاركردنی ژیانی دایكەكە لەمەترسی، لەدوای ئاگاداركردنی دەسەڵاتی كارگێڕی).

وە یاسای سزادانی كوێتی لە (ماددەی /١٧٥)دا دەڵێ: (ئەگەر بكەرەكە خاوەنی پسپۆڕی پێویست بوو كاری لەباربردنەكەش لەنیەتێكی باش بوو بەڕاو بۆچوونی ئەو بۆ پارێزگاری كردن لەژیانی دایكە سك پڕەكە ئەوا سزادانی لەسەر نی یە).

یاسای وڵاتی بەحرەین لە (ماددەی /٢٠٢)دا دەڵێ: (ئەو كارانەی كە باسكرانو دەبنە هۆی لەباربردن دانانرێن بەناڕەوا، ئەگەر كەسی شایستە پێی هەستا، لەگەڵ بوونی بیرو ڕای چەسپاودا بەوەی ئەو كارە ناچاری یە بۆ پارێزگاری كردنی ژیانی دایكەكە).

یاسادانەری عێراقی لە (ماددەكانی /٤١٧-٤١٩)دا ئەو حوكمە گرتۆتەوە، بەڵام لە ماددەی تردا بەناچاریی داناوە لە بەربەستەكانی بەرپرسیارێتی سزادان دا.

## جۆری سێهەم: لەباربردنی تاوان کاری

ئەم جۆرەبان ئەوەیە مەبەست لێ ی خۆپزگارکردنە لەو سك پڕی یە بەهۆکارێك لە هۆکارەکان بەبێ بەهانەی شەرعی.

خەریکە کۆڕای شەرعیو یاساییو پزیشکی دروست دەبێت لەسەر حەرام کردنیو بەتاوان دانانیو سزادان لەسەریو، بەشێوەیەکی تایبەتی لەدوای جێگیربوونی ژیانی ئادەمیزادی لەکۆرپەلەکەدا، بەوەی خوای پەروەردگار گیانی کردبێت بەبەریدا، بەڵام بۆ ئەو تاوانەش وەکو هەموو تاوانێکی تر چەند پایەیەکی هەیە، کە هەندێ لەسەری ڕێکەوتوونو هەندێکی تریش جیاوازییان لەسەری هەیە، گرنگترینیان بێجگە لە پایە گشتی یەکان (پایەی شەرعیو ماددیو مەعنەوی)ین، کە ئەمانەن:

١- پایەی ماددی: بریتی یە لەبەکارهێنانی هۆکارە ماددیو مەعنەوی یەکان کە لەباریاندا هەیە ببنە هۆی لەباربردن، وە لەهۆکارە ماددیە ئەرێنییەکان بریتی یە لەتوندوتیژیو خواردنی دەرمانو شتی تر.

لەهۆکارە ماددی یە نەرێنی یەکانیش ئەوەیە کە دایکەکە ئەو دەرمانە بەکار نەهێنێ کە پزیشك بۆی باس کردووەو ڕێنوکایی کردووە بۆی، کە بیخوات بۆ پارێزگاری کردن لە منداڵەکە، یاخود پزیشك قەدەغەی دەکات کە نابێ بیخواتو بیخواتەوە بەمەبەستی لەباربردن.[1]

٢- پایەی شەرعی: بریتی یە لە سیفەتێکی ناڕەوا بۆ کارەکە، کە ئەوکارە دەقێکی بەتاوان دانان کە یاسا بڕیاری سزادانی بۆ داوە بۆ هەرکەسێك کە بەو تاوانە هەستێو دەیگرێتەوە.

٣- پایەی مەعنەوی: بریتی یە لەو ویستە تاوانکارییە بۆ ئەوەی ئەم کارەی دەدرێتە پاڵ.

---

[1] لە فیقهی شافیعی دا (قلیوبي عمیرة ٤/١٥٩) وەکو لێدانی ڕۆژوو یاخود برسێتی، وە لەفیقهی حەنەفی دا (حاشیە إبن بدین ٦/٥٨٨) وەکو قەدەغەکردنی لە خواردنو خواردنەوە بەشێوەیك کە ببێتە هۆی ئەو لەبارچوونە.

بێجگە لەو پایانە، بوونی سك پڕیو جیاكردنەوەی كۆرپەلەكە لەدایكەكە،و مردنی كۆرپەلەكە لە پایەكانی لەباربردن دەژمێردرێن.

حوكمی ئەو هۆكارانەی كە لەپایەكانی ماددی لەباربردن دا بەكار دەهێنرێن:

لەیاسادانانی تاوانكاری ئیسلامی دا، بەپێی بیردۆزی رێگەگرتن (سدالذرائع) هۆكارەكان سەر بە ئەنجامەكانیانن‌و ئامانجەكانیان لەبارەی ڕەوایەتی‌و ناڕەوایەتی یەوە.

ئیبن قەیم[1] دەڵێ: (ئەگەر خوای پەروەردگار شتێكی حەرام كرد، رێگاو هۆكاری ئەوشتە هەبێ بۆ پێگەیشتنی ئەوانیش حەرامن لەبەر حەرامی ئەو، ئەگەر هۆكارەكانیش بۆ ئەنجام دانی رێپێدراو بوون، ئەوە بریتی یە لە هەڵوەشاندنەوەیەك بۆ حەرام كردن‌و فریودانی كەسەكان‌و دانایی خوای پەروەردگاریش لەوەدا بریتی یە لەرازی نەبوونی.

## هەڵوێستی یاسای سزادانانی عەرەبی لەحوكمی هۆكارەكانی لەباربردن

یاساكانی سزادانی عەرەبی، حەرام كردن‌و سزادانی بڵاوكردنەوەو بازاڕگەرمكردن یاخود ئاسان كردنی بەكارهێنانی هۆكارەكانی هەموو حەرامكردوە، وەكو دەرمانەكان یان فرۆشتنی یاخود هەڵگرتنی ئەو مادانەی كە ئامادەكراون بۆ لەباربردن، بەمەبەستی فرۆشتنی لەو یاسایانەش یاسای سزادانی سووری (ماددەی /٥٢٥)و یاسای لوبنانی (ماددەی /٥٣٩) جا سزادان لەو دوو یاسایەدا لەدوو مانگەوە بۆ دوو ساڵە لەگەڵ پێبژاردن دا.

وە یاسای بەحرەین (ماددەی /٢٠٤)و سەڵتەنەی عمان (ماددەی /٢٤٥)و كوێتی (ماددەی /١٧٧) سزاكەی لەسێ ساڵ زیاتر نی یە.

---

[1] اعلام الموقعین لابن القیم ١٣٥/٣.

# بەشی دەیەم

## پیتاندنی دەستکرد و سنووردارکردنی وەچەخستنەوە

تویژینەوە لەو دوو بابەتە دوو جیباسی لەخۆ گرتووە:

یەکەمیان تایبەت کراوە بۆ پیتاندنی دەستکرد.

دوهەمیان تایبەت کراوە بۆ سنوور دارکردنی وەچەخستنەوە.

# جێباسی یەکەم:
# پیتاندنی دەستکرد

التلقیح: بریتی یە لەکاری گواستنەوەی پێکهاتەی ئاوی نێرینە (تۆماو)ی نێرینە بۆ (مهبل= بۆریچکەی منالّدانی مێینە) ئیتر هۆکاری گواستنەوەکەی هەرچی یەك بێت.

الأخصاب: بریتیە لەپرۆسەی یەکگرتنی (خلیة= شانە)ی نێر لەگەڵ شانەی مێ دا لەدوای بەیەك گەیشتن، بەرێگای سروشتی یاخود دەست کرد.

## بەشەکانی (پیتاندن):

پیتاندن بەو پێیەی هۆکاری گواستنەوەکەیە، دابەش دەبێت بۆ سروشتیو دەست کرد.

### بەشی یەکەم/ پیتاندنی سروشتی:

ئەوەیە کە بەهۆی پەیوەندی ڕەگەزی سروشتی ڕاستەوخۆوە لەنێوانی پیاوەکەو ژنەکەدا (لەنێوانی دوو هاوسەر)دا ئەنجام دەدرێت، ئەوەش ئەو ئەسڵەیە کە شەریعەتی خوای پەروەردگارو یاسا دانراوەکانیش بڕیاریان لەسەر داوە کە ئەوە لەکاتی ئەوەدا تەواو دەبێ کە ژنو پیاوێك بە هاوسەرگیری شەرعی پێی هەڵدەستن.

### بەشی دوهەم: پیتاندنی دەست کرد[1]:

وە بەرێگای ناسروشتی لەنێرینەوە دەگوازرێتەوە بۆ (مهبل)ی مێینە.

ئەوکارەش زنجیرەیەك پزیشکی دەستەبەرکراوە،و گومانی مەترسی لێ دەکرێتو

---

[1] تەلقیحی دەست کرد ئەوەیە کە تیایدا پێك هاتەی ئاوی نێرینە (تۆماو) بەشێوەی دەست کرد.

هۆكارە بۆ بەرپرسیارێتی، لەبەر ئەوە پێویستی بە درێژە پێدانو شیكردنەوەی بەشو رێگاو وێنەكانی دەكات، بۆ زانینی حوكمی شەرعیو قانونی بۆ هەموو بەشێكی لەو بەشانەی كە پێشبینی دەكرێن.

### جۆرەكانی پیتاندنی دەست كرد

ئەو دابەش كردنە بەپێی بایەخ پێدانی كارەكەی دابەش دەبێ بۆدەست كردی ناوخۆییو دەست كردی دەرەكی:

**جۆری یەكەم: پیتاندنی دەست كردی ناوخۆیی:**

ئەو پیتاندنە لەناو لەشی ژن دا دەكرێ بەوەی تۆوی پیاوەكە دەكرێتە (رەحم)ی ژنەكەوە، ژنی خۆی بێ یاخود نا، بەهۆی ئامێرێكی دەست كردەوە، لەرۆژی هاتنە دەرەوەی هێلكە لەهێلكەدانی ژنەكە، پاشان واز لەتۆوەكە دەهێنرێت بۆ ئەوەی خۆی بۆخۆی رێگەی سروشتی بگرێتە بەر بۆ شوێنی جێگیر بوونی هێلكەكە، هەروەكو پیتاندنی سروشتی.

**جۆری دوهەم: پیتاندنی دەست كردی دەرەكی یاخود ئەوەی كە پێی دەڵێن (الأخصاب العملي):**

ئەوەیە كە (پیتاندنو چاندن)ەكە كە دەرەوەی رەحمی ژنەكەدا لە بۆریەكدا یاخود دەفرێكی تاقیكردنەوە دا دەكرێ، پاشان لەدوای ماوەیەكی گونجاو لە كوتێنراوە لە رەحمی ژنەكەدا دەچێنرێت.

بۆ هەر جۆرێكیان رێگاو شێوە هەن، هەر شێوەیەكیش جۆری تایبەتی خۆی هەیە.

#### جۆری یەكەم: پیتاندنی دەست كردی ناوخۆیی:

گرنگترین جۆری تەلقیحی دەست كردی ناوخۆیی، سیانن:

**وێنەی یەكەم:** ئەوەیە كە هێلكەی ژن بەتۆوی مێردەكەی دەپیتێنرێن بە هۆكاریدەست كرد، لەبەر چەند هۆكارێك پەنا دەبرێت بۆ ئەو رێگایە، كە پزیشكەكان

دەیزانن، لەوانە: ئەگەر پیاوەکە هێزی پیاوەتی سست بوو یاخود بڕابوو یاخود تۆوەکەی زوو دادەبەرزی، یان ئەگەر ژنەکە بەهۆی بوونی نەخۆشی ئەندامێکی یان بەهۆی نەخۆشی دەرونی یەوە توانای ئەوەی نەبوو پەیوەندی سێکسی ئەنجام بدات.

حوکمە شەرعییەکەشی ئەوەیە کە ڕێگەی پێ دراوە بەو مەرجەی لەبەر ناچاریەکی زۆر پێویست بەوە بکات، لەبەر ئەوەی ئەو کارە مەترسی تێدا نی یە ئەوە نەبێ کە عەورەتی هەردوو هاوسەرەکە لەبەردەمی کەسانی تردا دەردەکەوێ ئەوەش لەبەر ناچاری ڕێی پێ دراوە، وەکو حاڵەتی ئەنجام دانی پشکنینە پزیشکیو نەشتەگەیی تیمارکردن بۆ پێویستیو ناچاری، ڕەچەڵەکی مناڵەکەش شەرعی یەو هەموو مافەکانو پابەند بوونە شەرعیو یاساییەکانی لەسەر دادەمەزرێ.

ئەو وێنەیەش لە شەریعەتی ئیسلامی دا هاوتای هەیە کەپێی دەوترێت (الاستدخال= بردنە ناوەوە)، کە بریتی یە لە بردنە ناوەوەی تۆوی پیاو بۆ ناو لەشی ئافرەتو پاشان فڕێ دانێتی بۆ دەرەوەی (ڕەحمی ژنەکە).

زانایانی شەریعەتو بەشێوەیەکی تایبەتی زانایانی شافیعی چارەسەری ئەوەیان کردووەو ڕەچەڵەکەکەیان بەشەرعی داناوە، ئەگەر بەشێوەی شەرعی بەو کارە هەستا بێتن.[1]

**وێنەی دووەم**: ئەویش هەر بریتی یە لەجێبەجێکردنی هەمان وێنەی یەکەم، لەدوای مردنی مێردەکە (حیامن= تۆوە) بەستوەکەی مێردەکە لەپێش مردنی دا بەشێوەی دەست کرد دەگوێزرێتەوە بۆ بۆریچکەی منالانو ڕەحمی ئەو ژنە کە مێردەکەی مردووە.

---

[1] لەو بابەتەدا بڕوانە: مغني المحتاج في الفقه الأسلامي ٣/٢٤٣ –٢٤٥، المغني والشرح الكبير في الفقه الحنفي لإبن قدامه ٩/٥٥. شرائع الأسلام في فقه الإمامية ٣/٣٤.
المحلى في الفقه الظاهري ٤/١٤٣.

حوكمی شەرعیش بۆ ئەو وێنەیە بریتی یە لەوەی كارەكە خۆی لەخۆی دا لە ئیسلام دا حەرامو ناڕەوایە، لەبەر زۆر هۆ، لەوانە:

أ- جیابوونەوەی ژنو مێردەكە بەمردنی مێردەكە ڕووی داوە، جا كارەكە لەكاتێكدا دەكرێ كە پەیوەندی ژنو مێردایەتی یەكە نەماوەو ژنەكە وەكو ژنێكی بێگانەی لێ هاتووە بە بەڵگەی ئەوەی مافی ئەوەی هەیە لەدوای تەولو بوونی ماوەی (عدە= چاوەڕوانی یەكە)ی دەتوانێ شوو بكاتەوە.

ب- لەدوای مردنی مێردەكە پێویستیو ناچاری زۆر نیە بۆ ئەو ڕێگایە، خۆ ئەگەر پێویست بوایە لەژیانی مێردەكەیدا دەكرا كەواتە كارەكە زیاتر بۆ خۆشی یە، نەك ناچاریو پێویستی بێت.

ت-ڕێگەگرتن (سد الذرائع)، لەبەر ئەوەی ئەو ڕێگایە لەوانەیە بكەوێتە بەر تێكەڵ بوونی ڕەچەڵەكەكان بەهۆی تێكەڵ بوونیان لە بانكەكان دا، یاخود ئەو كەسەی كاری گواستنەوە دەكات لەنێوانی تۆماوە بەستووەكانی پیاوەكەدا كەهی چەند پیاوێكن.

پ-لەوانەیە توش بوون هەبێت بە نەخۆشیەكانو شێواندنی بەدی هێنراوی لەلاشەی منداڵەكەو دایكەكەدا لەكاتێكدا كە تۆماوی نێرەكە توشی زۆر گۆڕانكاری دەبێ، لەبەر ئەوەی ماوەیەكی زۆر لەدەرەوەی كەشو هەوای سروشتی فسیۆلۆجی خۆی دا دەمێنێتەوە.

**ئایا حوكمی چی یە منداڵەكە ئەگەر بەزیندویی لەدایك بوو؟ سەبارەت بەو وێنەیە: لەبیرو بۆچوونی ئێمەدا ڕەچەڵەكەكە شەرعی یە بەم بەڵگانەی خوارەوەیە:**

١- پێوان: واتە پێوانی ئەو باروتۆخەی كە گومانەكەی تیادایە گەرچی بەڕێژەیەكی كەمیش بێ لەسەر سەرجێی كردنی بەگومان، زانایانی شەریعەتی ئیسلامی لەسەر ئەوە كۆكن كە سەرجێییەك بەگومان كرابێت، هەندێ لە شوێنەواری شەرعی لەسەر دادەمەزرێ، لەوانە: ڕەچەڵەكی شەرعی، هەروەكو سەجێی

کردنی هاوسەرگیری بەتاڵ دیارییشە (قیاس) لای زۆرینەی زانایان بەڵگەی شەرعیە.

٢- پاراستنی ئایندەی منداڵەکەو ڕێزگرتن لەو پارێزگاری لێ کردنە، ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەگەر پیاوێك لە ڕۆژهەڵات هاوسەرگیری کرد لەگەڵ ژنێك لەرۆژئاواو، نەتوانرا بەیەکتری گەیشتن ڕوبدات لەنێوانیاندا، ژنەکەش منداڵێکی بوو، ڕەچەڵەکی شەرعی ئەو منداڵە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پیاوە، لەبەر بوونی گومانی ئەوەی تەنها گرێبەستی هاوسەرگیری لەنێوانیاندا هەبووەو ئەوەش لەبەر پاراستنی داهاتووی ئەو منداڵەی کەبێ تاوانەو هیچ گوناهێکی نی یە.

٣- ناڕەوایەتی کارەکە، کاریگەری نی یە لەسەر ڕەوایەتی ڕەچەڵەکی یەکە، وەکو سەرجێیکردن لە هاوسەرگیری هەڵوەشاوەدا.

**وێنەی سێهەم:** ئەمەش ئەوەیە کە هێلکەی ژنەکەو تۆوی پیاوێك دەپیتێنرێت کە مێردی خۆی نی یەو بە هەمان ئەو ڕێگایەی لەدوو وێنەکەی پێشوودا ئەنجام درا، ئەوەش لەکاتێکدا ئەنجام دەدرێ کە مێردی ئەو ژنە نەزۆك بێ، یاخود لەبەر هەر هۆکارێکی پزیشکی تر، ئەو ڕێگایەش لەلایەن بانکەکان تۆوەوە لە جیهانی غەیرە ئیسلامیدا لە سنوورێکی فراوان دا ئەنجامدەدرێت، کە دەبینرێ چارەسەرێکی تیادایە بۆ کێشەی نەزۆکێك‌و دایکایەتی یەك، لەکاتێکدا کە مێردەکە نەزۆك بێت، دەگونجێ پاڵنەرەکەشی ئەوەبێ کە خاوەنی تۆوەکە بەشێوەیەکی جیاواز ناسراوبێ، وەکو ئەوەی لە بلیمەتەکان بێت، یاخود لەو کەسانە بێ کە خەڵاتی نۆبڵی بەدەست هێنابێ.

حوکم لەسەر ئەو ڕێگایەش لە شەریعەتی ئیسلامی‌و لە یاساکانی وڵاتە ئیسلامی دا بەو پێیەی کەمن بۆی دەچم، بریتی یە لە حەرامێکی براوە کەر، حەرام کردنی ئەو وێنەیەش وتو وێژ هەڵناگرێ لە دەوڵەتێکدا کە ئیسلام تیایدا دینی ڕەسمی وڵات بێت‌و دەقی دەستووری لەسەری هەبێت. لەبەر ئەو پێچەوانەی سیستەمی گشتی

(شهریعهتی ئیسلام)ه زانایانی شهریعهتی ئیسلامی، ههر لهسهرهتای ئیسلامهوه ههتا ئهمڕۆمان لهسهری یهك دهنگن كه تێكهڵ كردنی ڕهچهڵهكهكانیان حهرام كردووهو لهبهر نهبوونی گومانی حهڵاڵ لهو وێنهیهدا، ئهوا ڕهچهڵهكهكه دادهنرێت به بهرههمێكی نادروست ناسهلمێ بدرێته پاڵ خاوهنی تۆوهكه ناشدرێته پاڵ مێردهوهجاخ كوێرهكه، بهڵام دهدرێته پاڵ دایكهكه، كه خاوهنی هێلكهكهیه، جمهوری زانایانی شهریعهتیش دهڵێن: كه بهمنداڵی زینا- داوێن پیسی- دهدرێته پاڵ دایكیو حهرام بوونو میرات گرتن لهنێوانیان دا جێگیر دهبێ.[١]

بهڵام حوكمی ڕهچهڵهكی لهیاساكاندا ههتاوهكو ئێستا بهپێی زانیاری من دانی پێدا نهنراوه، واته له یاسای عهرهبیو ئیسلامی دا لهبهر پێچهوانهبوونی لهگهڵ سیستهمی گشتیدا.

بهڵام لهجیهانی غهیره ئیسلامی دا، ههندێ لهیاساكان دانیان ناوه به شهرعی یهتی ئهو منداڵه لهدایك بووهدا، ههر وهكو لهویلایهته یهكگرتووهكانی ئهمریكاو فهڕهنسادا دانپیادانراوه، یاسای ئینگلیزیش ئهو ڕێگایهی قهدهغه نهكردووه، بهڵام داننانێ بهڕهوایهتی منداڵهكهدا، یاسای سویسریش ئهو ڕێگایه به جۆرێك لهزینا (داوێن پیسی) كردن دادهنرێ.

### جۆری دووهم: پیتاندنی دهست كردی دهرهكی یاخود ئهوهی كهپێی دهڵێن چاندنی كۆرپهله

ئاشكرایه كه (پیتاندن) لهو جۆره له دهرهوهی ڕهحمی ژن دا ئهنجام دهدرێو پاشان پیتێنراوهكه دهگوێزرێتهوهو دهچێنرێتو بهو ڕێگایهش چهند وێنهیهكی ههیه لهوانه، ئهمانهی كهدێن:

---

[١] بڵاوكراوهی ڕۆژنامهی (نیوزویك) كه لهڕۆژی ١٨/٣/١٩٨٥دا دهرچووه، ههواڵێكی بڵاوكردۆتهوه كه لهئهمهریكا، بانگهكانی خوێن تۆوی یهك پیاو بهكاردههێنن بۆ پیتاندنی لهسهد ژن، ئهوهش له دكتۆرهكهوه گواستراوهتهوه لهسهر (ئهتروحهی دكتۆراكهی) كه لهسهر ڕۆنیۆ چاپ كراوه، لاپهڕهی/٩.

**وێنەی یەکەم:** ئەوەیە کە پیتاندنەکە لەو ڕێگایەوە دەبێت کە تۆوی مێردەکەو هێکەی ژنەکە وەردەگیرێتو لەبۆریەکی تاقی کردنەوەدا دادەنرێتو لەپاش دابەش بوونو پێگەیشتنی پیتێنراوەکە، دەگوێزرێتەوە بۆ ڕەحمی ئەو ژنەی کە خاوەنی هێلکەکەیە، کاتێ پەنا بۆ ئەو ڕێگایە دەبرێ کە هێلکەو ڕەحمی ژنەکە هەردوکیان ساغو سەلامەت بن، ئەو دوو بۆڕیە گەیەنەرەی نێوان هێلکەدانو ڕەحمی ژنەکە داخراون کە پێیان دەوترێت جۆگەی ڤالوب.

حوکمی شەرعی بۆ ئەو وێنەیە بریتی یە لەڕێپێدان لەبەر ئەوەی وەکو وێنەی یەکەم وایە لە پیتاندنی ناوخۆییو دەست کرد داو جیاوازی نیە مەگەر لەوەدا کە لەجیاتی گەروی ڤالوب دابێ، لەبۆری تاقی کردنەوەدا ئەنجام دەدرێت، قەدەغەکردنی تێدا نی یە، تەنها ئەوە نەبێ کە عەورەتی هەردوکیان لەبەردەمی کەسانی تردا دەردەکەوێ، ئەوەش لەحاڵەتی ناچاریو پێویستی یەکان دا، ڕێگەی پێ دەدرێت هەروەها ڕەچەڵەکی لەدایك بوو وەهایە کە لەدایكو باوکێکی شەرعیو بەشێوەی سروشتی لەدایك دەبێت.

لەبەر ئەوەی تۆوەکە لە مێردەکەوەیەو هێلکەکەش لە ژنەکەوەیەتی.

**وێنەی دووهەم:** هەمان وێنەی یەکەم، پیتدان و (الأخصاب) لەبۆری تاقی کردنەوەدا دەکرێ، بەڵام لەڕەحمی ژنی دووهەمی مێردەکەدا دەچێنرێت کە خاوەنی ئەو تۆوەیە کە یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی پیتێنراوەکە.

لەکاتێکدا پەنا دەبرێتە بەر ئەو ڕێگایە، کە هێلکەدانی ژنی یەکەمی پیاوەکە ساغو سەلامەت بێ، بەڵام ڕەحمی ساغو سەلامەت نەبێو گونجاو نەبێت بۆ قۆناغەکانی تری کۆرپەلە.

حوکمی ئەم وێنەیە: بنەڕەتی کارەکە ناشەرعیە، نەك لەبەر لێك چوونی بەکاری بەرچنەکان لەبەر خراپە مەترسی دارەکان، کە چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێ، بەشێوەیەکی تایبەتیش، ژیان یاخود سەلامەتی ژنەکە بخاتە مەترسی یەوە، لەبەر مەترسیداری لەنێوان دوو هەوێکە هەیە، بێجگە لەوە، ناچاریو پێویستی نیە

سەبارەت بە مێردەكە، لەبەر ئەوەی ژنی دووهەمی گونجاوە بۆ منـاڵ بـوون، بـەڵام ئەگەر ڕوودلوەكە ڕووی دا ئەوا منداڵەكە بنەچەكەی شەرعی یەو دەگاتەوە بەخاوەنی تۆوەكە، لەبەر ئەوەی لەكارەكەدا وەكو منداڵی زینا (داوێن پیسی نیە).

**وێنەی سێهەم:** وەكو هەردوو وێنەكەی پێشوو لە (پیتاندندا)، كە لەنێوانی تۆوی مێردەكەو هێلكەی ژنەكەی دا دەبێـت لـەبۆری تـاقی كردنـەوەدا، بـەڵام لـە چـاندنی پیتێنراوەكەدا جیاوازییان هەیە لەگەڵیاندا، كە لەڕەحمی ژنێك دا دەردەهێنرێت نـەك ژنی خـاوەنی تۆوەكـە، بـەڵكو ئـەو ژنـە خۆبەخشـە یـاخود بـەكرێ گـیراوە بـۆ ئـەو مەبەستە.

حوكمی شەرعیش بۆ كارەكە بەبێ گومان حەرام كردنێتی بۆ قەدەغەكردنی هۆكارەكان، كاتێ كەلە ئەو ڕێگایەوە شوێنەوارێك دروست دەبێ كە شەریعەتی ئیسلامی هەرگیز دانی پیادانانێت، لەوانە: دەگونجێ ئەو ژنە ژنی پیاوێكی تر بێتو پیاوەكەش سەرجێی لەگەڵدا كردبێو كۆرپەلەیكی تر لە ڕەحمی دا دروست ببێ، جا ژنەكە دوو منداڵی پێكەوە دەبێ، یەكێكیان كۆرپەلە چێنراوەكەیەو ئەوی تریان هی مێردەكەی خۆیەتی، جا ئەو دوو منداڵە لەیەكتری جیا ناكرێتەوە، لەولەش ژنە خۆبەخشەكە یاخود بەكرێ گیراوەكە ستەمی لە منداڵە لەدایك بووەكە كردووەو نایان گەڕێنێتەوە بۆ هەردوو هاوسەرەكەی لەبەر ئەوە پێویستە ئەو وێنەیە بەیاسا قەدەغە بكرێت.

## بەڵام ئایا حوكمی ڕەچەڵەكی لەدایك بووەكە چی یە، ئەگەر ئەو ڕووداوە ڕووی دا؟

لەبیرو بۆچوونی ئێمەدا، ڕەچەڵەكی شەرعی دوو هاوسەرەكەی خاوەنی پیتێنراوە چێنراوەكە، ئەگەر ئەو ژنەی چاندنەكە لەڕەحمی دا ئەنجام دراوە هاوسەردار نەبێت، یاخود هاوسەر داربێت، بەڵام پابەندبێت بەوەی سەرجێی لەگەڵ مێردەكەیدا نـەكات هەتا ئەو كاتەی سك پڕی یەكەی دیاری دەداتو مەترسـی تێكـەڵ بـوونی ڕەچـەڵەك نامێنێتو حوكمەكانی منداڵەبەر بەسەر ئەو ژنەدا جێبەجێ دەبێت كە خواردن دەداتە

کۆرپەلەکە زیاتر لەچاکی دایەنی، هەروەها بەڵگەی ڕەوایەتی ڕەچەڵەکیش پێوانەیە لەسەر سەرجێبکردنی بە گومان، ئەوەش پێوانی باشتر پێوانی ئاشکرایە، لەبەر ئەوەی گومانی چارەسەرکردن لەوکارەدا زیاتر لەچارەسەر دەچێ لەسەرجێیکردن بۆ هاوسەرگیری هەڵوەشاوە جا کۆرپەلە چێنراوەکە وەکو سروشتی وایە لەوەدا کە خاوەنی تۆوەکەو خاوەنی هێلکەکە هاوسەرگیری یەکی شەرعیو تەواو لەنێوانیاندا هەیە.

ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە کە کۆڕی فیقهی ئیسلامی کە لەشاری مەککەی موکەڕڕەمەدا بەسترا، شەرعیەتی دا بەڕەچەڵەکی ئەو لەدایك بووە، لەخولی حەوتەمی دا لەساڵی ١٤٠٤ی کۆچی، بەڵام لەساڵی ١٤٠٥ی کۆچی دا لە خولی هەشتەم داو لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێك لەو بڕیارەی پەشیمان بوویەوە. هۆی کشانەوەکەشی بەوە دانا کە دەبێتە هۆی تێکەڵ بوونی ڕەچەڵەك، بەڵام هەروەکو لەپێشدا باسکرا، ئەگەر ژنەکە شووی نەکردبوو، یاخود ئەگەر پیاوەکە پابەندبوو بەوەی سەرجێی لەگەڵ ژنەکەی دانەکات هەتا ئەو کاتەی سك پڕ یەکەی دیاری دەبێ، ئەوا مەترسی تێکەڵ بوونی ڕەچەڵەك نامێنێ، بێجگە لەوەش، ئەگەری تێکەڵ بوونی ڕەچەڵەکی زۆردوورە، بەهۆی ئەوەوە کە ژنەکە مانگانە لەیەك هێلکە زیاتر دەرنادات بەخۆنەویستی، جا دەسەڵاتی ئەوەی نیە کە بەویستی خۆی بیخاتە ناوەوە، هێلکەدانیش ئازادانەو دوور لەویستی ژنەکە کاردەکات، زانایانیش ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە کۆی ئەو هێلکانەی کە هێلکەدان بەدرێژایی ژیانی ژنەکە دەری دەدەن لە (٤٠٠) چوار سەد هێلکە زیاتر نی یە.

کەرتو ڕێگاو وێنەی تر زۆرن بۆ پیتاندنی دەست کردی دەرەکی، کە هەموویان ناڕەوانو ئەو منداڵە لەدلیك بووەی لە ئەنجامی ئەو کارەدا لەدایك دەبێ ناشەرعی یەو پێوەری گشتیش ئەوەیە کە، هەرکاتێك یەکێك لەدوو توخمەکە (تۆوەکەو (هێلکەکە) لە غەیری دوو هاوسەرەکەوە بێ پیتاندننەکە ناشەرعیە.

# جێباسی دووەم:
# سنووردارکردنی وەچەخستنەوەو قەدەغەکردنی سکپڕی

قەدەغەكردنی سكپڕی دووجۆره: هەمیشەیی‌و كاتی، بۆ هەرجۆرەشیان هۆكاری جیاوازو ئامانجی جیاوازیان هەیە.

## جۆری یەكەم: قەدەغەكردنی كاتیی:

بۆ قەدەغەكردنی كاتی چەند هۆكارێك هەن، لەوانە: لەلایەنی مێردەكەوە بەكار دەهێنرێت وەكو ڕشتنی تۆو لەدەرەوەی (ڕەحم) یان تورەكەیەك دەكاتە ئەندامی نێرینەی. هۆكاریش هەیە لەلایەنی ژنەكەوەیە، وەكو بەستنی ڕەحم بەشێوەیەكی كاتی یاخود هاوشێوەی ئەوە، تاكە هۆكاریش كە لەسەردەمی هاتنی پەیامی ئیسلام‌و پێشەوای مەزهەبەكانی شەریعەت دا بەكارهێنراوە، تەنها: (العزل)ە (دوورخستنەوە).

العزل: بریتی یە لەوەی كە پیاوێك سەرجێی لەگەڵ ژنەكەی دا دەكات، كاتێ كە دابەزینی تۆوەكەی نزیك بوویەوە، پیاوەكە لای دەباو ڕای دەكێشێتە دواوە بۆ ئەوەی تۆوەكە لەدەرەوەی (مهبل)ی ژنەكەی بڕێژێ.

### حوكمی قەدەغەكردنی سكپڕی بەعەزل لە شەریعەتی ئیسلامی دا:

یەكەم: جیاوازی نییە لەنێوانی شەرع زانەكان دا، لەوەدا كە ئەگەر سك پڕی مەترسی هەبێت بۆسەر ژیانی دایكەكە ئەوا ڕێگەی پێ دراوە كە بەشێوەیەكی كاتیی قەدەغە بكرێت.

دوهەم: جیاوازی نیە لەنێوانی شەرع زانەکانی شەریعەتی ئیسلامی دا، لەوەدا کە لە بنەڕەت لە ئیسلامدا بریتی یە لە نەکردنی (مەنع= قەدەغەکردن) ئەوەش بەپێی ئەم بەڵگانە:

١- ئامانجی سەرەکی مێرد بریتی نی یە لە تێرکردنی ئارەزووە سێکسیەکان، بەڵکو ئامانجی بریتی یە لەمنداڵ بوون بۆ بەردەوامی ڕەچەڵەکی ئادەمیزاد.

٢- قەدەغەکردن لەبەر هۆکاری ئابووری قەدەغەی لێکراوەو حەرامە، کە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزی لەسەر هاتووە، لەوانە: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئًا كَبِيرًا)[1] تۆو پێی دەوترێت منالّ بە ئەژمارکردنی داهاتووی.

٣- خوای پەروەردگار منداڵی بەدی هێناوە، منداڵ جوانیو ڕازاوەیی یە بۆ ژیان، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا).[2]

٤- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە هاوسەرگیری کردن لەگەڵ ئەو ژنانەی کە منداڵیان زۆر دەبێ فەرموویەتی: (تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم الأنبياء يوم القيامة)[3] زۆر منداڵ بوونی ژن لەپێش هاوسەرگیری کردن لەگەڵی دا بەخزمەکانیا دەردەکەوێ.

سێ هەم: حوکمی قەدەغەکردنی سکپڕبوونی کاتیی لەولایەنەوە کە چاوپۆشی بکرێ لە بەهانەکانی سکپڕیو نەبوونی، بابەتێکی جیاوازی لەسەرە، زانایانی بواری شەریعەت جیاوازیان تیادا هەیە لەسێ ڕاوبۆچوون دان:

ڕاوبۆچوونی یەکەم: لەشەریعەتی ئیسلام دا بەڕەهایی حەرام کراوە، ئیتر بەهەر ڕێگاو هۆکارێك بێت، ئەوەش کە شەرع ناسە (ظاهریەکان) کاریان لەسەر کردووە،

---

[1] سوورەتی ئیسراء /٣١.

[2] سوورەتی الكهف /٤٦.

[3] نيل الأوطار ١١٨/٦.

به‌تایبه‌تیش ئیبن حه‌زمی ظاهری[1] و به‌به‌ڵگه‌ ئه‌قڵیه‌كان‌و نه‌قڵی یه‌كانیش به‌رگرییان لیٚ كردووه‌، له‌وانه‌ ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌ی كه‌ جدامه‌ی كچی وه‌هه‌ب گێڕاویه‌تی یه‌وه‌ وتی: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌ناو خه‌ڵكی دا ئاماده‌بوو، له‌باره‌ی (عه‌زل)ه‌وه‌ پرسیاریان لیٚ كرد فه‌رمووی: (ذلك الوأد الخفي[2]) الوأد بریتی یه‌ له‌زینده‌ به‌چاڵ كردنی كچ، ئه‌وه‌ش له‌و ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌وه‌ وه‌رگیراوه‌ كه‌ خوای په‌روه‌ردگار فه‌رموویه‌تی: (وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ (٨) بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ).[3]

ڕاوبۆچوونی دوهه‌م: له‌شه‌ریعه‌تی ئیسلامی دا به‌ره‌هایی ڕێگه‌ی پیٚ دراوه‌، ئه‌وه‌ش ڕاوبۆچوونی زۆربه‌ی زانایانی شه‌رع زانی شافیعین، به‌ڵگه‌كانی خۆشیان ئاشكرا كردووه‌، ئه‌وه‌یه‌ كه‌ محمود له‌ عه‌گاوه‌له‌ جابره‌وه‌ گێڕاویه‌تی یه‌وه‌، كه‌ وتویه‌تی: (ئێمه‌ عه‌زلمان ده‌كردو قورئانی پیرۆزیش دا دابه‌زی).

له‌ گێڕانه‌وه‌یه‌كی تردا له‌ سوفیانه‌وه‌: (ئێمه‌ عه‌زلمان ده‌كردو قورئانیش داده‌به‌زی، خۆ ئه‌گه‌ر شتێك بوایه‌ كه‌ قه‌ده‌غه‌ی لیٚ بكرایه‌، ئه‌وا قورئان قه‌ده‌غه‌ی لیٚ ده‌كردین[4]) له‌ فه‌رمووده‌یه‌كی تردا، ئێمه‌ له‌سه‌ر ده‌می پێغه‌مبه‌ری خوادا ﷺ ده‌كردو ئه‌وه‌ش گه‌یشته‌وه‌ به‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ قه‌ده‌غه‌ی نه‌كرد[5]، بیٚ ده‌نگی پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر ڕیٚپیٚدانی، خۆ ئه‌گه‌ر حه‌رام بوایه‌ ئه‌وا قه‌ده‌غه‌ی

---

[1] بڕوانه‌ المحلی: ١٠/٧٠ كه‌ تیایدا هاتووه‌ (حه‌ڵاڵ نیه‌ عه‌زل له‌ژنی ئازادو كه‌نیزه‌كیش بكرێت، بۆ سه‌لماندنی ئه‌وه‌ش، له‌ عایشه‌ی دایكی ئیماندارانه‌وه‌ ڕه‌زای خوای لیٚ بیٚ له‌ جوامه‌ی كچی وه‌هبه‌وه‌ كه‌ خوشكی عه‌كاشه‌یه‌ وتی: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌ناو خه‌ڵكی دا ئاماده‌بوو بوو، له‌باره‌ی (عزل)ه‌وه‌ پرسیاریان لیٚ كرد، فه‌رمووی: (ذلك الوأد الخفي)و ئه‌و ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌ی خوێنده‌وه‌: (إذا الموٶدة سئلت بأی ذنب قتلت).

[2] سبل الأسلام ٣/١٩٠.

[3] سووره‌تی ته‌كویر /٨.

[4] صحیح مسلم ٢/١٠٦٥.

[5] صحیح مسلم، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، المعدة علی احكام الأحكام شرح عمدة الأحكام ٤/٢٧٩.

دەکرد، وە لە صەحیحی موسلیم[1]دا فەرموودەی زۆر هاتوون کە بەڵگەن لەسەر رێپێدانی، کە لێرەدا ماوەی باسکردنیان نی یە، ئەو فەرمودانەی کە رێگەیان داوە بەهێزترو زیاترە لەو فەرموودانەی قەدەغەیان کردووە.

ڕاوبۆچوونی سێهەم: ئەوەش درێژە پێ دانە، ئەوەیە کە جمهوری زانایانی بواری شەریعەت بڕیاریان لەسەرداوەو وتویانە: ئەگەر بەرێکەوتنی نێوانی دوو هاوسەرەکە بێت ئەوە رێپێدراوە، بەڵام بەبێ رەزامەندی ژنەکەبێت نابێت، لەبەر ئەوەی مافێکی هاوبەشە لەنێوانیان دا، بۆ مێردەکە نی یە کە ستەم بکات، بۆ ئەوەش بەڵگەیان لەسەر ئەوە هێناوەتەوە کە عومەری کوڕی خەتاب رەزای خوای لێ بێ گێڕاوێتی یەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە کە مێرد بەبێ رەزامەندی هاوسەرە ئازادەکەی (عەزل) بکات، جا وتیان: ئایا فەرموودەکە بە تێکەیشتنی پێچەوانەکەی دروستە بە مۆڵەت پێدانی لەلایەن ژنەکەوە. هەر بەو شێوەیە رێگای پێوانەی پێ ڕۆشن دەکرێتەوە کە بەرێکەوتنی ژن و مێردەکە، ژنەکە بۆی هەیە قەدەغەی سکپڕی بکات ئەگەر چی رێگاکە لەژنەکەشەوە بێ وەکو بەکارهێنانی دەرمانی قەدەغەکردنی سك پڕی یاخود لەلایەن پزیشکەوە وەکو بەستنی رەحمی ژنەکە.

### هەڵوێستی یاسا لە قەدەغەکردنی سکپڕی بەشێوەی کاتی:

ئەمدیوە لەهەموو یاساکانی سزادانی وڵاتە عەرەبیەکاندا قەدەغەی ئەو جۆرە بکات، بێجگە لە یاسای سزادانی لوبنانی کە قەدەغەی سکپڕیوونی بەرەهایی حەرام کردووە،و بە تاوان دایناوەو سزای لەسەر دەدات، وەکو لە ماددەکانی (٥٣٧و ٥٣٨)دا هاتووە.

لەڕاوبۆچوونی ئێمەدا، قەدەغەکردنی مێینە وەکو قەدەغەکردنی هەمیشەیی بۆ ناچاری دروستەو بەبێ ئەوە دروست نیەو ئەم ڕاو بۆچوونەم، کۆکەرەوە بەڵگە

---

[1] بڕوانە ٢/١٠٦١.

دژەكانە لەو بوارەدا.

## جۆری دوەهەم: نەزۆك كردن

قەدەغەكردنی سكپڕی بەشێوەیەك یەكێك لەدوو هاوسەرەكە بەشێوەیەكی هەمیشەیی نەزۆك بكرێ، ئەوەش پێی دەوترێ نەزۆك كردن.

نەزۆك كردن بۆ پیاوان ڕێگایەكی كۆنە بۆ قەدەغەكردنی سكپڕی یاخود بۆ قەدەغەكردنی سەرجێیكردن لەگەڵ ژنەكەی دا، لە گرنگترین هۆكارەكانیش بریتی یە لە خەساندن، خەساندن بابلیەكان‌و ئاشووری یەكان‌و فارسەكان بەكاریان دەهێنا بۆ منالآنی ئەو دیلانەی كە بەكۆیلەیان دادەنان، میسری یەكانیش ئەوانەیان دەخەساند كە لەسۆدان‌و شوێنەكانی ترەوە دەیان هێنان، پاشان ئەو داب‌و نەریتە گوێزرایەوە بۆ یۆنانی یەكان‌و ڕۆمانی یەكان، خەساندن قەدەغەی پیاوان دەكات لە ئەنجام دانی كاری سێكسی، لەزوودا بەڕێگایەكی دڕندانەی سەرەتایی‌و گێلانە ئەنجام دەدرا، لەوانە بڕینی هەردوو گون، كرژكردنی یاخود تەقاندن، لەوانەش بڕینی ئەندامی نێرینەی پیاو كەپێی دەوترێت (الجب= بڕین)، زۆر لەو كەسانە لەو كاتەدا دەمردن، مەبەستیش لەوكارە بێبەش كردنیان بوو لە ئەنجامدانی كاری سێكسی، لەكاتی بەكارهێنانیاندا لەماڵەكاندا، بێجگە لەوە، لە زەمانی زوودا دادەنرا بەسزادان بۆ كەسی زیناكار لەلای میسریەكان، وە بۆ دز لەلای ئاشووریەكان، وە بۆ ناپاكەكان لەلای بابلیەكان‌و فارسەكان، هەروەها مەسیحیەكانیش لەسەدەكانی ناوەڕاست دا ئەو كارەیان بۆ منداڵەكانیان ئەنجام دەدا بۆ ئەوەی ببنە قەشە، پاشان ئەو باوو نەریتە گوێزرایەوە بۆ هەندێ لەوڵاتەكانی تر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەڵام شەریعەتی ئیسلامی خەساندنی دانا بە تاوان‌و سزای لەسەر دانا، لەبەر ئەوەی ئەو كارە سزلو ئەشكەنجە دانەو نابێ ئادەمیزاد یاخود گیاندار وای لەگەڵ بكرێت، پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی ئەو كارەی كردووە.

**بەشەکانی بەنەزۆک کردن**

نەزۆك کردن بەپێی ئامانجەکەی دابەش دەبێ بۆ سێ شێوە[1]:

**شێوەی یەکەم: بەنەزۆك کردنی چارەسەری** ئەگەر پزیشکێك سەلماندی کەسکپڕی ژیانی ژنەکە دەخاتە مەترسی یەوە، ڕێپێدراوە کاری بۆ ئەنجام بدات وای لێ بکات کە بەدرێژایی ژیانی ببێتە نەزۆك، ئەگەر مەترسی یەکە بەردەوام بێت دا ئەگەر نەزۆکی یەکە بەرەزامەندی ژنەکە بوو یاخود بەرەزامەندی نوێنەرێکی بوو لە کەس و کاری ژنەکە.

بڕیارەکەش ئەگەر لە پزیشکە تایبەتمەندەوە بوو، نە پزیشکەکەو نە ژنەکەو نە هیچ کەسێك لەوانە کە هاوبەشی یان لە کارەکەدا کردووە، بەرپرسیار نابن لەکارەکەدا، نە لەشەریعەتو نە لە یاسادا، نەلە سزادان نە لە مەدەنیدا، لەبەر ئەوەی ناچاری تەندروستی بۆ ژنەکە پێویستی بەو کارە کردووەو جێگرەوەی نیە، کارکردن بەو بنەمایەی ئەگەر دوو زیان یاخود خراپەش هەبوون کامیان شەڕی کەمتر بوو هەڵدەبژێردرێت بۆ دوورخستنەوەی ئەوەیان کە مەترسی دارترە، وە لەو وڵاتانەدا کە ئیسلامی نین، دادوەری فەرەنسیو ئینگلتەرەو وڵاتە یەکگرتووەکان دانیان بەوەدا ناوەکە بەو پێیە کارێکی بەهانەدارە بەناچاری یە تەندروستی یەکانی لەلایەن هەندێ لەوڵاتانەوە ڕێگەی بەیاسا پێدراوە وەکو ئیتالیا.[2]

**شێوەی دووەم: نەزۆك کردن بۆ پاکردنەوەی بنەچە:** ئەوەش بەزۆرە ملێیە بەپێی یاسا، لەو وڵاتانەدا کە کاری پێ دەکەن، وەکو دانیمارکو سویدو نەرویجو فلنداو هەندێ لەوڵاتەکانی کەنەدا، ئەو شێوەیەش لە چارەکی دووەمی سەدەی بیستەم دا دەرکەوت، بۆ جێبەجێکردنی لەسەر ئەو تاوان بارانەی کردویانەتە خوو،

---

[1] دکتۆر عبدالوهاب (المسؤولية الطبية الجزائية) جهة الحقوق والشريعة کە کۆلێژی مافەکانو شەریعەت لەزانکۆی کوێت دەری دەکات ژمارە /٢ ساڵی /٥- ١٩٨١، لاپەڕە /١٦١و پاش ئەو.

[2] مرسوم تشريع لە ١٢/ئازار/١٦٤٢دا دەرچووە، دکتۆر عبدالوهاب، سەرچاوەی پێشو.

ئەوانەش كە لەبواری سێكسدا لایانداوە، ئەوانەش كە توشی پەركەم بوونو یان لەڕووی عەقڵەوە نەخۆشن.

ئەڵمانیاش ڕێگەی پێداوە بەیاسا لەساڵی ۱۹۳۳دا بۆ دەست گرتن بەسەر بنەچەی هەندێ لەو كەسانەدا كە خاوەنی بنەچەی ئەڵمانی دەشێوێنن، بەگومانی ئەوان بەلام لەدوای بەزینی هیتلەر لە جەنگی جیهانی یەكەمدا ئەو بیروڕایە هەڵوەشێنرایەوە.

**هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلامی بۆ ئەو شێوەیە:**

ئیسلام بەرپەچی دەداتەوەو حەرامی كردووە، لەبەر ئەوەی كارێكی ناڕەوایەو مەبەست پێی ئامانجێكی ڕەوایە، ئەوەش ڕێگەی پێنەدراوە بەپێی ڕێسای (سدالذرائع= قەدەغەكردنی هۆكارەكان) ئەگەر بەنەزۆك كردنەكەمان گونجان لەو حاڵەتەدا بەبێ بوونی پێویستیەكی هەمیشەیی وەكە دەردێ بەلایەكی بەردەوام، ئەوا سزای ئەو تاوانە لەوڵاتە عەرەبی یەكاندا بێجگە لەوەی دەقێكی یاسایی عەرەبیو ئیسلامی نیە بۆ ئەوەی بەهانەداری كات.

**شێوەی سێهەم: نەزۆك كردن بۆ مەبەستی سنوور داركردنی وەچە:**

بریتی یە لە بەنەزۆك كردن بەویستی كەسەكە خۆی، كە هەندێ لەخەڵكی هەوڵی بۆدەدەن، بەهەرهۆیەكەوە بێ كەبە جیاوازی كەسەكان دەگۆڕێت، ئەوەش گیروگرفتی ئەم سەردەمەیە بەهۆی تەقینەوەی دانیشتوانەوە لەجیهان دا، هەندێ لە دەوڵەتانیش كە گەشەی دانیشتوانیان وەرگرتووە وەكو هیندستانو ئیتالیاو چینو میسر، هانی لەسەر دەدرێت.

**هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلامی**

بریتی یە لەحەرام كردنی بەنەزۆككردن بەسێ شێوە ئەگەر ناچاریەك نەبێت، وابكات ئەم فەرموودەی خوای پەروەردگارە بیگرێتەوە: (فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ) دەڵێ: (ناچاریەكان ڕێگە دەدەن بە قەدەغەكراوەكان).

بەلام جۆرێكی تر هەیە لە قەدەغەكردنی سك پڕی، كە دەتوانرێ پەنای بۆ ببرێت بۆ چارەسەركردی گیروگرفتەكە ئەوەش قەدەغەكردنی مێینەیە بەهۆكاری كاتی،

هەتا ئەگەر بەهانەکە نەما، ئەوا بڕیارەکە دەگەڕێتەوە بۆ بنەڕەتیەکەی، بەپێی ڕێسای (ئەگەر بەربەستەکە نەما قەدەغەکە دەگەڕێتەوە).[1]

**هەڵوێستی یاسا**

هەروەکو پێشتر باسمان کرد لەیاساکان‌و وڵاتانی عەرەبی دا دەقێکی یاسایی نی یە کە قەدەغەکردنی سکپڕی حەرام بکات، بێجگە لەیاسای سزادانی لوبنانی پەیڕەوکراو کە دەقی هاتووە لە (ماددەی /٥٣٧) هەرکەس بەهۆکارێك کە باس کراوە لە هەردوو بڕگەی دوەم‌و سێ هەم لە مادەی (٢٠٩) دەستی کرد بەوەسفکردن یان بڵاوکردنەوەی شێوازەکانی قەدەغەکردنی سکپڕی یان بەمەبەستی بانگەواز بۆ قەدەغەنەکردنی سکپڕی بۆ ماوەی ٣ مانگ تا ساڵێك زیندانی دەکرێت‌و (٢٥) بۆ (١٠٠) لیرەش غەرامە دەکرێت، وە دەقی (ماددەی /٥٣٨) تیایدا هاتووە: (بەهەمان سزا سزا دەدرێت، ئەوکەسەی فرۆشتبێتی یاخود دایبنابێ بۆ فرۆشتن یاخود گرتنە خۆی بەمەبەستی فرۆشتنی هەر مادەیەك لەو مادە ئامادەکراوانە بۆ قەدەغەکردنی سك پڕی یاخود بۆ ئاسان کردنی بەکارهێنانی بەهەر هۆکارێك بێت).

دەبینین ئەو یاسایە زیادەڕەوی کردووە لە قەدەغەکردنی سك پڕی دا، وە بڕیاری داوە سزای ئەو کەسە بدات کە هۆکارەکان دەکات، ئەو سزادانەش لەسەر تاوانێکە پێش دەسپێکردنی ڕەنگە کاریگەریی ئاراستەی کەنیسەی لەسەربێت کە قەدەغەکردنی سك پڕی بەشێوەیەکی ڕەهایی لە هەموو جۆرەکانیا حەرام کردووە.

[1] مجلة الأحكام العدلية (ماددەی /٢٤).

# بەشی یانزەهەم

## لەبەرگرتنەوەو مامەڵەکردن لەگەڵ جینی ئادەمیزادی دا

دووبابەت لەخۆ دەگرێ لە دوو جێگەی باسدا کە دێن:

جێباسی یەکەم بۆ لەبەرگرتنەوە.

جێباسی دوهەم بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ جینی ئادەمیزادی دا .

# جێباسی یەکەم:
# لەبەرگرتنەوە

شێوەیەك لەشێوەکانی چاندنی شانەییە لە زمانی عەرەب دا بەچەند مانایەك هاتووە، نزیکترینی بۆ مانای زاراوەیی بریتی یە لە ڕوودانی شتێك کە لەگەڵ (أصل= بنەڕەت)ەکەیدا وەکو یەك وابن، لەگەڵ مانەوەیدا.

لەبەرگرتنەوە (دوبارەکردنەوە) وەرگێڕانە بۆ وشەی (klon) لەبنەڕەتی یۆنانی وەرگیراوە ماناکەشی (چرۆی منداڵی تازە لەدایك بوو). یاخود بەرهەم هێنانی منداڵی تازە لەدایك بوو.

وەلە زاراوەی تەکنیکیدا وەرگێڕانی وشەی (cloning)ی ئینگلیزیو (clonage)ی فەڕەنسی یە، بەمانای ڕوودانی بوونەوەرێکی زیندوو کە بەتەواوی لەلایەنی بۆماوەییو (فیزیۆلۆجی= کاری ئەندام زانی)و شێوەیەوە وەکو یەك بێ لەگەڵ بوونەوەرێکی زیندووی تر بەڕێگای لەدایك بوونی ناڕەگەزی یەوە.[1]

### ئالیەتی لەبەرگرتنەوە:

کاری لەبەرگرتنەوە بریتی یە لە وەرگرتنی (خلیە) شانەیەکی جەستەیی لە گیاندارێکی زیندووی (مێینە)، کە هەموو زانیاریە بۆ ماوەیی یەکانی لەخۆگرتبێ‌و لە

[1] واتە نەك لەڕێگای لکاندنی هێلکەی مێینەوە بەتۆوی نێرینە لەبەر ئەوە بەو ڕێگایە دەوترێ لەدایك بوونی ڕەگەزی.

هێلكەیەكی بەتاڵ كراودا بیچێنێ لەو كەسەدا كە بەجێی هێشتووه[1] بۆ ئەوەی (جەنین) واته بەدیهێنراوێك بێنێتەدی كە لەهەموو شتێكی دا بەتەواوی لەخاوەنی شانەكە بچێت.

ئەو چۆنێتی یەش پێویستی بە گیانداری تووی (الحیمن)ی نێرینه نیه، وه پێویستیشی بە یەك گەیشتنی ڕەگەزیو ئارەزوو كردن نی یه لەنێوانی نێرو مێكەدا.[2]

ئەو كاره پشت دەبەستێ بە كوشتنی ناوەڕۆكی هێلكه نەپیتێنراوەكە، بەتیشك چاندنی شانەیەكی جەستەیی لە شوێنی دا.

وه لەبەر ڕۆشنایی ئەو چۆنێتی یەدا كە باسكرا بۆ لەبەر گرتنەوه دەستەواژەی ڕاست ئەوەیە كە بوترێ (الإستنسال= وەچەخستنەوه) یاخود (التنسیل= وەچەدانان) لە جیاتی (الاستنساخ= لەبەرگرتنەوه) وه بەو بوونەوەرەی هاتۆتە بەر بوترێ (النسیلة= منال).

## چۆنیەتی لەبەرگرتنەوه (وەچەخستنەوه)ی نا ڕەگەزی

پسپۆڕی بەریتانی (Dr. lan wilananw) لە دامەزراوەی ڕۆزلینی بەریتانی (Roslin an stitutein scoland) هەستا بە ئامادەكردنی سێ مەڕو هەستا بە هەوڵ دان بۆ لەبەرگرتنەوەی مەڕی چوارهەم، بەم شێوەیە:

١- شانەیەكی جەستەیی[1] لەو مەڕە وەرگرت كەویستی لەبەری بگرێتەوه، مەڕەكە ڕەنگی سپی بوو، پاشان ناوكی شانەكەی دەرهێنا كە (٤٦) كرۆمۆسۆمی

---

[1] هۆكاری پێویست بۆ ئەو بەتاڵ كردنەوەیە، ئەوەیە كە ناوكی شانەی جەستەیی (٤٦) چەشنی كرۆمۆسۆمی تێدایە، ناوكی هێلكەش (٢٣) چەشنی تێدایە، ئەوا كۆیان دەكاتەوه (٦٩)، ئەوەش كارەكە بەتەواوی هەڵدەوەشێنێتەوه، لەبەر ئەوەی هەر كەمو كوڕیو ناتەواوی یەك لەژمارەی چەشنەكان دا لەلایەنی زیادو كەمی یەوه، ئەگەر چی بەیەك چەشنیش بێت، دەبێتە هۆی پێك هاتنی لەدایك بوویەكی شێواو یاخود بەدی هێنراوێكی تر.

[2] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانه (الإستنساخ البشری) لەنێوان ڕاستیو خەیاڵ دا. لەنوسینی ئوستاذ محمد ماهر صوفی چاپی/١٩٩٧دا- البیان، لاپەڕە/١٤و دوای ئەو.

لەخۆی گرتبوو، خستیە ناوەڕاستی خواردەمەنی یەکی کەمەوە که کەمترینی بڕی لە کەرەستەی خواردەمەنی پێویستی لەخۆی گرتبوو بۆ ئەوەی بەزیندوویی بمێنێتەوەو بەسی بێت بۆ گەشە کردنی‌و دابەش کردنی، بۆ ئەوەی هۆکارە بۆماوەیی یەکان واڵێ بکات بۆ پێویستی زاڵ بوون بەسەر چالاکی یەکەیدا لەکاتێکی گونجاودا.

٢- پاشان هێلکەیەکی لە مەڕێکی تر وەرگرت کە لەڕەنگدا جیاواز بوون، کە ڕەنگی ڕوخساری ڕەش بووە، ناوکەکەی لێ جیاکردەوە (واتە: لەناواخنە بۆماوەییەکەی رووت کرد)و تەنها وەکو گەنجینەی خۆراکی لێ هات.

٣- پاشان شانەی جەستەییەکەی لە هێلکەکەدا کە ناوکەکەی تیادا چێنراوە دەچێنرێت‌و لەرێگای زاڵ بوونی بارگاوی کردنی کارەباوە تێکەڵیان دەکات یەکەم جار، پاشان بەبارگەیەکی تر کە بەدوای دا دەهێنرێ جێگیری دەکات بۆ جوڵاندنی ئەو خانە تازەیە لەسەر گەشەکردن‌و دابەش بوون.

٤- لەپاش شەش مانگ لەگەشە کردن‌و دابەش بوون، چەند شانەیەك پێك هاتن‌و (جەنین) بەدیهێنراوێکی زۆر بچوکی لێ پێك هات.

٥- پاشان لەڕەحمی مەڕی سێهەمدا چێنرا، لەهەمان جۆری مەڕی خاوەن هێلکەکە، واتە: خاوەن ڕوخسارە ڕەشەکە کە مەبەست لێ ی جیاکردنەوەیەتی.

٦- لەپاش تەواو بوونی ماوەی سکپڕیەکە (١٥٠) ڕۆژ، بەرخێك لەدایك بوو، ناونرا دوللی (dolly) بەناوی گۆرانی بێژو ئەکتەری ئەمەریکی، ئەو خانمەی بەجوانی دڵ بەر بەناوبانگ بوو[٢].

---

[١] شانەیەکی جەستە لەهەر پارچەیەکی جەستە کەبێ ئامادە دەکرێ بەمەرجێ ئەو شانەیە دابەش بوون وەربگرێ وەکو شانەی مەمك.

[٢] دکتۆر (بول سرحان) سەرۆکی بەشی نەزۆکی لە نەخۆشخانەی نەزۆکی لە نەخۆشخانەی کۆلێژی پزیشکی بەریتانی، لەکاتی چاو پێکەوتنێك دا لەگەڵی دا لەلایەن کەناڵی جەزیرەوە لەڕۆژی ٢٠٠١/١٢/١٢دا وتی: لەڕاستی دا ڕێژەی سەرکەوتنی کاری لەبەرگرتنەوەی بیۆلۆجی لەنێوانی لەسەدا یەك تا دوودلیە.

٧- به‌رواری له‌دایك بوونی (دوللی) له‌ڕێكه‌وتی ٥/ته‌مووزی/ساڵی ١٩٩٦دا بوو، به‌ڵام له‌ڕۆژی ٢٧/شوباتی ساڵی ١٩٩٧دا ڕاگه‌یه‌ندرا.

ئه‌وه‌ی شایه‌نی باسه سه‌ركه‌وتنی ئه‌و تاقی كردنه‌وه‌یه (٢٧٦) تاقی كردنه‌وه‌ی هاوشێوه‌ی شكست خواردووی له‌پێشه‌وه بوو[١].

ئه‌و ڕێگه‌یه بۆ له‌به‌رگرتنه‌وه پێی ده‌وترا به‌كارهێنانی ناڕه‌گه‌زی، ئه‌و له‌به‌رگرتنه‌وه‌یه‌ش له‌پێش (دوللی)دا به‌سه‌ر بۆقه‌كان دا تاقی كرابوویه‌وه.

## شێوه‌كانی له‌به‌رگرتنه‌وه

بۆ له‌به‌رگرتنه‌وه‌ی ئاده‌میزادی چه‌ندین شێوه هه‌یه له‌لایه‌نی سه‌رچاوه‌ی شانه‌كه‌وه، له‌وانه، ئه‌مانه‌ی كه دێن:

أ- ئه‌گه‌ر ئه‌و هێلكه‌یه‌ی كه هی ژنه‌كه‌یه‌و ناوكه‌كه‌ی لێ داڕنراوه‌و پاشان شانه‌ی جه‌سته‌كه له‌مێرده‌كه‌بن، له‌و شێوه‌یه‌دا ئه‌نجامه‌كه‌ی نێرینه ده‌بێت.

ب- ئه‌گه‌ر هێلكه‌كه‌و شانه‌ی جه‌سته‌كه له‌یه‌ك ژنه‌وه بێت، ئه‌وا له‌و حاڵه‌ته‌دا ئه‌نجامه‌كه مێینه ده‌بێت.

ت- ئه‌گه هێلكه‌كه له‌ژنه‌كه‌وه بێت‌و شانه‌ی جه‌سته‌كه‌ش له پیاوێكی بێگانه‌وه بێ.

پ- ده‌گونجێ هێلكه‌كه له‌ژنه‌كه‌وه بێت‌و شانه‌ی جه‌سته‌كه‌ش له ئاژه‌ڵێكه‌وه بێ، ئه‌نجامی ئه‌و شێوه‌یه نه ئاده‌میزاده ده‌رده‌چێ‌و نه ئاژه‌ڵ.

ج- ده‌گونجێ شانه له پیاوێكه‌وه بێت‌و هێلكه‌كه‌ش له ئاژه‌ڵێكه‌وه بێ، ئه‌نجاكه‌كه‌شی نه ئاده‌میزاده‌و نه ئاژه‌ڵ.

له‌به‌رگرتنه‌وه‌ی ئاده‌میزادی له‌هه‌موو ئه‌و شێوانه‌و هاوشێوه‌یان به‌پێی شه‌ریعه‌ت حه‌رامه، هه‌روه‌كو چۆن تا ئێستا وه‌كو بزانم هیچ یاسایه‌ك دانی به‌م كاره دانه‌ناوه.

هه‌ندێ كه‌س پروپاگه‌نده‌ی ڕێپێدانی ده‌كه‌ن له‌شێوه‌ی یه‌كه‌مدا له‌حاڵه‌تی نه‌زۆكی دا له‌سه‌ر بناغه‌ی ڕێسای (له‌بنه‌ڕه‌تدا له‌كاتی پێویستی یه‌كاندا ڕێ‌پێ‌دراویه). به‌ڵام

---

[١] بڕوانه: الإستنسال (الإستنساخ) له‌نێوانی زانست‌و ئایین دا دكتۆر محمود قاسم محمد، لاپه‌ڕه/١٢.

ئەو ڕاوبۆچوونە هەڵەیەو لەگەڵ گیانی شەریعەتی ئیسلامی دا بەیەکا دەدەن، لەبەر ڕێسای ناوبراو ئەوەیە: (لەڕاستی دا بنەڕەتیەکان لەشتە سوود بەخشەکان پێدراوە).
ئاشکراشە لەبەرگرتنەوە یاخود (وەچەخستنەوەی ئادەمیزادی بەو شێوەیە لەهەموو شێوەکانی دا زیان بەخشو خراپەو لەگەڵ بەهاو ڕەوشتەکانو بەرنامەی خوای پەروەردگاردا ناگونجێ، کە مانەوەی بەردەوامیی جۆری ئادەمیزاد لە پیتاندنی تۆوی نێرو هێلکەی مێ دا کورت دەکاتەوە.

## حەرام کردنی (الاستنسال) (لەبەرگرتنەوە)ی ئادەمیزادی لە شەریعەتی ئیسلامی دا.

بەڵگە نەویستە کە شەریعەتی ئیسلامی ·بیروباوەڕو بەرنامەیە، زانستو کارە، ئیسلام دینی سروشتی خاوێنە، ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان لە زیاتر لە پەنجا جار داوای بەکارهێنانی ژیریو بیرکردنەوە دەکات بۆ پێش خستنی ژیانو دڵنیاکردنی پێویستی یەکانی بۆ هێنانەدی بەختیاری دنیاو قیامەت، ئەم شەریعەتە ڕێگر نی یە لەبەردەم دۆزینەوە زانستیو دۆزینەوە تازەکانی پزیشکی دا لە ئاسۆو زاتی کەسەکاندا، وەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ)[1].

بەڵام بۆ ئەو شەریعەتە گەورەیە چەندین پێوەری بابەتی هەیە بۆ جیاکردنەوە لەنێوانی خێرو شەڕدا،و لەنێوانی سوودو زیان دا،و لەنێوانی بەرژەوەندی ڕەواو خراپ دا هاوشێوەیان، ئیسلام شەریعەتە لە هەموو شتێکدا ناوەندو میانڕەوە، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا لەوبارەیەوە هاتووە: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنْتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَنْ يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّنْ يَنْقَلِبُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَإِنْ كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ وَمَا كَانَ اللَّهُ

[1] سوورەتی فصلت /٥٣.

لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ)[1].

ئیسلام هەموو زیادەڕەوی یەك لەزیادو لەكەم (إفراط[2]و تفریط[3]) ڕەد دەكاتەوە پێی ڕازی نابێ لەهەموو بوارەكانی ژیان دا.

شەریعەتی ئیسلامی حوكمەكانی لەسەر بنەما گشتیەكان كورت كردۆتەوەو ژێری ئادەمیزادی سەرپشك كردوە لە وردەكاریەكان بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو بنەما گشتیانە، بەپێی پێویستی یەكانی ژیان لە هەموو كاتو شوێنێكدا.

درێژەدان لەڕوونكردنەوەی حوكمدا بۆ هەموو بابەتێك كە پەیوەندی بەژیانەوە هەبێت بەگرنگی وەرگیراوە، لەو لۆژیكەشەوە لەسەرمان پێویستە وردەكاری وەبگرینو ڕەچاوی جیاوازی لەنێوانی (وەچەخستنەوە) (لەبەرگرتنەوە) ئاژەڵو درەختو ڕوەكو چیناتەكانو لەنێوانی وەچەخستنەوە (لەبەرگرتنەوە)ی ئادەمیزادا بكەین.

لەحاڵەتی یەكەمدا ڕێدەدرێت بە وەچەخستنەوە (لەبەرگرتنەوە)ی هەموو گیاندارێك كە گۆشتەكەی بخورێتو شیرەكەی بخورێتەوە، یاخود لەهەر بوارێكی تردا سوودی لێ وەربگیرێت.

هەروەها (لەبەرگرتنەوە)ی درەختە بەردارەكانو ڕووەكە سوود بەخشەكان هەروەها جیناتەكان، وەكو شوێنی خۆیاندا باسیان دێت.

جا پێویستە دوودڵ نەبین لەدروستی ئەو وەچەخستنەوە (لەبەرگرتنەوە بۆ گەشەسەندنی سامانی ئاژەڵیو كشتو كاڵیو چاك كردنو بەردەوامی جۆرەكەیان بەشێوەیەكی تایبەتیش ئەو ئاژەڵانەی كە ئەگەیی لەناوچوونیان هەیە).

بەڵام سەبارەت بە (وەچەخستنەوە)ی ئادەمیزادیی بەوشێوەیە، شەریعەتی ئیسلامیو ژیری ساغ حوكم دەكەن بەوەی پێویستە بوەستینەوە لەدژی

---

[1] سوورەتی بەقەرە /١٤٣.

[2] الإفراط بریتی یە لە سنوور تێپەڕاندن لەلایەنی زیادەڕەوی یەوە.

[3] التفریط بریتی یە لە سنوور تێپەڕاندن لەلایەنی كەمو كورتی یەوە.

لەبەرگرتنەوەو زۆربوونی ئادەمیزادی بەو ڕێگایە، ئەوەش لەبەر زۆرهۆ لەوانە:

١- بێ بەش بوونی ئەو کەسەی بۆتە وەچەکە (لەبەرگیراوەکە) لە خێزانێك کەسەر بەوبێت، خێزانیش، شانەی کۆمەڵگەکەیەتی، ئەگەر ئەو شانەیە چاك بوو ئەوا کۆمەڵگەکە چاك دەبێو چاکە بڵاو دەبێتەوە، خۆ ئەگەر خراپیش بێ ئەوا کۆمەڵگەکە خراپ دەبێو خراپە بڵاودەبێتەوە، خۆ ئەگەر لەبەرگیراوەکە (کۆپی یەکە) مرد کێیەکە میراتی لێ دەبات؟ باوکی ئەو کێ یە وە کێ برایەتی یاخود خوشکێتی؟ بەوشێوەیە (کۆپی)یەکە (لەبەرگیراوەکە) لەکۆمەڵگە دوورە پەریز دەبێ، بەو پێیەی ئەندامێکەو دەگونجێ مافی هەبێو پابەندبوونی لەسەر بێ.

٢- وەچەهێنانی ئادەمیزای (الاستنسال البشري) دەرچوونە لەسیستەمی خوای پەروەردگار کە بڕیاری لەسەردراوە، بۆ مانەوەی جۆری ئادەمیزاد بەوشێوە شکۆداریەی شایانێتی بۆ پلەوپایەکەی لەنێوان بوونەوەراندا، سیستمی خوای پەروەردگار کە شیاوو گونجاوە لەگەڵ پلەو پایەی ئادەمیزاددا، لەلایەنی چۆنیەتی مانەوەو بەردەوامی، ئەوەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە تیایدا فەرموویەتی: (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (١٣) ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ)[١] هەروەها فەرموویەتی: (فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ مِمَّ خُلِقَ (٥) خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ (٦) يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ)[٢]. جگە لەو ئایەتە پیرۆزانەی ڕێگەی بەوەچەخستنەوە یان دیاری کردووە لەگەڵ مانەوەی ئادەمیزادو پەیوەندی ڕێژەیی، لەوانە خزمایەتی کە هۆکارە بۆ میرات بردنو پابەندبوونی خەرجیەکانی.

٣- ناچاری یەك نیە کە پێویست بە دەرچون بکات لەسەر ڕێگەی سروشتی پاكو ئاسایی بۆ زۆرکردنی ئەندامەکانی ئادەمیزاد، لەکاتێکدا کە زۆرێك لەخێزانەکان

---

[١] سوورەتی موئمینون/ ١٢-١٤.

[٢] سوورەتی طاریق/ ٥-٧

لەجیهاندا بەرەو سنووردارکردنی منداڵ بوون لە دەڕۆن بەڕێگای جۆراوجۆر بۆدانانی سنوورێك بۆ تەقینەوەی دانیشتوانی سەرزەوی.

٤- وەچەهێنان (لەبەرگرتنەوە)ی ئادەمیزادی هۆکارێکی یارمەتی دەرە لەسەر زۆرکردنی تاوانکاریەکانو بۆڕاکردن لە دەستی دادگا، لەبەر ئەوەی وەچەهێنان (گرتنەوە) لە هێلکەو شانەی جەستەیی پێك دێتو دەبێتە هۆی لەیەك چوونی ئەنجامەکە کە بەتەواوی لە خاوەنی شانەکە دەچێت، بەبێ جیاوازی .ای، دادەنێین کە یەکێك لەکۆپی کراوەکان تاوانێکی ئەنجام داوە لەحاڵەتی هەستان بەونیازە، چۆن جیاوازی دەکرێت لەنێوانی بێ تاوانەکەو تاوانبارەکەدا بۆ ئەوەی دوهەم کەسیان دەستگیر بکرێتو بڕیار لەسەر بێ تاوانی یەکەم بدرێت، لەکاتی نەبوونی جیاوازی یەك کە جیاوازی بکات لەنێوانیاندا یاخود هەستان بەنیازی دیاری کردنی کەسی تاوانبار، کە لە بەهێزترینی بەڵگەکانی سەلماندن لە لێکۆڵینەوەکانی سزاداندا بریتی یە لە جیاوازی لەمۆری پەنجەکان دا، جا ئەگەر جیاوازی لەپەنجە مۆریشیان دانەبوو بۆ ئەوا دادگا بەهێزترینی بەڵگەی لەدەست دەچێ بۆ جێبەجێکردنی.

٥- لە لەبەرگرتنەوەی ئادەمیزادی دابەزاندنی پلەوپایەی ئادەمیزادە، کە گەورەی بەدیهێنراوەکانە بۆ پلەو پایەی ئاژەڵان لەبارەی بەدیهێنانو بوونەوە، ئەوەش لەگەڵ ئەو ڕێزیێ نانەدا ناگونجێ، کە خوای پەروەردگار لە ئادەمیزادی گرتووە، هەروەکو فەرمویەتی: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا).[١]

٦- ڕێسای گشتی سەبارەت بەڕەوایەتی وەچەو وەچەخستنەوە بریتی یە لە (هەر حاڵەتێك لایەنی سێهەم تیادا پەیوەندی ژنو مێرد بشکێنێ، ئیتر ئەوە ڕەحم بێت یاخود تۆوی نێرینە بێت یاخود بێجگە لەو دوانەبێ بەهەموو شێوەیەك

---

[١] سوورەتی ئیسراء /٧٠.

لەبەراوردی شەرع دا ناپەسەندە.

٧- کاری لەبەرگرتنەوە بە پیتاندنی دەست کرد ناپێوڕێت، کە لەهەندێ حاڵەتدا لەبەر ناچاری ڕێگەی پێ دراوە، هەروەکو باسمان کرد، لەبەر ئەوەی پێوان لەگەڵ جیاوازی دایە، مناڵی بلوری (پیتاندنی دەست کرد) بەرهەمی پیتاندنە لەنێوانی هێلکەی ژن‌و تۆوی پیاودا، کە سیفاتە ماوەییەکانی تیادا کۆدەبێتەوە لەلایەنی هەردوو هاوسەرەکەوە پێکەوە، ئەو دوو هاوسەرە باوك‌و دایکی شەرعین بۆ منداڵەکە، پاشان لەڕاستی دا پیتاندن لەشێوەی ڕەوادا، هیچ کەمو کورییەك لەرەچەڵەکی شەرعی دا ڕوونادات، هیچ کەم‌و کورییەکیش لە خزمایەتی ڕەچەڵەکیش ڕوونادات لە مافەکان‌و پابەندبوونەکان.

٨- تاوان کاری تێدایە بۆسەر ژیانی کەسە کۆپی یەکە، لەبەر ئەوەی لەبواری زانستی‌و کرداری دا سەلماوە کە ئەگەر بەراوردی بکەی بە ژیانی ئادەمیزادێکی سروشتی تەمەنی کورتە، بە بەڵگەی ئەوەی مەڕی دوللی[1] بەزوویی پیریتی تیادا دەرکەوت، بێجگە لەوەی کە ئادەمیزادی کۆپی توشی شێواندن‌و دەردو بەلای بەردەوام دەبێت.

٩- کاری وەچەهێنان (لەبەرگرتنەوە) خەرجی زۆر گرانی تێ دەچێت بەهانەیەکیش نی یە بۆ ئەو مەسروفە زۆرە، بۆ زانیاریش ڕێژەی سەرکەوتنی تاکو ئێستا زۆر کەم بووە، هەوڵ‌و کۆششەکان کە لەپێناوی لەبەرگرتنەوەی مەڕی (دوللی)دا ئەنجام دران گەیشتە (٢٧٧) هەوڵ دان، کەواتە سەرکەوتن بەڕێژەی لەدوو سەدو حەفتاو حەوت جاردا یەکجاربوو.

١٠- لە لەبەرگرتنەوەی ئادەمیزادیدا یاری دەکرێ بە ئەندازەی جینەکان‌و پێوانەکانی بۆماوەکان‌و پێچەوانەی ئەو فەرموودەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی: (وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدَارٍ)[2] هەروەها فەرموودەی خوای پەروەردگار (إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ

[1] بڕوانە: الإستنساخ بين العلم والدين لە نوسینی دکتۆر محمود حاجی قاسم لاپەڕە /١٢.

[2] سوورەتی ڕەعد /٨.

خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ)[1] هەروەها فەرموودەی خوای پەروەردگار: (فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَكِينٍ إِلَى قَدَرٍ مَعْلُومٍ)[2] هەروەها ئایەتی تری قورئانی پیرۆز هەن كە بەلگەن لەسەر ناڕەوایەتی ڕێگای لەبەرگرتنەوەی ئادەمیزادی.

١١- له لەبەرگرتنەوەی ئادەمیزادی دا سەرەڕۆیی دەكرێ بەژیانی ئادەمیزادو بەرژەوەندیەكانی لەپێناوی پێشبڕكێی زانستی دا.

١٢- لەڕاستی دا ناڕەزایی زانستی یانە لەلایەن پیاوانی دینی[3] و سیاسەت[4] و ڕێكخراوە تەندروستی یەكان[5] و یاسا دانراوەكانەوە[6] و كۆڕو كۆنگرە زانستی یەكانەوە[7].

بوەتە بەلگەیەكی زەق لەسەر ناشیرینو خراپی لەبەر گرتنەوەی ئادەمیزادیو بەلگە نەویستیشە كە هەموو خراپیو ناشیرینی یەك لەشەرعو لەیاسادا لەهەموو كاتو شوێنێكدا هەر قەدەغەیە.

بەلام سەبارەت بە لەبەرگرتنەوەی جیناتی ئادەمیزادی خوا بیكات لەجێ باسی داهاتوودا زانیاری زیاتری لەبارەوە دێت.

---

[1] سوورەتی قەمەر /٤٩

[2] سوورەتی مورسەلات /٢١و٢٢.

[3] له پیاوانی شەریعەتی ئیسلامی زانای بەڕێز طه نطاوی زانای ئەزهەرو زانای بەڕێز قەرزاویو دكتۆر وهبه زوحیلو كەسانی تریش كە ڕایان لێ وەردەگیرێ.
له پیاوانی دینی یەهودیش دا حاخامی گەورەی ئیسرائیل (میزلاد) وە لە پیاوانی مەسیحیش دا، بابا فاتیكان- بولصی دوهەم-و بابای قیبتی یەكان الوین سنودة.

[4] له پیاوانی سیاسەتیش، بیل كلنتۆن سەرۆكی پێشووی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاو جاك شیراك سەرۆكی فەرەنسیو یەكێتی ئەورووپی.

[5] لەڕێكخراوە تەندروستی یەكان، ڕێكخراوی ئیسلامی بۆ زانستی یە پزیشكی یەكانو ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی.

[6] لەو یاسا دانراوانەی كە لەبەرگرتنەوەی ئادەمیزادی لەلا ناپەسەندەو پێی ڕازی نابێت، یاسای ئیسپانی ژمارە /٤٢ی ساڵی/١٩٩٨و یاسای ئەڵمانی كە لەڕۆژی ١٩٩٩/٣/٢٠دا دەرچووە.

[7] وەكو كۆڕی دار البیضاء له مەملەكەتی مەغریبو شوێنی تریش.

# جێباسی دووەم:
# مامەڵەکردن لەگەڵ جینی ئادەمیزاد دا

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ).[1]

خوای پەروەردگار بەڵێنی داوە بەنەوەی ئادەمیزاد کە لەهەندێ لە شاراوەکانی گەردوون‌و شاراوەکانی خۆیان ئاگاداریان بکات، بۆ ئەوەی باوەڕیان زیاتر بێت بەوەی کە خوای پەروەردگار حەقە، هەروەها بەڵێنی پێداون کە لەڕێگای دۆزینەوە زانستی یەکانەوە لەنهێنی یەکانی گەردون بەشێوەیەکی گشتی‌و نهێنی یەکانی خۆشیان بەشێوەیەکی تایبەت پێنیشان بدات.

خوای پەروەردگار بەڵێنەکانی خۆی بەڕاست گێڕاو زۆرێك لەنیشانە گەردوونیەکانی ئاسمانی پەردە لادا بۆیان لە ئەستێرەو کاکەشانەکان‌وکۆمەڵەی خۆری‌و سروشتی هەموو ئەوانەی لە گەردونەکەیدا مەلە دەکەن، جا زانیان هەسارەی زەوی کە واگومانیان دەبرد کە چەقی گەردوون بێ، وانیە بەڵکو هەسارەی زەوی هەر بریتی یە لە گەردیلەیەکی بچووك لە گەردوونێکی گەورەدا، کە هێشتا ژیری زانایانی گەردوونی سەریان دەمێنێت‌و تێناگەن کە لەکوێوە دەست پێ دەکاو لەکوێش کۆتایی دێ؟

زانیان بناغەی دروستکردنی گەردوون بریتی یە لە گەردیلە،و گەردیلەش سەرچاوەی تیشکدانەوەی گەردوونی یە.

هەروەها یەکبونی ئەو یاسانەیان زانی کە هەسارەکەیان دەبەستێتەوە ڕازی نهێنی بە گەردوونی گەورەوە.

---

[1] سوورەتی فوصیلەت /٥٣.

وردەكاری زانستو زانیاری لە نادیارەكانی ناخی ئادەمیزاددا كەمتر نەبوو لە زانیاریان لەسەر جەستەی گەردوون، كاری هەر ئەندامێكیان لە ئەندامەكانی جەستەی ئادەمیزادیو هۆكارەكانی تەندروستیو نەخۆشیەكانو ڕێگاكانی چارەسەری زانی جا لەپانتایی لێكۆڵینەوەو كاری دۆزینەوەكاندا لە دەروونی ئادەمیزادیو سروشتی دا ڕۆچون هەموو ئەوانەش لەسەر بناغەی بەڵێنی خوای پەروەردگار ڕوویاندا كەوا ئایەتە پیرۆزەكانی خۆیان پیشان بدات لە لەگەدوونو لە خۆیان دا.

لێرەوە ئەوە ڕۆشن دەبێتەوە بۆ خاوەن عەقڵەكان كە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دینی سروشتی پاكە، هەروەكو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ)[1] ئیسلام دینی زانستو دینی پێویستیەكانی لۆژیكی ساغە دینی پێش كەوتنو شارستانێتیو پەرەسەندنە، بەڵام دواكەوتویی تێنەگەشتن لێی جیاوازی كردووە لەنێوانی ئەوو ئەو كارانەدا.

بۆیە لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویستە بڕوانێتە تازەگەریەكانو دۆزینەوە زانستی یەكان بەڕوناكی ئیمان، نابێ وەكو مووی لوت بوەستێت لەبەردەم پێش كەوتنی زانستی دا، ئەگەر هاوبەشی تیادا نەكات، وەنابێ ڕەش بینو نەرێنی بێت لەدژی هەموو دۆزینەوەیەكی زانستی تازە، لەبەر ئەوەی هەموو ڕوداوێكی زانستی لەڕابردوو ئێستاو ئایندەدا چەكێكی دوو سەرە، هەروەكو چەك بەهۆیەوە چاكان دەكوژرێتو هەروەها بەو چەكە پارێزگاری لە مافەكانی خەڵكی دەكرێت لەژیانو لە ئابڕوو ماڵو سامانیان، بێجگە لەوانەش لەبەرژەوەندییە پێویستی یەكان، هەروەها دۆزینەوە زانستی یەكان، لایەنی چاكو خراپی تێدایە، جابا هەستین بە بەراوردكردن لەنێوانی چاكەو خراپەكان دا پاشان مامەڵەیان لەگەڵ دا بكەین لە سەربناغەی ڕاكێشانی سودو قازانجو دوورخستنەوەی خراپەكاری یەكان.

---

[1] سوورەتی ڕووم /٣٠.

بەو پێیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دەدەین گرنگترینی ڕێگاکانی زانینی بڕیارەکان بخەینەڕوو کە دەقی تیادا نی یە لەلای زانایانی بنەماکانی دین‌و بنەماکانی فیقهو فەیلەسوفە موسڵمانەکان، لە چوار جێ باسدا.

یەکەم: لەپێناسەکردنی (جین)ی ئادەمیزادی لە زمانەوانی‌و لەشەرع دا، دوهەم: ڕێگای بەرژەوەندی، سێهەم: سوڕانەوەی حوکم لەگەڵ هۆکارەکانی دا، چوارهەم ڕێگای چاك‌و خراپی بەهۆی ژیریەوە.

# جێباسی یەکەم:
# پێناسەی (جین)ی ئادەمیزادی
# لە زمان و لە شەرعدا

### ئایا وشەی (الجین) عەرەبی یە یاخود بیانی یە؟

هەموو لێکۆڵەرەوەکان وای دەبینن کە ئەو وشەیە عەرەبی نی یە، بەڵکو زاراوەیەکی بیانی یە، بەڵام لەڕاو بۆچوونی مندا ئەو وشەیە لە بنەڕەت دا زاراوەیەکی عەرەبی یە، لەگەڵ ئەوەشدا کە یۆنانی یەکان‌و ڕۆمانی یەکان بەمانای بنەڕەت‌و ڕواو بەکاریان هێناوە، هەروەها بەمانای عەشیرەتێك کە بنەماڵەیەکی هاوبەش دێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو زاراوەیە بەپێی زانیاری من لەهیچ فەرهەنگێکی عەرەبی دا نەهاتووە.

ئەو بەڵگەیەش کە پشتی پێ دەبەستم لەم قسەیەمدا کە وشەی جینی ئادەمیزادی (الجین البشری) یاخود (الجینات) لە بنەڕەت دا عەرەبی یە، ئەوەیە کە هەر وشەیەکی عەرەبی کە هەردوو پیتی (ج)و (ن)ی تیادا کۆببێتەوە، بەڵگەیە لەسەر شتێکی شاراوەی کە نەبینراو بەچاوی ئاسایی نابینرێ، کاری وەکو کاری وشەی (الجین) وە لەو وشانە: وشەی (الجنین) کە لەو منداڵە دەنرێت کەوا لەسکی دایکی دایە، لەبەر ئەوەی ڕەحمی دایکەکەدا داپۆشراوە، بەڵام لەدوای لەدایك بوونی ئەو

وشه نابێته ناو بۆی، كۆی (جین) بریتی یه له (اجنة)، هەر وەكو خـوای پـەروەردگار فەرموویەتی: (هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنْتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ)[1] لەوانەش (الجنة) بۆ شوێنی شاراوه، كه نـەبینرێت كـه بڕیـار دراوه هـەروەكو خـوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ)[2].

وه لەوانەش (الجن) كه جیهانێكی بەدی هێنراونو هەنو جێگرن، لەگەڵ ئەوەشدا بەهەستو سەیركردن نابینرێن، خوای پەروەردگار فەرموویـەتی: (قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا)[3].

لەوانەش (الجنون) كه بریتـی یـه لەنەخۆشـی یـەكی شـاراوه كـه بەهەسـتی روت نابینرێـت، توشـی عـەقڵ یـاخود دەمـاغی ئینسـان دەبێـت، خـوای پـەروەردگار فەرموویەتی: (فَذَكِّرْ فَمَا أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ)[4].

وه لەوانـه (الجنـف) بـۆ لاریوونـەوەی بەهەڵـه لەڕاسـتی خـوای پـەروەردگار فەرموویەتی: (فَمَنْ خَافَ مِنْ مُوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ)[5].

ئیبن منظوریش[6] دەڵێ: (وشەی ج ن بریتی یه له بابەتێك بۆ داپۆشین).

دەوترێ (جننت الشيء في صدري) واته: پەنهانم كردو شاردمەوه، بێجگه لەوەش له دەیان وشەی تری عەرەبی كه هەردوو پیتی (ج ن)ی لەخۆی گرتووه، كه بەڵگەن لەسەر مانایەك كه بەهەست یاخود بەچاوی ئاسایی پێـی نازانرێـت، لەبـەر ئـەوه وای دەبینم كه وشەی (الجین) دەگەڕێتەوه بۆ ئەو بنەڕەته لەزمانی عەرەبیدا.

---

[1] سوورەتی نەجم /٣٢.
[2] سوورەتی بەقەره /٨٢.
[3] سوورەتی ئیسرا /٨٨.
[4] سوورەتی طور /٢٩.
[5] سوورەتی بەقەره/ ١٨٢.
[6] لسان العرب بەشی (ج) پیتی (ن) ١٦/٨٥١.

## الجين لە زاراوەی زانایانی زیندەومرزانی دا

بەچەند جۆرێك پێناسەکراوە، لەوانە: (الجینات) بریتی یە لەوەی کە زانیاریەکان یاخود سیفاتە پێویستی یە بۆماوەییەکان هەڵدەگرێت بۆ دروست کردنی جەستەی زیندوو، کە بەرپرسیارە لە هەموو لەوانەی کە بۆی دەمێنێتەوە لە سیفاتەکانو هەموو ئەو پێناسانەی بە دەوری یەك تەوەرەدا دەسوڕێتەوە، ئەوەش بەشی بیۆلۆجی[1] یە، سیفاتە بۆماوەییەکان لەناو شانەدا هەڵدەگرێ.

پێناسەی هەڵبژێرراویش (الجین) بریتی یە لە یەکەیەکی بۆماوەیی کرداری بەرپرسیار لەکارێکی دیاری کراو.

## سروشتی جین

لە جیاوازی لەچۆنیەتیەکەیدا هەیە ڕاستی یەکەشی ئەوەیە کە ئەو (شتە)، چونکە پێناسەی فەیلەسوفەکانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، کاتێ کەوتویانە:

(شت هەموو ئەوانەیە کە دەگونجێ بزانرێو هەواڵی لەسەر بدرێ)، بەڵام دارابیەك نیەو ناگونجێ مامەڵەی پێوەبکرێ، لەبەر ئەوەی بەشێکە لە جەستەی ئادەمیزادو خوای پەروەردگاریش ڕێزی لە ئادەمیزاد گرتووەو حەرامی کردووە کە مامەڵە بکرێت بە هەموو ئەو شتانەی ئەو ڕێزە دەیان گرێتەوە.

## جین لە قورئانی پیرۆزدا

قورئانی پیرۆز ئامارەی بەوەکردووە کە (جینات) سیفاتە بۆماوەییەکان لە پێشینەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ پاشینەکان، خوای پەروەردگار لە چیرۆکی هۆزەکەی مەریەمەوە سەلامی خوای لێ بێ، کاتێ کە عیسای بوو سەلامی خوای لێبێ کە مەریەمە کچێکی شوونەکردوو بوو لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ (فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا

[1] بیۆلۆجیا زانستی زیندەوەر زانیو زانستی بوونەوەری زیندوو دابەش دەبێ بۆ زانستی ژیانو زانستی رووەك.

تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا (٢٧) يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا)[١] ناوەڕۆكی ئەو دوو ئایەتە پیرۆزە: ئەوەیە كە ڕەفتاری پاشینەكان ئەگەر خراپ بوویێ، ئەوا لەیەكێك لەباوكو دایكی یەوە یاخود لە هەردوكیانەوە بۆی ماوەتەوە، ئەوەش لەڕێگای جیناتە بۆماوەییەكانەوە، كارێكی نامۆ نی یە ئەگەر كوڕێك ڕەفتارێكی تاوان كاری بگرێتە بەر یەكێك لەباوكو دایكی لەو شێوەیە بوون، بەڵكو كارێكی نامۆیە ئەگەر منداڵێكی چاك لەخراپێك ببیێو منداڵێكی خراپ لە چاكێك ببیێ، خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا (٢٦) إِنَّكَ إِنْ تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا)[٢] لەبەر ئەوەی ئامادە بوونی خراپەكاری بەهۆی جیناتەوە لەپێشینەوە دەگوێزرێتەوە بۆ پاشینە.

ئەوەش بەڵگەیەكی ڕۆشنە لەسەر ئەوەی كە لەلاشەی ئادەمیزاددا گەردیلە هەن، كاریان گواستنەوەی سیفاتی بۆماوەییەو قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی پیێ كردووە بە سەدان ساڵ لەپێش دۆزینەوەی زانستی دا.

## جین لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ

بەسەدان ساڵ لەپێش ئەو دۆزینەوە تازانەی كە پەیوەندییان هەیە بە كاریگەری سیفاتە بۆماوەییەكانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو كاریگەریە جینییەی ڕوون كردۆتەوە بەوشەیەك كە هاومانایە لەگەڵ (جین)دا ئەو وشەیەش (عرق)ە، پێغەمبەری خوا ﷺ گەنجەكانی ئومەتەكەی دەدوێنیێ بۆ ئەوەی لەكاتی هەڵبژاردنی هاویەشی ژیانیاندا هاوسەری چاك هەڵبژێرن كە دەفەرمویێ: (تخيروا لنطفكم فإن العرق نزاع)[٣]

---

[١] سوورەتی مەریەم /٢٧-٢٨.

[٢] سوورەتی نوح /٢٦و٢٧.

[٣] الحديث عند ابن ماجه وقد انفرد به عن أصحاب الكتب السبعة.

واتە سیفاتی بۆماوەیی دەگوێزرێتەوە، ئەگەر چاكە بەچاكی ئەگەر خراپەش بەخراپی.

لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێت (تزوجوا في الحجر الصالح فإن العرق دساس)[1].

مانای ئەو دوو فەرموودەیە بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە وشەی (العرق) هاومانایە لەگەڵ وشەی (الجين)دا.

# جێباسی دووەم:

# هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلام لەحوكمی مامەڵەكردن لەگەڵ جیندا لەبەرتیشكی دۆزینەوەكانی زانستی نوێ دا

لای خەڵكی ژیر شاراوەنی یە كە هەموو دەوڵەتێك لەجیهاندا خاوەنی دەستووری خۆیەتی، كە بنەما گشتی یەكانو رێسا گشتی یەكانی لەخۆی گرتووەو دەسەڵاتی داوەتە یاسادانەر كە یاسا دابنێت، بەمەرجێك ئەو یاسایە پێچەوانەی دەستوور نەبێت، ئەوەیە كە ناوی لێ نراوە دەستوری كردنی یاساكان، لەهەندێ وڵاتاندا دادگای باڵا هەیە بۆ چاودێری كردنی بەدەستووری كردنی یاساكان.

بەوشێوەیە قورئانی پیرۆز بۆ خێزانی مرۆڤایەتی وەكو دەستوورێكی نەمر وەهایە، قورئانی پیرۆز حوكمی وردەو بەشییەكانی لەخۆی نەگرتووە، گەر وانەبوایە كەمو كوڕی یاسادانانی تیادا دەبوو، لەبەرئەوەی دەقەكان كۆتایی پێ هێنراون بەشەكانی كۆتایی پێ هێنراونین، بەڵگە نەویستیشە كە كۆتایی پێ هێنراو بەكۆتایی پێ هێنراو نەبێت پەی نابات، لەبەر ئەوە قورئانی پیرۆز لەسەر ئەو (كليات) گشتبونانە وەستاوە كە لەوانە پەیی بە بەشەكانو تازە ڕووداوەكان دەبێت، با كە كۆتایی پێ هێنراویش

[1] الذهبي/ تلخيص العلل المتاهية/ ٢٠٦، العراقي تخريج الأحياء ٢/٥٣.

نەبن، خوای پەروەردگار دەسەڵاتی داوەتە ئەقڵی ئادەمیزاد کە بەشەکان بگەڕێنێتەوە سەر ئەو گشتی یانەو لە نزیکەی پەنجا ئایەتی قورئان دا فەرمانی کردووە بە بەکار هێنانی ژیریو عەقڵ، چوارچێوەیەکی ڕەوشتیشی بۆ ئادەمیزاد دروست کردووەو فەرمانی پێ کردووە ژیانی ببزوێنێو ڕێکیبخات لەهەموو کاتو شوێنێکدا لەو چوارچێوە ڕەوشتیەدا خوای پەروەردگار لەهەموو شتێکدا وە لەهەموو هەڵسو کەوتێکدا وە لەهەموو ڕووداوێکدا حوکمی شەرعی دیاری کراوی هەیە لەبڕیارە شەرعی یە تەکلیفیەکان کە پێنجن، ئەمانەن:

(فەرز)، سونەت، حەرام، مەکروە، موباح، ئەو حوکمەس دەقی لەسەر هەیە، یاخود لە قورئانی پیرۆزدا یاخود لە سونەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ یان بەجێ هێڵراوە بۆ عەقڵی ئادەمیزاد، کە بە کۆشش کردن لەڕێگای گەڕانەوەی بەشەکان بۆ گشتی یەکان بیدۆزرێتەوە.

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ)[1] کێشەو جیاوازی لە زانینی حوکمی شتێکدا لەکاتێکدایە کە دەقێك بوونی نەبێت، گەڕانەوە بۆلای خوای پەروەردگاریش، واتە گەڕانەوە بۆ قورئانی پیرۆز، بە گەڕاندنەوەی بەشەکان بۆ گشتی یەکان، بەهۆی زانینی حوکمەکانی یەوە، وە گەڕانەوەش بۆ پێغەمبەری خواﷺ، گەڕانەوەیە بۆ سونەتەکانی، بەگەڕاندنەوەی بەشەکان بۆ گشتی یەکان لەڕێگای ئیجتیهاد کردنەوە.

موجتەهیدیش لەسەریەتی ئەو حوکمانەی خوای پەروەردگار بدۆزێتەوە کە دەقی تایبەتی لە بارەیانەوە نەهاتووە، ئەگەر پێی گەیشتو پێکای ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، پاداشتێك لەسەر کاری کۆششەکەی کە کردوویەتی، پاداشتێك بۆ گەیشتنێتی بە حوکمەکەی خوای پەروەردگار، خۆ ئەگەر گەیشت بە حوکمێك جیاواز بوو لە

[1] سوورەتی نیساء /٥٩.

حوکمەکەی خوای پەروەردگارو هەڵەی کرد، ئەوا یەك پاداشتی بۆ هەیە لەسەر کاری کۆشش کردنەکەی، ئەوەش بەپێی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ (إذا حكم الحاكم (أي اذا أراد أن يحكم) فاجتهد ثم أصاب فله أجران واذا حكم واجتهد ثم اخطأ فله أجر)[1].

واتە: (ئەگەر دادوەرێك دادوەری کرد، واتە: ئەگەر ویستی بڕیارێك بدات، ئیجتیهادی کرد پاشان پێکای ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر دادوەری کردو ئیجتیهادی کرد پاشان هەڵەی کرد، ئەوا پاداشتێکی بۆ هەیە).

هەرکەسێك سەرنجی لەدەقە شەرعیو ڕێسا گشتی ئیجتیهادە گشتیو بنەما فیقهیەکان بدات دەبێت دۆزینەوەی حوکمی خوایی کە دەقێکی لەسەر نی یە، دەگونجێ پەیڕەوی یەکێك لەم سێ شێوازە بکات:

شێوازی بەرژەوەندی

شێوازی سووڕانەوەی حوکم لەگەڵ هۆکارەکەی دا بەپێی بوونو نەبوون.

وە شێوازی بەچاکدانانو خراپدانانی عەقڵی.

---

[1] صحيح مسلم كتاب الأقضية ژمارەی فەرموودە /٤٤٨٧.

# جێباسی سێهەم:
# ڕێگای بەكارهێنانی بەرژەوەندییەكان

ڕێبازی یەكەم بریتی یە لەڕێبازی زانایانی بنەماكانی ئاین (علماء اصول الدین)، ئەوەش بەكارهێنانی بەرژەوەندیە ئادەمیزادییەكانە بۆ زانینی حوكمی شتەكان لە ڕەفتارو ڕووداوە تازەكان، ئەوانەی دەقیان لەسەر نی یە، لەسەر ئەو بنەمایەی كە حوكمەكانی خوای پەروەردگار بەستراون بە ئامانجەكانیانەوە ئەمەش بەرژەوەندیە سەبارەت بە ئادەمیزادو سەبارەت بەشەریعەتی ئیسلامیش ئامانجە.

ئەو بەرژەوەندیانەش، هەیانە زەروریەو هەیانە پێویستی یەو (حاجیات) هەشیانە بۆ زینەتو جوانی یە (كمالیات)، لەبەرژەوەندییە زەروریەكان وەكو: پاراستنی دینو پاراستنی ژیانو پاراستنی ئابڕوو پاراستنی دارایی‌و پاراستنی ژیری، ئەمانە بۆ هەموو كۆمەلگەیەك زەرورین، ئەگەر یەكێك لەوانە تێك چوو مانای وایە سیستەم لەو كۆمەلگەیەدا تێك چووە.

سەرچاوەی پێویست بوونی داواكردنی بەرژەوەندیەكانی ئادەمیزادی بۆ دۆزینەوەی حوكمەكانی خوای پەروەردگار لەوانەدا كە دەقی لەسەر نی یە، فەرموودەی خوای پەروەردگارە كە پێغەمبەرەكەی ﷺ كە موحەمەدە دەدوێنی‌و دەفەرموێ: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ)[1]، ڕەحمەت لەو ئایەتە پیرۆزەدا بریتیە بەرژەوەندی ئادەمیزادی كە دوو لایەنی هەیە: لایەنی ئەرێنی.

بەو پێیە ئامانج لە هەموو حوكمەكانی كە داوای پێ لە ئادەمیزادكراوە بریتی یە لە شوێن ئامانجەكان شەریعەتو بەرژەوەندییەكانی ئادەمیزاد، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار بێ نیازی ڕەهایە لە دروستكراوەكان، جا هەموو ئەو شتانەی كە سوودی

[1] سوورەتی ئەنبیاء /١٠٧.

ئادەمیزادییان تێدایە لە شتەنوێو دۆزراوەكان، حوكمەكەی بریتیە لە دروستیو ڕێپێدان، ئەگەر هاتوو ئەو سوودە لەسەر حسابی زیانی كەسانی تر نەبێت، یاخود لەسەر حسابی بەریەك كەوتن نەبێت لەگەڵ ڕێزی ئادەمیزاددا، بەڵام هەرشتێك زیانی تیادابێت ئەوە حەرام كراوە، ئەگەر لەسەر ئەو زیانە سوودی گرنگتری تێدا نەبێو بەرژەوەندی گشتی تیادا دانەمەزرێ، هەروەكو سزادانی تاوانبار زیان بەخشە بۆخۆیو خێزانەكەیو بەڵكو بۆ كۆمەڵگەكەشی بەڵام دروستو ڕێپێدراوە، لەبەر ئەوەی پاراستنی گیانی بێتاوانانو داراییو ماڵو ئابڕوویانی تیادایە، جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕێبازەدا ئەگەر لەڕووی زانستیو كردارییەوە سەلما كە مامەڵەكردن لەگەڵ جیناتەكانی ئادەمیزادی دا بەرژەوەنی گشتی تیایدابوو، وە لەزیانو خراپەكاریی یەوە نزیك نەبوو ئەوە ڕێ پێ دراوە، ئەگینا حەرامە، لەهەندێ بواردا ڕێپێدراوەو لەبوارەكانی تردا حەرامە بەپێی پێوەری سوودوزیان.

ئەوەی شایانی باسە حوكمەكانی خوای پەروەردگار پەیوەست كراون بەمەبەستەكانیانەوە جێگای جیاوازی نێوانی مەزهەبە فەلسەفیە ئیسلامی یەكانن، وەكو ئەشعەریەو موعتەزیلەو ماتریدی، هەیانە وتویەتی كەوا بڕیارەكانی خوای پەروەردگار نەبەستراون بە ئامانجەكان، ئەو ڕایەشیان بۆ ئەوە وەرگێڕاوەتەوە ئەگەر حوكمەكەی (یاخود كارەكەی) خوای پەروەردگار بۆ مەبەستێك بێ لەدەست كەوتنی بەرژەوەندییەك یاخود دوورخستنەوەی خراپەیەك، ئەو حوكمە لە خودی خۆیدا كەمو كوڕی دەبوو بەهۆی ئامانجەكەوە تێروتەواو دەبوو[1].

بەڵام جیاوازی یە كە ڕواڵەتیە لەوبارەیەوە چونكە ئەگەر مەبەستت هێنانی بەرژەوەندیو دوورخستنەوەی خراپەكاری نەبگەڕێتەوە بۆ خوای پەروەردگار خۆی، ئەوە ناڕەوایە لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار بێ نیازی ڕەها ـە لە هەموو دروستكراوەكان، ئەگەر هەموو خێزانی مرۆڤایەتی بەدرێژایی ژیا یان لەسوجدەو

[1] شرح المواقف لەنوسینی زانای بەڕێز قازی عضدالدین و الملة الأیجي شەرحەكەشی لەنوسینی بەڕێز شریف جرمانی و پەراوێزی حسن جلیل و پەراوێزی مسعود زواني ٣/١٤٥.

گوێڕایەڵی خوای پەروەردگارین هەر لەسەرەتای دروستبونی سەر زەوی یەوە تا كۆتایی هاتنی ژیان لەسەر ئەم هەسارەی زەویە ئەوا یەك گەردیلە لە گەورەیی خوای پەروەردگار زیاد ناكات، خۆ ئەگەر لەناویێ دینیو بێ بڕوایی دا نوقم بوون بەوەش یەك گەردیلە لە گەورەیی خوای پەروەردگار كەم ناكات.

وە ئەگەر مەبەست لەوە هێنانی بەرژەوەندیو دوورخستنەوەی زیانو خراپەكاری بێت بۆ بەندەكانی، ئەوە ڕاستو جێگیربە بەو دەقە قورئانیانەی كەهۆی حوكمەكانیانی بەستوەتەوە بە بەرژەوەندی یە ئادەمیزادی یەكانەوە، هەروەكو لەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرموویەتی: (وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ)[1].

پیتی (ف) لەو ئایەتەدا بۆ هۆیە، واتە هۆكاری پێویست بوونی تۆڵەسەندنەوە لەسەر تاوانكاری دەستدرێژكار لەسەر ژیانی ئادەمیزادێكی بێتاوان بریتییە لە پاراستنی ژیانی بێ تاوانەكان، لەبەر ئەوەی ئەگەر كەسێك زانی ئەگەر بكوژێ دەكوژرێتەوە ئەوا زۆر بەی جار هەڵناسێ بە ئەنجام دانی تاوانی دەستدرێژی كردنە سەر كەسەكان.

هەروەها خوای پەروەردگار فەرزكردنی نوێژی بەستوەتەوە بە دەست هێنانی وزەی گیانی كە ئادەمیزاد دوور دەخاتەوەو لە ڕەفتارە تاوانكاریەكان دەیپارێزێ. جا ئەو وزەیە وەكو بەرگریكردن وەهایە لەدژی نەخۆشیە كۆمەڵایەتی یە لەناوبەرەكان، لەبەر ئەوە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ)[2].

لەم پەیوەستكردنەی ئەو دوو حوكمە قورئانیەی لەودوو ئایەتەی كە باسكراونو لە ئایەتی تریش دا دەگەینە ئەوەی كە ئامانج لەو ئەمرانەی كە داوا لە ئادەمیزاد كراوە جێبەجێیان كات دووركەوتنەوە لە قەدەغەكراوەكانی پەروەردگار، بریتی یە لەبەرژەوەندیە ئادەمیزادیەكان، لەهێنانی قازانجو دوورخستنەوەی زیانەكان، لەمەوە

[1] سوورەتی بەقەرە /١٧٩.

[2] سوورەتی عەنكەبووت /٤٥.

دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە هەرکەسێك شایستەی ئیجتیهادکردنبوو داتوانێ حوکمی تازەکانو دۆزینەوە زانستی یەکان لەسەر بەرژەوەندیە ئادەمیزادیەکان دابمەزرێنێتو حوکم بدات بەوەی سوودی ئادەمیزادی تیادلیە، ئەوە دروستو رێپێدراوە، ئەوەش کە زیانی تیادایە ئەوە قەدەغەکراوە.

## سوورانەوەی حوکم لەسەر هۆکارەکەی

رێبازی دوهەم بۆ دۆزینەوەی حوکمەکانی خوای پەروەردگار لەوەدا کە دەقی تیادا نی یە، رێبازی زانایانی بنەماکانی شەریعەتە (علماء اصول الفقة)، ئەوەش رێگای سورانەوەی حوکمە لەگەڵ هۆکارەکەی دا بوونو نەبوونی، گشتییەکانی (کلیان) قورئانو سونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوانەی.کە عەقڵی ئادەمیزاد پەی بەهۆکارەکەی دەبات، ئەوەش زۆرینەیە، ئەو هۆکارەش یاخود لەدەق دا بەراشکاوی باسی کراوە، پێی دەوترێت هۆکاری دەقدار، جا حوکمی ئەوە حوکمی دەقێکی راشکاوە لەبەڵگەو پەیوەست بوون دا. جا لەهەر شتێکدا ئەو هۆکارە هاتەدی، حوکمی دەقەکە دەبێت بێتەدی، هەشیانە دەرهێنراوە، موجتەهید لەناوەرۆكو گیانی دەق دا دەری دەهێنێ، جا هەموو بەشێك لەشتە تازەکان دەقی تایبەتی لەبارەیانەوە نەهاتووە، بەڵام هۆکاری حوکمەکەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت، لەسەر بناغەی رێسایەك کە دەڵێ: (حوکم لەسەر هۆکارەکەی دەسوورێتەوە بەبوونو نەبوونی).

بۆ نمونەو روونکردنەوە، لەگەڵ ئەو هۆکارانەی کە راشکاونو لە گشتی قورئانی پیرۆزدا دەقیان لەسەر هاتووە، لە فەرموودەی خوای پەروەردگاردا هاتووە (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا)[1].

مەبەست لە (الإثم) لەو ئایەتە پیرۆزەدا بریتییە لەزیان بەبەڵگەی ئەوەی لەبەرامبەری دا (النفع) سوود هاتووە. جا خوای پاکو باڵا لەسەر بڕیاری عەرەقو

[1] سوورەتی بەقەرە /٢١٩.

قومـار وەڵامـی نەداوەتـەوە كـە حـەرامن، بـەڵكو بـەهۆكاری حوكمەكـەیان وەڵامـی داوەتەوە كە زیانبەخشەو زیان بەخشیەكەی زاڵە بەسەر سوودەكەی دا، حـوكمیش لەو شێوازە خوایی یەدا بریتیە لە ئاگاداركردنەوەی عەقڵی ئادەمیزاد لەسـەر ئـەوەی كە هەموو شتێك لە ژیاندا ئەگەر زەرەری زیاتربوو لە قازانجی، ئەوە حەرامـە، وەكـو حەرام كردنی عەرەق‌و قومار، جا لەسەر ئەو ڕێسا قورئانی یەو هۆكارەكەی كە دەقی لەسەر هاتووە دەگونجێ لەحوكمی مامەڵەكردن لەگـەڵ (جـین)ی ئـادەمیزادی دا وە لەگەڵ لەبەرگرتنەوەو برینەوەو چاندنی ئەندامی ئادەمیزادی‌و شتی تریش تێبگەین‌و بڵێین ئەوانە حەرامن ئەگەر جێگیر بـوو كـە زیـانی زیـاترە لـە سـوودەكەیان یـاخود یەكسـان بـووبێ، لەبـەر ئـەوەی دوورخسـتنەوەی خراپـەكاری لـەپێش تـرە وەك لەهێنانی قازانج، هەروەها ئـەو ئایەتـە پـیرۆزە بەڵگـەی ڕاشـكاوانەیە لەسـەر حـەرام كردنـی جگـەرە كێشـان، لەبـەر ئـەوەی زیـانی جگەرەكێشـان زیـاترە وەك لـەزیانی عەرەق‌و قومار، جا ئەو كەسەی عەرەق دەخواتەوەو ئەو كەسەی یاری قومار دەكات تەنیا زیان لەخۆی دەدات، بەڵام جگەرەكێش زیان لەخۆی‌و ئەو كەسانەش دەدات كە لەگەڵیا دانیشتوون، لەبەر ئەوەی هەوای دەوروبەری بـەو جگەرەیـە پـیس دەكـات هەروەها ئەوانەی لەگەڵیان لەو دوكەڵە هەڵدەمژن، كە زانا تایبەتیەكان بـەوە دەڵـێن (التدخین السلبي)، پرۆفیسۆر (كلیرت لاغرو) كـە پزیشـكێكی فەرەنسـی یـە دەڵـێ: ئەگەر كەسێك لەژورێكدا ڕۆژانە چـل جگـەرە بكێشـێ‌و منـاڵێكی شـیرەخۆریش لـەو ژورەدا بێت، وادادەنرێت كە ئەو منداڵە دە جگەرەی كێشابێ، واتە ڕێژەی زیانی ئەو كەسەی كە لەگەڵ جگەرە خۆرەكەدا دانیشتووە بریتـی یـە لـە لەسـەدا ٢٥ لـەزیان‌و مەترسی جگەرە خۆرەكە، لەو حاڵەتانەشدا كە بەرژەوەندیەكان بەریەكتری دەكەون ئەو حوكمانەی كە دەقی لەسەر نەهاتبێ، بەم پێوانانە وەردەگیرێن:

١- بەرژەوەندی گشتی پێش بەرژەوەندی تایبەتی دەخرێت، جا خزمەتی ئیلزامـی (ناچاری) لەسوپادا بۆماوەیەكی دیاری كراو بەرژەوەندیەكی گشـتی نیشـتمانی یە، پێش بەرژەوەندی ئەو كەسە دەكەوێ لـە لێبـوردنی لـەو خزمەتـە، لەگـەڵ

ئەوەشدا کە بەهانەیەك نیە بۆ ئەو لێبوردنە، ئەوەش بەپێی ڕێسایەکی شـەرعی گشـتی کـە دەڵێـت: (زیـانی تایبـەتی تەحـەمول دەکـرێ بـۆ دوورخسـتنەوەی زەرەری گشتی).

٢- بەرژەوەندی گرنگتر پێش دەخرێت لەسەر بەرژەوەنـدی گـرنگ، بـە پـەیڕەوی کـردن لـە خەلیفـەکانی ڕاشـدین، لەکاتێکـدا کـە جێبـەجێکردنی سـزادانی دزی کردنەکانیان لەساڵی وشکەساڵیو برسێتی دا وەستاند، بە بەهانەی ئـەوەی کـە بڕینەوەی دەستی دز پاراستنی سامانی تێدایە، وە لەوازهێنانیشی دا پاراستنی گیانی تێدایە، پاراستنی گیانیش لەپێشترە وەك لەچاوکردنی سـامان، ئـەوەش لەسەر ئەو ڕێسا شەرعی یە گشتی یەی کە دەڵـێ (پێویسـتی جێگـەی ناچـاری گشتی یاخود تایبەتی دەگرێتەوە) (الحاجة تنزل منزل الضرورة عامة أو خاصة).

٣- زیانێك کە مەترسی کەمتربێت هەڵدەبژێردرێت بـۆ دوورخسـتنەوەی زیانێـك کـە مەترسی زیاتربێ جا ڕێگە بەوە دراوە کە ئەندامێکی تـووش بـوو بەشـێرپەنجە ببڕدرێتەوە، بۆ بەرگری گردن لە بڵاوبونەوەی لە ئەندامـەکانی تـری لاشـەکەدا، ئەوەش بەپێ‌ی ئەو ڕێسا شەرعی یە گشتی یەی کـە دەڵـێ: (زیـانی تونـد تـر، بەزیانی سوکەڵەتر دەڕوا).

٤- ئەگـەر زیانێـكو سـودێك لەیـەك ئـاڵابوون بەشـێوەیەك نـەدەتوانرا لەیـەکتری جیابکرێنەوە، ئەوا چاوپۆشی دەکرێ لەسوودەکە بۆ دوورخستنەوەی زیانەکە، ئـەوەش بـەپێ‌ی ئـەو ڕێسـا شـەرعیە گشـتییەی کـە دەڵـێ (دوورخسـتنەوەی خراپەکان لەپێش ترە وەك لە هێنانی سوودەکان) بەڵام لەو بارودۆخەدا ئەگـەر سوودەکە گرنگتر بوو وەك لەسوودی وازهێنـان لەزیانەکـە، ئـەوا واز لەزیانەکـە دەهێنرێت، بۆ بەدەست هێنانی سوودەکە، جا ڕێگە دراوە بە سزادانی تاوان بار لەگەڵ ئەوەشدا کە زیان لـەخۆی خێزانەکـەیو لـە کۆمەڵگەکـەش دەدا، لەبـەر ئەوەی سوودی گرنگ تری تێدایە، کە بریتی یە لە مـافو گیـانو ئـابڕوو مـاڵو سامانی سەقامگیری خەڵکی.

لەخستنەڕووی ئەو ڕێسا شەرعی یانەوە دەتوانرێن ڕێسا گشتی یەكان لەو سەرچاوەی بڕیاردانە ئەژمار بكرێ كە دەقیان تێدا نی یە، بەڵام جێبەجێكردنی ڕێسا گشتی یەكان لەو بوارەدا دەگەڕێتەوە بۆ جێبەجێكردنی بەرژەوەندی لەڕاستیو واقیع دا سەرچاوە بریتی یە لەو كە ڕێسای گشتی لەخۆی دەگرێت.

## جێباسی دوهەم:
## بەچاك دانان و بەخراپ دانانی عەقلكاریی

ڕێبازی چوارەم بۆ دۆزینەوەی حوكمی خوای پەروەردگار لەوەدا كە دەقی تیادا نیە، ڕێبازی بەچاك دانانو بەخراپ دانانی عەقلكاریی، ئەوەش ڕێگای فەیلەسوفە موسڵمانەكانە لە موعتەزیلەو ماتریدی، لەیەك كات دا ڕێگای شەرعیشو فەلسەفیشە، ئەوان دەڵێن: بۆ دۆزینەوەی حوكمی خوای پەروەدگار لەوەدا كە دەقی تیادا نی یە، دەڕوانرێتە چاكیو خراپی ڕەفتارەكە، ئاشكراشە كە چاكی هەر شتێك لەسەر قازانجەكەی دروست دەكرێت، هەروەكو خراپی هەرشتێكیش لەسەر زیانەكەی دروست دەكرێت.

لەسەر ئەم ڕێبازەش بنەمایەكیان دارشتوە كە دەڵێ: عەقڵ دۆزەرەوەی حوكمەكانی خوای پەروەردگارە لەوانەدا كە دەقیان تیادا نیە، لەپێش هاتنی پەیامە ئاسمانی یەكان یاخود لەدوای ئەوان، بەرپرسیارێتی سزادانو مەدەنیەتییان لەسەر هەر ئادەمیزادێك داناوە كە دەقی پێنگەیشتووەو پێی ئاشنا نەبووە لەپێش هاتنی پەیامو لەدوای هاتنیشی، ئەگەر كارێكی ناڕەوای ئەنجام دابێتو زیانی كەسانی تری لەسەر جێگیر بووبێ لەسەر ئەو بنەمایەی كە عەقڵ دەتوانێ هەستی پێ بكات لەڕێگای بەچاك دانانو بەخراپ دانانی عەقلكاریەوە ئەو ڕەفتارانەی ئادەمیزادیش كە وەسف كراون بەپێنج حوكمە شەرعی یەكە ئەمانەن:

١- واجب: ئەوەیە كە كردنی باشەو نەكردنی خراپە، وەكو باوەڕبوون بەخوای پەروەردگارو دادپەروەری لەنێوانی خەڵكی دا.

٢– حەرام: هەموو ئەوانەیە کە کردنیان خراپەو واز لێ هێنانیان چاکە، وەکو زۆر داریو ناپاکی لە ئەمانەت.

٣– مەندوب: هەموو ئەوانەیە کە کردنیان چاکترە لە نەکردنیان، وەکو سەردانی نەخۆش.

٤– مەکروه: هەموو ئەوانەیە کە وازهێنان لێیان چاکترە وەك لە کردنیان، وەکو بەبێ بەهانە خۆتێ هەڵقورتاندن لە کاروباری خەڵکی.

٥– موباح: ئەوەیە کە چاکیو خراپی یەکەی یەکسانن، یاخود تیایدا هەست بە چاکەو خراپەکەی ناکرێت، وەکو تایبەت کردنی کاتی دیاری کراو بۆ خەوتن یاخود بۆ خوێندنەوە یا هاوشێوەیان.

ئەم ڕێبازەفەلسەفی یەیە کە بەکاردەهێنرێت بۆ دانانی یاسا دەست کردەکان، ئەوەش بەڕای من ڕێگایەکی چاکە، لەبەر ئەوەی شەریعەتی ئیسلامی لە فەرمان کردنەکانی داو لە قەدەغەکردنەکانی دا بە ئادەمیزاد ناڵێ ئەوە بکەو عەقڵی سەلامەتیش بڵێ ئەوە مەکە، شەریعەتی ئیسلامی ناڵێ ئەوە مەکەو عەقڵی سەلامەتیش بڵێ بیکە، ئەوەش لە قورئانی پیرۆزو لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ جێگیر بووە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە خاوەنی زانیاری عەقڵی سەلامەتن.

ئەو سێ ڕێگایەی کە باسکران لەیەکەوە نزیکن لەبەر ئەوەی هەر یەکە لەوانە لەسەر بناغەی سوودو زیانی ئادەمیزاد دامەزراوە، ئەگەر بە زانستیانەو بە کرداریی سەلما کە لەئێستاو لەداهاتوودا تازەو دۆزراوەیەك سوودی هەبوو وە ئەو سوودە بەراورد نەکرا بە زیانێکی گەورەتر یاخود یەکسان نەبوو، ئەوە ڕێپێدراوە، ئەگینا حەرامە.

جا ئێستا پرسیار دەکەین لەو کەسانەی کە تایبەت مەندن لە زانستی جیندا، ئایا لە مامەڵەکردن لەگەڵی دا سوودی ئادەمیزادی تێدایەو زیانی گەورەتری بەدوادا نایەت یاخود یەکسانە لەگەڵی دا یاخود نا، جا لەسەر مەزەندەکردنی یەکەم مامەڵە کردن

ڕێپێدراوەو لەسەر دوهەم حەرامە.

بەڵام بڕیاردان لەسەر مامەڵە كردن لەئێستادا لەگەڵ جیناتـەكانی ئـادەمیزادی دا بەڕێپێدان یاخود بەحەرام كردن هێشتا كاتی نەهاتووە لەبەر ئەم هۆكارانە:

یەكـەم: بیروبۆچـونەكە لەلایـەنی زانسـتی یـەوە سـەركەوتن‌و ئەنجامەكـەی دەرنەكەوتووەو هێشتا جیاوازی هەیـە لـەبارەی چۆنیەتی جێبـەجێ كـردن‌و كـەم‌و كوڕیەكانی‌و ئەو مەترسیانەی كە لەهەندێ بـارودۆخ دا چـاوەڕێیان دەكرێـت، هێشـتا بیرو ڕاكە لەقۆناغی هیوا خواسـتن دایـە، هەیانـە دەڵـێ: دەگـونجێ شـارەزابوون لـە چارەسەر بە (جـین)دا بـەكاربهێنرێت لـەزۆر چارەسـەر كـردن دا لـە نەخۆشـیەكانی ئادەمیزادو گیانداران‌و ڕووەكەكان دا، ئەو ئاراستەیە وای دەبینـێ كـە شـارەزایی لـە چارەسەركردن بە جیناتـەكان هیـوا تـازە دەكاتـەوە بـۆ ڕزگـاربوون لـە دێوەزمـەی نەخۆشـی یـە بۆمـاوەیی یـەكان، ئـەو ئاڕاسـتەیە وای بۆدەچـێ چارەسـەری جینـی بەكاربهێنرێت بۆ چارەسـەری نەخۆشـیە شـێرپەنجەكان‌و نەخۆشـیەكانی دەمـاری‌و نەخۆشیە كانی كەم خـوێنی‌و نەخۆشـیەكانی نـەبوونی بـەرگری تونـد وەكـو ئایـدزو نەخۆشیەكانی تر.

پشتیوانانی چارەسەری جینی وای بۆدەچن كە چارەسەر دەگونجێ بـۆ گـۆڕینی جیناتە داواكراوەكان بێت، یاخود قەرەبووكردنەوەی جیناتە ون بووەكان بە جیناتی سەلامەت، كارە داواكراوو ون بووەكان دەگێڕێتەوە بۆ زیندەكاری‌و سروشتی خۆی.

بەڵام ئاڕاستەیەكی تر بەڕەشبینانە بیرو بۆچوونی جیاواز لەوەی هەیە، دەڵێ لەگەڵ بوونی هیواو ئەو چاوتێبڕینانەی كە تایبەتمەندە لێكۆڵەرەوەكان لەبواری چارەسەری جیناتەكان دا وێنەیان كێشاوە، لەوێدا چارەسەركردنی زۆر هەن لە خستنە ناوەوەی جیناتەكان‌و گەیاندنیان بۆ ئەو شانانەی مەبەستن‌و ڕام كردنی بۆ دەرخستنی كاری‌و زامن كردنی بەردەوامی كارەكەی لەژێر سیستەم‌و زاڵ بوونی لاشەدا.

خاوەنی چارەسەرە ڕەش بینەکان دەڵێن: چارەسەرکردنی جینی خاڵی نابێ، لەمەترسی یەکان، کە لەمیانەی کارەکانی جێبەجێکردن دا لەسەر ئاستی گوێزراوەی جینەکە دەردەکەون، بۆ نمونە: بەکارهێنانی ڤایرۆسەکان وەکو گوێزەرەوەکان دەبێتە هۆی چالاك بوونی ڤایرۆسەکانی نەخۆشی کە لەپێش تردا لەلاشەی نەخۆشەکەدا نەدۆزراونەتەوە، لەدوای ئەوەش کاردەکاتە سەر ژیانی یاخود کاری گەری دەبێت لەسەر پێك هاتەی بۆماوەیی بۆنەخۆشەکە بە چالاك کردنی جیناتە بێ بنەماکان، ئەوەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی شوێنەواری نەخۆشی کە زیاتر توندترو مەترسی دارترە لەو نەخۆشیەی کە مەبەستە چارەسەر بکرێ، بێجگە لەو تێچونە زۆرە کە لەکاری چارەسەری جینی دا بەکار دەهێنرێت.

دوهەم: هێشتا ماوەی بەریەك کەوتنی مامەڵەکردن لەگەڵ جینەکان دا بۆڕێزو حورمەتی جەستەی ئادەمیزاد نادیارە، بڕیاردانیش لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ جیناتەکان لەسەر زانیاری ئەو ماوەیە وەستاوە، لەبەر ئەوەی دووبارەی دەکەمەوەو دەڵێم حوکمڕان لەسەر کاری جیناتەکان بەحەرام کردن لەسەدا سەد یاخود حەڵاڵ کردن لەسەدا سەد هێشتا کاتی نەهاتووە.

## چاك و خراپی مامەڵەکردن لەگەڵ جینی ئادەمیزادیدا ئێستادا:

زانا تایبەتمەندەکان لەڕێگای تاقی کردنەوەو پێش بینی یەکانی داهاتووەوە گەیشتوونەتە ئەوەی کە جیناتەکان چاکیو خراپیشیان هەیە.

### یەکەم: چاکەکانی:

بەشێوەیەکی گشتی چاکەکانی جیناتەکان لەمانەدا ئەژمار دەکرێت:

١- دەگونجێ هۆرمۆنی ئەنسۆلین لەجینات بەرهەم بهێنرێت بۆ بەکارهێنانی لە چارەسەرکردنی تێکچوونی گەشەکردن لە منداڵاندا، وە بۆچارەسەرکردنی کورتە باڵا بوون، وە هەندێ لەبارودۆخەکانی نەزۆکی، وە چارەسەرکردنی نەخۆشی

شەكرە لەڕێگای بەكارهێنانی جینەكانەوە بەڕێگا زانراوەكان لەلای تایبەت مەندەكان.[1]

٢- تەكنیكی ئەندازیاری بۆ ماوەیی لەڕێگای تاقی كردنەوەوە سەركەوتنی بەدەست هێنا لە چارەسەركردنی زۆرێك لەو نەخۆشی یە بۆماوەییانەی كە بەهۆی كەموكوڕی جیناتەكانەوە یاخود بەهۆی نەنگی توش بوونیەوە پەیدا دەبێ، ئەوەش بەدەرهێنانی جینە خەوشدارەكە یاخود چارەسەركردنی یەوە لە ئەنیمای بۆماوەیی و (التلیف الحویصلی[2]).

٣- چارەسەری پیربوون و نەخۆشیەكانی، ئەوەش بەهۆی لەسەر یەك كەڵەكەبوونی گەردیلە خراپ بووەكانی شانەكانەوە پەیدا دەبێ، هەروەكو دەبێتە هۆی خراپ بوونی هەندێ لە چێنراوەكان و پوكانەوەی دەمارەكان، لەبەر ئەوە دەبینین ئەو كەسانەی چوونەتە ساڵەوە زۆرجار بەدەست نەخۆشیەكانی دڵ و شێر پەنجەوە ناڕەحەتن، دەتوانرێ دەست بگیرێت بەسەر ئەو دیاردانەدا لەڕێگەی لەبەرگرتنەوەی شانە تازەكان و گۆڕینیان بە كۆنەكان.

٤- لەپاش ئەوەی لێزەر شكستی هێنا لەدانانی سنوورێك بۆ گەشەكردنی شانە شێرپەنجەییەكان، زانا پسپۆڕەكان ئەوەیان دۆزیەوە كە وەرگرتنی ڕێگای تازە بۆ چارەسەركردنی شێرپەنجە لەپێویستی یەكانە، بەخستنە ناوەوەی جیناتە دژەكان بۆ دەستە جینیە ڤایرۆسی یەكان بەشێوەیەك لەسەر وێران كردنی دەستەی بۆماوەیی بۆ ڤایرۆسەكان كاردەكات.[3]

---

[1] مامۆستا عبدالباسط: عصر الجینات بلاوكراوەی دارالرشاد، لە قاهیرە، ساڵی/١٩٩٨، لاپەڕە/١٢٠و دواتر.

[2] د. هدی صالح مهدی هماش: الهندسة الوراثیة موسوعة علوم بغداد، ساڵی/١٩٨٧، لاپەڕە/١٠٤و دواتر.

[3] مامۆستا عبدالباسط، عصر الجینات، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە/١٠١و دواتر.

٥- دەگونجێ چارەسەری کەموکوڕی گورچیلە بکرێ، لەجیاتی کاری نەشتەرگەری بۆ لەڕەگەوە دەرهێنانی گورچیلەکەو چاندنی گورچیلەیەکی تر، یاخود توێ کاری گورچیلە یاخود شۆردنی گورچیلە، کە کارێکی ئاڵۆزەو سەرئەنجامیشی دڵنیا نی یە، ئەوەش لەڕێگای خستنە ناوەوەی ئەو جیناتانەی بۆ زاڵ بوون بەسەریا پێك هاتوون، ئەوەش بریتی یە لە یەکەی دەرهێنانی زۆرێك لە جیاتی کرداری توێ کاری یاخود لەبەرگرتنەوەی یاخود چاندنی لە حەوزی گورچیلەدا یاخود ڕاست کردنەوەی دەستەی بۆماوەیی بەخستنە ناوەوەی ئەنزیماتی خۆیی تایبەت بەو.[1]

٦- چارەسەرکردنی هەندێ لە نەخۆشی یە گرانەکان، وەکو نەخۆشی ئایدز (یاخود کەمی بەرگری نەخۆشی) بەناردنە ناوەوەی جیناتی دژ بۆونکردنی ڤایرۆسی، یاخود بردنە ناوەوەی جیناتەکان بۆ بەستنی چالاکی ڤایرۆسی بەگۆڕینی بۆ پاڵفتەیەکی ڕەق[2].

٧- بەرهەم هێنانی دەرمان بەرتێچونێکی کەم، بە بەکارهێنانی گیانداران و ڕووەکەکان وەکو کارگە بۆیان، لەڕێگای بردنە ناوەوەی جینی ئادەمیزادی کە مادەی داواکراو بەرهەم دێنێ بۆ مادەی بۆماوەیی بۆ گیانداران یاخود ڕووەکەکان، وە لەڕۆژی ٩/٥/٢٠٠٧ دا کەناڵی (B.B.C) بەریتانی ڕای گەیاند پزیشکەکان ئەوەیان دۆزیوەتەوە کە دەگونجێ چارەسەری نەخۆشی یە دەروونی و عەقڵی یەکان بکرێت لەڕێگای بەکارهێنانی جیناتەکانەوە، بەڵام زانیاری زیاتری نەدا لەبارەی چۆنیەتی ئەو بەکارهێنانەوە.

---

[1] مامۆستا عاطف عادل: الهندسة الوراثية الايصاء والمحاذير کە لە ئەتروحەی دکتۆرای یاساوە وەرگیراوە کەمن سەرپەرشتیاری مەوسوعەی (الحماية القانونيه للجينات)ی دکتۆر رافد خلف بووم، لاپەڕەی/٣٢و دواتر.

[2] عبدالباسط- سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە/١١٥.

٨- بەكارهێنانی جین لەبواری ئابووری دا بۆ چاك كردنی جۆری بەرهەم هێنراوی ئاژەڵی یاخود كشتوكاڵی لەبارەی زۆریو قەبارە یاخود تام یاخود هاوشێوەی ئەمانە.

كارەكە لەم سنوورەدا ڕاناوەستێ بەڵكو تێپەڕدەكات بۆ بەرهەم هێنانی پیشەسازی، وەكو بۆ نمونە دۆزینەوەی جێگرێك بۆ نەوتو وەرگیراوەكانی لە داهاتوودا.

لێكۆڵەرەوەكانی زانستی ڕووەك لەزانكۆی میونیخ ئەوەیان سەلماندووە كە هەندێ لەڕووەكەكان توانایان هەیە بۆ پێك هێنانی بڕێك كە ڕژێنەری راتینجیەو توانای هەیە بۆ دەرهاویشتنی كەرەستەی پیترۆلیو پێك هاتەكەیو بەكارهێنانی وەكو سوتەمەنی یەك كە تێچوونی كەمەو پیس بوونی نی یە.

٩- بەكارهێنانی تەكنیكی ئەندازیاریی بۆماوەیی لە چارەسەركردنی ئەو مەترسی یەی كە دەورەی داوەو هەڕەشە لە داهاتووی ژیانی سەر هەسارەی زەوی دەكات لە گەیشتنی تیشكی سەرووی وەنەوشەیی كە دەبێتە هۆی توش بوونی جەستەی ئادەمیزاد بە چەندین جۆری جیاوازی شێرپەنجەی پێست.[1]

لەو مەترسی یانەی لەداهاتوودا توشی دانیشتوانی زەوی دەبێت، ئەوەیە بەهۆی پیس بوونەوە، چینی ئۆزۆن لەخۆخواردندایە، پیسپۆڕان ئاگاداریان لەم بارەیەوەداوەو هەوڵی چارەسەركردنیان داوە بە بەكارهێنانی تەكنیكی (جینۆم)، لەكاتێكدا تیپێكی پزیشكی توانیوێتی بیگۆڕێت بۆ وەچەیەكی بەكتریا كە دەتوانێ ئەو كەرەستە كیمیاویە یەشی بكاتەوە كە دەبێتە هۆی خورانی ئەو چینە ئۆزۆنە.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە/٦٨و دواتر.

**دوهەم: زیانی جینەکان:**

ئاشکرایە کە ئەندازیاریی جینات وەکو چەکێکی دووسەر وەهایە ئەگەر بەکارهات بۆ سوودی خەڵکی، لەبواری تەندروستی یاخود ئابووری یاخود پاراستن، پێویستە لەوێدا دوودڵییەك نەبێ بەرێپێدانی مامەڵەکردن لەگەڵی داو کردنەوەی هۆکارەکان لەبەردەمی دا.

بەڵام ئەگەر رام کرا بۆ ئەو بوارانەی زیان‌و کارەسات‌و بەڵاکان رادەکێشێ، یاخود پێچەوانەیە لەگەڵ بەهاو رەوشت‌و پلەو پایەی ئادەمیزادی دا، ئەوا لەسەر هەموو خاوەن عەقڵ‌و ژیری یەك پێویستە کە بڕیار لەدژی ئەو مامەڵەکردنە بدات وە رەدی بکاتەوەو هەموو دەرگاکان دابخات لەبەردەم بەکارهێنانی ئەو جینانەدا.

چەند نمونەیەکمان باس کرد لەسەر چاك مامەڵەکردن لەگەڵ جیناتەکان دا.

**لەمەترسی یەکانی مامەڵە کردن لەگەڵ جینی ئادەمیزادی دا:**

١- پسپۆران بەدووری نازانن کە لەداهاتوودا جینێکی نەخۆشی کاول کار، لەرێگای کردنەوەی دەرگای مامەڵەکردن لەگەڵیدا بێتە دەرەوەو ئەوە ببێتە هۆی کارەساتی تەندروستی، یاخود کەمو کوڕی لەژیانی دانیشتوانی سەر هەسارەی زەوی لەبوارێك لەبوارەکانی ژیاندا.

٢- لەوانەیە لایەنە دوژمنکارەکان لەرێگای ئەندازەی جینی بۆماوەییەوە، پەنا بەرنە بەر بەرهەمهێنانی جینی بۆماوەییەوە، پەنا بەرنە بەر بەرهەم هێنانی چەکی کاول کاری گشت گیری جینیەوە، ئەو پێشبینیانەش لەلایەن زانایانی تایبەتمەندەوە ناونراوە بە (جەنگی جینەکان) وەکو بەڵگە هێنانەوەش دەڵێن: ئەوەی لەساڵانی رابردودا قەوارەی زایۆنی پێی هەستا لەهەوڵدانی بۆ تاقی کردنەوەی جیناتی تەمەڵی‌و زۆربوونی مشك‌و هاوشێوەی ئەوانە، لەوانەی کە زیانی مادی یاخود تەندروستی دەدەن لە دانیشتوانی جیهانی عەرەبی‌و ئیسلامی.

٣- لەمیانەی دەستەی بۆماوەیی، دەتوانرێت مێرووی بچوك یاخود مێرویەك كە بەچاو نەبینرێت بەبەستە بۆماوەیی بۆ نەخۆشی شێرپەنجە یاخود تاعون یاخود هاوشێوەیان هەڵبگیرێو لەكۆمەڵگەیەكی دیاری كراودا بەر بدرێت كە ببێتە هۆی زۆربوونیو دوای ئەوەش بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشیانەی دەبنە هۆی خراپیو مەترسی.

٤- كردنەوەی دەرگای لەبەرگرتنەو لەوانەیە ببێتە هۆ بۆ لەبەرگرتنەوەی ئادەمیزادی بۆ بەدی هاتنی جۆرێكی دیاری كراو لەخەڵكی، كە لەداهاتوودا دەست بگرن بەسەر دەسەڵاتدا لەداهاتوودا، بەشێوەیەك وەستانەوە گران بێ لەدژیان سەخت بێت.

٥- چەكی ئەتۆمی كە هەڕەشە لە شارستانێتی ئادەمیزادی دەكات بەكاول كاریو لەناوبردن، مامەڵەكردن لەگەڵ جینەكان دا ڕۆڵێكی كاری گەری هەبوو بەشێوەیكی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ.

٦- لەوانەیە هەڵەیەكی سادە لەو كەسەوە كە مامەڵە دەكات لەگەڵ جینی ئادەمیزادی دا ببێتە هۆی ڕودانی كارەساتێكی خراپی نەخوازراو كە ئەنجامێكی زیان بەخشی هەبێت، یاخود پێك هاتنی ڤایرۆسێك كە لەناوبردنی سەختبێت، لەبەر ئەوە پێویستە مامەڵەكردن لەگەڵ جیندا بەوریایی یەكی تەواوەوە ئەنجام بدرێت بۆ دووركەوتنەوە لە ئەنجامە خراپەكان.

# بەشی دوانزەهەم

## نمونەی تر لە هۆکارەکانی ڕێپێدان

یاسا دانراوە دەستکردەکان هۆکارەکانی ڕێپێدان لەسێ جۆردا قەتیس دەکەن:

مافی بەرگری شەرعی، ئەنجام دانی ئەرك، بەکارهێنانی ماف.

لەکاتێکدا ئەو هۆکارانە شەریعەتی ئیسلامی دیاریان ناکات، هەروەکو لە شەرع و یاسادا زیانی دیاری کردووە بەبێ دیاری کردنی هۆکارەکەی.

هەرچیش قازانجی تاکەکەس یاخود کۆمەڵگەی تیادابێت و ئەو قازانجە لەسەر حسابی زەرەرو زیانی کەسانی تر نەبێت قبوڵیەتی.

لەمەودوا نمونەی ئەو هۆکارانە دێت.

## یەكەم: مۆڵەت(الإذن):

(الإذن) لەزمانی عەرەبیدا: بەچەند مانا هاتووه، لەوانە: زانین (العلم)، وه بەم مانایە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووه: (فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِنْ تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ)[1] واتە: با زانیاریان هەبێ، هەروەها بەمانای (الإعلام= ڕاگەیاندن) هاتووه، دەوترێ: (أذن به أی أعلمه به) پێی ڕاگەیاند، وه بەمانای گوێ گرتن، دەوترێ: (أذن اليه أي استمع)[2] واتە گوێی لێ گرت.

وه لەزاراوەدا: بریتیە لەڕێپێدان، دەگونجێ لە دانەری یاسا(الشارع) یان یاسادانەر(المشرع) یان لە خاوەن موڵك وەربگیرێت، و بە هۆكارێك لە هۆكارەكانی ڕەوایەتی دادەنرێت وەكو ئەمانە:[3]

### ١- مۆڵەت دان لەلایەن دانەری شەرع(الشارع):

ئەوه یان بنەڕەتی یە، واتە بەبێ بەهانە، یاخود تایبەتە لەبەر بوونی بەهانەیەك، جا مۆڵەتی تایبەت سەبارەت بە مافەكانی خوای پەروەردگار لە هۆكارەكانی ڕێپێدانە، وەكو مۆڵەت دان بەخواردنی مردارەوەبوو وه گۆشتی بەراز وه خواردنی بێهۆش كەرەكان لەباروتۆخی تینوێتیو نەبوونی ئاودا، یان كوفر كردن لەژێر پاڵەپەستۆی زۆرلێ كردنداو هاوشێوەی ئەوانە.

---

[1] سوورەتی بەقەره /٢٧٩.

[2] لسان العرب: لإبن منظور، بەشی (ئەلف)و پیتی (نون).

[3] التعريفاتي: جورجاني (الشريف علي بن محمد) لاپەڕه/١٦، دەستەواژەی (الشارع) بۆ خوای پەروەردگار بەكاردەهێنرێتو وشەی (المشرع) بۆ دەسەڵاتی یاسادانانی ڕۆژگاری بەكاردەهێنرێتو بۆ خوای پەروەردگار بەكارناهێنرێت لەبەرئەو ڕاپەڕاندنەی كە تیایەتی خوای پەروەردگاریش لەوه خاوێنە.

بەڵام سەبارەت بە مافەکانی بەندەکان وەکو ئەوەی کەسێك لە ناچاری دا ماڵی کەسێکی تر بخوات بەبێ مۆڵەت لێ وەرگرتنی خاوەنەکەی، ئەویش هۆیەکە لەهۆیەکانی مۆڵەت پێدان، بەرپرسیارێتی سزادانانی لەسەر نیە بەڵام بەرپرسیارێتی مەدەنی لەسەرە، جا خاوەنی ماڵو سامانەکە بۆی هەیە داوا لەکەسە ناچارکراوەکە بکات کە قەرەبووی بۆ بکاتەوە، ناچارەکەش لەسەری پێویستە ئەو قەرەبوە بدات.

ڕێسای شەرعی گشتی بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کە بنەڕەت لەشتە بەسوودەکان دا ڕێپێدرلوە، وە لەشتە زیان بەخشەکانیش دا حەرام کردنە.

سەرچاوەی ئەو ڕێسایەش قورئانی پیرۆزە لەزۆر ئایەت دا لەوانە فەرموودەی خوای پەروەردگار: (هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا)[1].

ڕووی بەڵگەکە لەسەر ئەمە بنەمایە (ل) لە وشەی (لكم) بۆ سوودە هەروەکو (علی) بۆ زیانە، هەردوکیان لەم فەرمودەیەی خوای پەروەردگاردا کۆبوونەتەوە: (لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ)[2] ووشەی (ما) لە (ئیسمی موصولەیە بۆ گشتدان). جا ئەوە هەموو بوونێك لەگۆی زەوی دا دەگرێتەوە لەگیانداران‌و لەبێ گیانەکان، ئەوەش ڕێپێدرلوە بەڕێپێدانی خوایی، ئەگەر مافی بەندەی پێوە نەبێت.[3]

وتارەکە لەو ئایەتەدا ئاڕاستەیە بۆخێزانی مرۆڤایەتی بەبێ تایبەتمەندکردن یاخود سنوردارکردن، ناوەڕۆکەکەشی بریتی یە لەوەی کە خوای پەروەردگار بەدی هێناوە بۆ سوود پێگەیاندنی ئادەمیزاد لەوشکانی‌و لەدەریادلو لە ئاسمان دا لەبوونەوەرە زیندووەکان‌و بێ گیانەکاندا.

ئاشکراشە کەبەدی هێنانی شتێك بۆسوود لێوەرگرتن دەبێت ڕێپێدراوبێت، ئەگەر وانەبێ ئەوا سوود لێ وەرگرتن بەبێ ڕێپێدان مانایەك نامێنێت.

---

[1] سوورەتی بەقەرە /٢٩.

[2] سوورەتی بەقەرە /٢٨٦.

[3] کە نەبێتە مولکی تایبەت بۆ بەندەیەك.

ڕێپێدانی بنەڕەتیش جۆرێكە لە چوار جۆرەكەی (الاستصحاب)[1] كە ئەمانەن:

جۆری یەكەم: بنەڕەت لە شتە سوودبەخشەكاندا ڕێپێدانە ئەگەر بەڵگەیەك نەبێ لەسەر پێچەوانەكەی.

جۆری دوهەم: بێتاوانی بنەڕەتی: جا بنەڕەت لە ئادەمیزاددا بریتیە لەبێتاوانی لەهەموو پابەندیی سزایی و مەدەنیەكان، لەبەر ئەوەی بەبێ تاوانی لەدایك دەبێ، جا لەسەر دادوەر پێویستە كە بەبێ تاوانی دابنێت لەكاتی لەدایك بوونی یەوە هەتا ئەوكاتەی كە پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێ، ئەوەش بناغەی ئەم ڕێسایە: (تاوانباركراو بێتاوانە هەتا بە تاوان باریەكەی دەسەلمێ)و ڕێسای (بەڵگە لەسەر داواكارە[2]و سوێند خواردنیش لەسەر ئەو كەسەیە كە نكوڵی دەكات[3]).

جۆری سێهەم: ئەگەر حوكمێكی شەرعی بە بەڵگەیەكی شەرعی سەلما، ئەوە لەسەر دادوەر پێویستە كە حوكم بدات بەمانەوەی هەتا ئەو كاتەی نامێنێ وەكو هاوسەرگیری یاخود موڵكداریی.

جۆری چوارهەم: سیفەتی بنەڕەتی شتەكان، بنەڕەت لەشتەكان دا ساغیە كەمو كوڕیش سیفەتێكی پەیدابوە، جا ئەگەر جیاوازی كەوتە نێوانی فرۆشیارو كڕیارەوە لەنەبوونی كەمو كوڕی دا لەپێش وەرگرتنەكەدا، ئەوا فرۆشیارەكە ڕاست دەكات، لەبەر ئەوەی بنەڕەت بریتی یە لەساغیو كەمو كوڕیش پەیدابوەو پێچەوانەی بنەڕەتە.

**٢- مۆڵەتی یاسادانەر (المشرع):**

مۆڵەتی یاسادانەر لەڕێگای یاساوە بۆ هاوڵاتیان بۆ سوود وەرگرتن لەدارایی گشتی ڕێگە پێدراوە، ئەگەر پێچەوانە نەبێت لەگەڵ سیستەمی گشتیو ئادابی گشتی دا،

---

[1] الاستصحاب بریتی یە لە بڕیاردان بە بەردەوامی، ئەوەی كە لەڕابردوودا جێگیر بووە، ئەگەر بەڵگە نەبێت لەسەر بێجگە لەو.

[2] لەبەر ئەەی داواكاری ئەوەیە كە پێچەوانەی بنەڕەتیە.

[3] لەبەر ئەوەی داوای ئەوە دەكا كە بنەڕەتی یە.

وەکو مۆڵەت دان بەسوود وەرگرتن لە پێویستیو خزمەت گوزاریە گشتی یەکان، لەوانە: نەخۆشخانەو سوود وەرگرتن لە دەرمانی بێ بەرامبەر.

هەروەها وەکو سوودوەرگرتن لەزەویو زاری ئەمیری کە سوودەکەی بەپێی یاسا دەگوێزرێتەوە بۆ میراتگرەکان، نەك بەپێی شەریعەت، ئەوەش پێی دەڵێن مافی گواستنەوەو جیاوازی نی یە لەنێوانی پشکەکانی نێرو مێ دا.

بەڵام مۆڵەتێك کە پێچەوانەبێ بۆ سیستەمی گشتیو ئادابی گشتی، ئەوا نابێتە هۆکار بۆ ڕێپێدانی لە شەریعەتی ئیسلامی دا وەکو کردنەوەی مەیخانەکان لەشوێنە گشتی یەکان داو خواردنەوەی مادەی هۆشبەرو یاری قومارو هاوشێوەیان.

**٣- مۆڵەت وەرگرتن لە خاوەن موڵکەوە:**

مۆڵەت وەرگرتن لە خاوەنی موڵکی تایبەتی لە هۆکارەکانی ڕێپێدانە، ئەگەر پێچەوانەی سیستەمی گشتیو ئادابی گشتی نەبێ، وەکو ڕێپێدانی خاوەن ماڵ بۆ میوان بۆ ئەو نانخواردنەی کە پێش کەشی دەکات، ئەوەش مۆڵەت دانە بە خواردنو خواردنەوە بەبێ بردنو سەرفکردن، یان وەکو مۆڵەت دانی ئەوەی شتەکەی لێ خوازراوە(المعیر) بەوەی کە خوازەرەکە سوود وەربگرێ لەو بابەتەی خواستویەتی، بەپێی ڕێکەوتن یاخود دابو نەریت، جا خواستن لەلای هەندێ لەشەرع ناسان ڕێگە پێ دانە بە سوود وەرگرتن و لەلای هەندێکیش بە موڵك کردنە، لەهەردوو حاڵەتەکەدا هۆکارێکە لە هۆکارەکانی ڕێپێدان.

بەڵام مۆڵەتدانی نەخۆش بە پزیشك بۆ ئەوەی کۆتایی بەژیانی بێنێت تا لە ئازاری نەخۆشیەکەی ڕزگاری بکات، ئەوە نابێتە هۆکارێك بۆ ڕێپێدان، بەڵکو لەبواری سزادانی یاسایی دا لەپزیشکەکە دەپرسرێتەوە ئەگەر بەمۆڵەتپێدانی نەخۆشەکەی کرد، لەبەر ئەوەی ئەو نەخۆشە ژیانی موڵکی تەواوی خۆی نی یە، بەڵکو هاوبەشە لەنێوان ئەوو کۆمەڵگەکەیدا، بۆیە یاساو شەریعەتەکان کۆدەنگن لەسەر حەرام کردنی خۆکوشتن.

وە مۆڵەت دانی ژنێك بە پیاوێك كە مێردی خۆی نەبێ بەوەی مامەڵەی جنسی لەگەڵ بكات ئەو كارە بەوە نابێتە ڕێپێدرلو، لەبەر ئەوەی پێچەوانەی سیستەمی گشتیو ئادابی گشتی یە، لە شەریعەتی ئیسلامی و لەزۆری یاساكانی جیهانیش دا.

بێجگە لەوەش مۆڵەتی یاسادانەریش لەوێنەی ئەم بابەتانەدا، پێویستە لەگەڵ مۆڵەت دانی تایبەتی خاوەنی مافەكە بێتەدی.

## دووهەم: پەسەندكردنەكان (ترجيحات):

پەسەندكردنەكان لەحاڵەتی پێكدادانی بەرژەوەندیەكان لەگەڵ پەسەندكراوە ڕێپێدراوەكاندا، لە هۆكارەكانی ڕێپێدان دەژمێردرێن، لەوێنەكانیان:

١– ڕێپێدان بەسزادانی تاوانكاران لەبەر پەسەندێتی بەرژەوەندیەكانی كۆمەڵگە بەسەر بەرژەوەندی تاوانباراندا بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە پێویستی یەكان، (پاراستنی دینو ئابڕوو ژیانو سامانو عەقڵ)ی كۆمەڵگە بە پەسەند كردنی بەرژەوەندی گشتی لەسەر بەرژەوەندی تایبەتی تاوانبارو كەسو كاریدا.

٢– ڕێپێدان بۆ ناچاركردنی هاوڵاتی نێرینە بۆ ئەنجام دانی خزمەتی سەربازیی ئیلزامی (بەزاراوەی سەربازی: خزمەتی ئاڵا) ئەگەر تەمەنی هەژدە ساڵی تەواو كردو بەهانەیەكی ڕەوای نەبێ، جا بەرژەوەندی هاوڵاتی بریتیە لە خەریك بوونی بەكاروباری تایبەتی یەوە بەڵام بەرژەوەندی گشتی دەخرێتە پێش بەرژەوەندی تایبەتی یەوە.

٣– باج كۆكردنەوەو سەرانە بەپێی یاسا لەكارە ڕێپێدراوەكانە لەو لایەنەوە كە داهاتێكە بۆ گەنجینەی گشتی وڵات، هۆكاری ڕێپێدانەكەش بریتی یە لە پەسەندێتی دانی بەرژەوەندی گشتی بەسەر بەرژەوەندی تایبەتی دا.

٤– سنووردار كردنی نرخەكان لە بارودۆخی بەرزبونەوەیاندا لەبەر چاوچنۆكی وە لێقۆستنەوە، لەوكاتەدا پەسەندێتی بەرژەوەندی گشتی دەدرێت بەسەر بەرژەوەندی تایبەتی دا.

٥– دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمۆبیل لەحاڵەتی سەرپێچی كردنی هاتو چۆدا.

هەروەها لەوێنەکانی پەسەندێتی دان، پەسەندێتیدانی بەرژەوەندی ڕاستەقینەیە بەسەر بەرژەوەندی گریمانەییدا وەکو لەم حاڵەتانەدا دێت:

١- تەڵاقدان (تفريق) لەنێوانی پیاوێکی ون بوو لەگەڵ ژنەکەی دا بەپێی مەرجە داواکراوەکان، لەو حاڵەتەدا بەرژەوەندی ژنەکە ڕاستەقینەیە بەڵام بەرژەوەندی پیاوەکە گریمانەییە، لەبەر ئەوەی مانەوەی لەژیاندا گومانی تیادایە.

٢- لەباربردنی کۆرپەلە لەبەر ژیانی دایکەکەی، کە ژیانی دایکەکە ڕاستەقینەیە، پەسەندێتی دەدرێت بەسەر بەرژەوەندی کۆرپەلەکەدا، لەبەر ئەوەی ژیانی کۆرپەلەکە گریمانەییە.

هەروەها لەوێنەکانی پەسەندێتی، پەسەندێتی گرنگ ترە بەسەر گرنگ دا، جا ڕێگە دراوە بەدەست بەسەراگرتنی ماڵو سامانی قەرزدار و فرۆشتنی بەزیادکردنی ئاشکرا (مزاد علني) بۆ دانەوەی قەرزی خاوەن قەرزەکانی.

هەروەها لەوانە پەسەندێتی دوور خستنەوەی خراپەکان بەسەر هێنانی بەرژەوەندیەکان، ئەگەر هێنانی بەرژەوەندیەکە گرنگ تر نەبوو لەدوورخستنەوەی خراپەکە.

وە لەوانە پەسەندێتی هەڵبژاردنی زیانی سوکەڵە بۆ دوورخستنەوەی زیانی قورستردا، وەکو برینی ئەندامێکی تووش بوو بە شێرپەنجە بۆ دوورخستنەوەی بڵاو بوونەوەی نەخۆشیەکە.

## سێهەم: موسڵمان بوونی ناموسڵمان:

کاتێ کە کەسێکی نا موسڵمان موسڵمان دەبێو دێتە ناو ئیسلامەوە لەبەرپرسیارێتی سزادانو مەدەنی لێی دەبوورن سەبارەت بەو تاوانەی کە لەپێش ئیسلامدا ئەنجامی داوە، سەبارەت بە مافەکانی خوای پەروەردگار (مافی گشتی یەکان) نەك مافە تایبەتی یەکان، سەرچاوەی ئەو حوکمەش قورئانو سونەتی پێغەمبەرە ﷺ.

١- قورئانی پیرۆز:

له قورئانی پیرۆزدا له‌باره‌ی ئـه‌و حوكمـه‌وه كـه بـاس كـرا لـه‌زۆر ئایـه‌ت دا ده‌ق هاتووه له‌وانه: (وَلَا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ)[١].

له‌و ئایه‌ته پیرۆزه‌دا ده‌ق هه‌یه له‌سـه‌ر ئـه‌وه‌ی لێپرسینه‌وه ناكرێت له‌گه‌ڵ ئـه‌و كه‌سه‌دا كه ژنی باوكی خۆی (نه‌ك دایكی خۆی) ماره كردوه، له‌سه‌ر ئه‌و بناغه‌یه‌ی كه له‌دابـو نه‌ریتی نه‌فامی دا به‌میراتی ئه‌ژماركراوه، جا ئه‌وه‌ی ئه‌و كـرداره‌ی كـردووه، پاشان موسڵمان بـوو، له‌گه‌ڵیا له‌یـه‌كتری جیاده‌كرێنـه‌وه، بـه‌ڵام له‌سـه‌ر ئـه‌وه سـزا نادرێت كه له‌پێش موسڵمان بوونیدا كردویه‌تی.

وه فه‌رمووده‌ی خوای په‌روه‌ردگار (وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ)[٢] جا هه‌ركه‌سێك دوو خوشكی پێكه‌وه كۆكردبێته‌وه به‌وه‌ی كه هه‌ردوكیان هاوسـه‌ری بـن له‌پێش موسڵمان بوونی دا، به‌ڵام كه موسڵمان بوو سه‌رپشك ده‌كرێت له هه‌ڵبـژاردنی یه‌كێكیان داو وازهێنـان لـه‌وی تریـان، له‌به‌رئـه‌وه‌ی له‌ئیسـلام دا حه‌رامـه دوخوشـك پێكه‌وه ژنی یه‌ك كه‌س بـن و بكـه‌ری ئـه‌و كـاره سـزا ده‌درێـت، بـه‌ڵام ئـه‌و حوكمـه كاریگه‌ری نیه سه‌باره‌ت به‌پێش ئیسلامبوون.

هه‌روه‌ها خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت: (عَفَا اللَّهُ عَمَّا سَلَفَ وَمَنْ عَادَ فَيَنْتَقِمُ اللَّهُ مِنْهُ)[٣] هه‌روه‌ها فه‌رمووده‌ی خوای پـه‌روه‌ردگاره (قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ)[٤].

٢- سوننه‌تی پێغه‌مبه‌رﷺ:

پیاوێك موسڵمان بوو ده ژنی هه‌بوو، له‌پاش ئـه‌وه‌ی موسـڵمان بـوو پرسـیاری لێ نه‌كرا له‌باره‌ی ڕیزبه‌ندی هێنانیانه‌وه، ئایا هـه‌موویان پێكـه‌وه بـووه، كـه سـه‌باره‌ت

---

[١] سووره‌تی نیساء /٢٢.
[٢] سووره‌تی نیساء /٢٣.
[٣] سووره‌تی مائیده /٩٥.
[٤] سووره‌تی ئه‌نفال /٣٨.

بەهەموویان ناڕەوایە ئەگەر موسڵمانبێت و ئەمە بکات، یاخود بەشێوەی یەك لەدوای یەك، ئەوسا هاوسەرگیری یەکە لەچواری یەکەمیان دا ڕەوابوەو لەزیاتر لەو چوارە ناڕەوایە.

بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: (امسك أربعاً وفارق سائرهن) واتە: چواریان بگرەو لەوانی جیابەرەوە.

پیاوێکی تر موسڵمان بوو، لەپێش موسڵمان بوونی دا، دوو خوشك پێکەوە هاوسەری بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: (إمسك إحداهما وفارق الأخرى) واتە: یەکێکیان بگرەو لەوی تریان جیابەرەوە.

بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی کە موسڵمان بووە، کارێکی کردبێ کە پێچەوانەی سیستەمی گشتی بووە لەبەر بەستەکانی هاوسەرگیری، وەکو هاوسەرگیری کردن لەگەڵ یەکێك لە مەحرەمەکان لە ئیسلام دا، ئەوا پێویستە ئەو پیاوو ژنە لەیەکتری جیابکرێنەوە.

هەروەها ئەوەی کە لەپێش موسڵمان بوونی دا (خوێنبایی)ی لەسەر پێویست بوبێ، ئەوا پێویستە لەدوای موسڵمان بوونی ئەو خوێنبایی یە بدات، لەبەر ئەوەی خوێنبایی لەمافە هاوبەشەکانەو مافی تایبەتیش تیایدا زاڵە، جا ئەگەر خاوەنی خوێنەکە لێی خۆش نەبوو بێ ئەوا خوێنبایيەکەی لێ وەردەگیرێت.

## چوارهەم: نەشارەزایی بەحوکم

نەزانین نەبوونی زانیاری یەکێکە لەباریدا هەیە فێری ببیت، جا بەرامبەری لەنێوانی نەزانین‌و زانیاری دا بەرامبەری یە لەنێوانی نەبوون‌و بوندا، وەکو نابینایی‌و بینین، نەزانین نادرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە لەباری دا نیە زانیاری وەربگرێت.

### نەزانین لە شەریعەتی ئیسلام دا

نەزانین لە شەریعەتی ئیسلام دا لە هۆکارەکانی ڕێپێدان ناژمێردرێت، ئەگەر نەزانەکە توانای فێربوونی حوکمی هەبوو، بەڵام ئەگەر ئەو زانیاریە فێر نەدەبوو، ئەوا

دەبێتە هۆکارێکی ڕێپێدان، وەکو ئەوکەسەی کە دێتە ناو ئیسلامەوەو موسڵمان دەبێت، شتێك ئەنجام دەدا کە لەئیسلامدا حەرامەو لەدینەکەی پێشووی دا ڕێپێدراو بووە، جا نەیزانیوە کە حەرامە و نەشیتوانی فێری ببێ، لەبەر نەبوونی کاتی پێویست بۆ وەرگرتنی ئەو زانیاری یە.

بەڵام ئەگەر تاوانێکی کرد لە دینەکەی پێشووشی دا حەرام بوو، وەکو ئەوەی کەسێك مەسیحی بوویێو لەدوای موسڵمان بوونی تاوانی زینای ئەنجام دا، ئەوا نەزانینەکەی سەبارەت بەو نابێتە بەربەست لەبەر پرسیارێتی سزادان، لەبەر ئەوەی ئەو کارە ناشیرینە لە ئاینی عیسا پێغەمبەریش دا سەلامی خوای لێ بێ هەرتاوان بووە.

سەرچاوەی ئەو حوکمەش قورئانە کە لە ئایەتە پیرۆزەکانیدا خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا)[1].

هەروەها فەرموویەتی: (وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا)[2].

یاسا جیاوازی نیە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیدا لەوەدا کە نەزانین دابنرێت بە بەهانەیەك ئەگەر نەتوانرا بزانرێت، بڕگەی یەکەم لە ماددەی (٣٧) لەیاسای سزادانی عێراقی پەیڕەوی لێ کراو دەقی هەیە کە تیایدا هاتووە: (بۆ هیچ کەسێك نی یە کە بەڵگە بە نەزانینەکەی بهێنێتەوە لەبڕیارەکانی ئەو یاسایە، یاخود هەریاسایەکی سزادانی تر، ئەگەر هێزێکی زاڵ ڕێگر نەبوبێت لە زانینی ئەو یاسایەی کە سزادەدات لەسەر تاوانێك)، بەو پێیەی یاسادانانراوەکان لەسەر ئەوە جێگیر بوون کە نەزانینی یاسا بەبیانوو وەرناگیرێ، دوای ئەوەش نابێتە هۆیەك بۆ ڕێپێدان، بۆ ڕێگەگرتن لەیاساشکێنی بە بەهانەی نەزانین پێی، بەڵکو یاسادانەری وەزعی وای داناوە کە بەتەنها بڵاوکردنەوەی یاسا لەڕۆژنامەیەکی ڕەسمی دا، لەپاش تێپەڕبوونی ماوەیەك

---

[1] سوورەتی بەقەرە /٢٨٦.

[2] سوورەتی القصص /٥٩.

بەسەری دا کە بەسە بۆ بینینی، هەرئەوە نیشانەیەکی یاساییە لەسەر بوونی زانیاری پێی، ئەوا بەهانە هێنانـەوە بـە نـەزانین وەرناگیرێـت بـۆ نەپرسـینەوە لـە بکەرەکـە لەبواری سزادانو مەدەنیدا، لەوەدا نـەزانین بـەخودی یاسا یـاخود بەتێگەیشـتن لـە یاساکە وەکویەك وایە.

**بەشەکانی نەزانین لەڕوی کاریگەریەوە سیانن:**

١– نـەزانینێك ناشـێ بـۆ بەهانـە یـان گومـان، وەکـو نـەزانینی بـەخودی خـوای پەروەردگار، لەبەر ئەوەی باوەڕبوون بەخوای پەروەردگار پێویستییەکی عەقڵی یـە، لـەپێش ئـەوەدا کـە پێویسـتی یـەکی شـەرعی بێـت، جـا لەسـەر هـەموو ئادەمیزادێکی پێگەشتووی عاقڵ پێویسـتە بەبەڵگـەی (اللمـی، واتـە: شـوێنەوار بەڵگەیـە لەسـەربوونی خـاوەن شـوێن) بکاتـە بەڵگـە لەسـەر بـوونی خـوای پـەروەردگاری بەدیهێنـەری بوونـەوەری گـەورە، کـە هێشـتا زانایـانی ئاسمـانی سەریان سوڕماوە کە لەکوێوە دەست پێ دەکاتو لەکوێ کۆتایی پێ دێ.

٢– نەزانینێك دەشێ بۆ گومانو سنوورەکانی پێ دوور دەخرێتەوە، وەکو حەدی سەرخۆشکەرەکان نەك حەدی زیناکردن، لەبەر ئەوەی لە هەموو ئاینەکاندا حەرامە.

٣– نەزانینێك دەشێ هۆکارێك بێت بۆ ڕێپێدان لە حاڵەتی نەتوانینی دەستکەوتنی زانیاری بەوەی ئەو کارە تاوان بێت.

رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِين